# فەلسەفە

# کۆمەڵ



لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی کۆمەڵایەتییە

دانەر
د. حسین خلیقی

بونی ١٣٦٨ی هەتاوی بەرامبەری ١٢ی ١٩٨٩ی زایینی.

# فەلسەفە و کۆمەڵ

لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی کۆمەڵایەتییە

دانەر

د. حسێن خەلیقی

هاوینی ١٣٦٨ی هەتاوی و سەرەتای مانگی ١٢ی ١٩٨٩ی زایینی

کوردستان

## ئەمەگناسین

١- لە کاک محەمەدی حەسەن زادە سەبارەت بە تایپ کردنی کتێبەکە سوپاس دەکەم .

٢- لە کاک قادر وریا سەبارەت بە داناني ٧ وتەکان وپێدا ـ چوونەوەی سوپاس . دەکەم .

ئەم کتێبە پێشکەشە بەو کەسانەی جیهان لە جم و جۆڵ دـ
دەبینن و دەیانەوێ بەسەر سروشتدا زاڵ بن وباری کۆمەڵایەتی بەرەو ئاسایش و ئەمانی چەوسانەوە بگۆڕن .

# پێشەکی :

زۆر دەمێکە ئارەزووم ئەوەیە کە بەزمانی زگماکیم ( کوردی ) سەبارەت بە زانستی فەلسەفەو مەسەلە جۆراوجۆرەکانی ،بنووسم و بەپێی توانای خۆم لەو بوارەدا خزمەتێك بە گەلەکەم بکەم . زۆرم بیرلێ کردەوە ، مێژووی گەشەکردنی زمانەکەم خستە بەرچاو ،بەدوای شۆڕەسوارێکی مەیدانی ئەدەبی کوردیدا گەڕام تا بزانم کێ وەکەی خۆی لە وەرگێڕانی فەلسەفەی یونان بۆسەر زمانی کوردی ماندوو کردوە ؟ بەڵام کەسم دەست نەکەوت . تێکۆشام بەڵکوو پاش وەرگێڕانی ئەو فەلسەفە بۆسەر زمانی عەرەبی کە لە خولی دووهەمی کۆچی و سەرەتای دەسەڵاتی عەباسی یەکانەوە دەستی پێ کراوە ، کوردێك لە عەرەبی یەوە بۆ کوردی خۆی لەو کارەدا بێ ، بەداخەوە بەش بەحاڵی خۆم ، لە کەسێکی ئاوەها ئاگادار نەبووم . هەرچەند گەلی کورد بەگشتی ( بێجگە لە کوردی کوردستانی عێراق ئەویش لەم دوایی یانەدا ،توانیان بە زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن ) دەرەتانی وای نەبوە ،لە گۆڕەپانی ئەدەبیاتی کوردی دا ، خۆ بنوێنن ،بەڵام لە جەرگەی نووسەرانی ئەو بەشەش دا بێجگە لە کاك جەلال دەباغ کە دوو کتێبی بە ناوەکانی ، " ناڵەی فەلسەفەو زانست و جووڵانەوەی نوێ " و " کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیکی " نووسیوە ، تووشی نووسەرێك و شوێنەوارێك لەو بارەوە نەبووم . کتێبی یەکەمی لە ٢٧ کتێب بە زمانی شیرینی عەرەبی وەرگرتوەو کتێبی دووهەمی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی . نازانم ئەویش وەك من زۆر بەسەر زمانە ئورووپایی یەکان دا زاڵ نەبوە ، یان کتێبی وای

وەدەست نەکەوتوە؟ بەھەرحاڵ رەنجی ئەو برادەرە لەو بوارەدا جێی
سوپاسە، لە منیش لە نووسراوەکانی کەڵکم وەرگرت. بەم پێیەو تا ئێستا
بێجگە لەوەی باسم کرد، وشەو زاراوەو چەمکە فەلسەفییەکان نەهاتوونەتە
سەرکێشی زمانی کوردی و گەلێك دژوارە بۆنەوە ئەمەی تازە دەست بە
وەرگێڕانی کتێبی فەلسەفی یان دانانی کتێب لە زانستی فەلسەفەدا
دەکا، لە بتوانی بۆ وشەو زاراوەو چەمك و رستەکانی فەلسەفی لە زمانی
کوردی دا، پڕاوپڕی خۆیان، هاوکێشیان بدۆزێتەوە. بێجگەلەوەش خۆم
بە زمان زانێکی کارامەو خاوەن ئەزموون نازانم، هەربۆیە دان بەوەدا
دەنێم پاڵەوانی ئەو مەیدانە نیم. رەنگە بڵێن: ئەگەر وایە بۆ دەنووسی؟
وەڵامم ئەوەیە کە هیچ نەبێ با بەتەکە گەلاڵە دەکەم، شتێك ئەخەمە
بەردەستی نووسەران و زانستدۆستان و هەستیان ئەبزوێنم. ئەگەر
توانیبێتم بەردی بناخەی ئەوکارەم دانابێ، ئەوانیش و بەرەی دوایی،
کۆشکێکی رازاوەو پتەو، لەو بوارەدا دادەنێن و ئێمەش وەك یاران
اللهاکبر. مرۆڤ کەلەسەر ئەم سەرزەوییەدا دەژی، پێویستە لەم گەردوونە
تێ بگا. ئەو تێگەیشتنە ویستێکی تایبەتی نیە، بۆ گۆڕینی جیهان و
دابین کردنی ژیانێکی بەختەوەرانە، مرۆڤ دەبێ لە یاساکانی جیهان و
پێوەندی نێوان بەشەکانی هەستی، ئاگاداربێ. ئێمە وەك گەلی کورد
لەباری زانست و پسپۆڕو زانستگەو بنکەو بنیاتی زانستییەوە هەژارین.
ئامانجی گۆڕین دەبێتە هۆی پێویست بوونی ئەو تێگەیشتنە.

ئێستا فەلسەفەی زانستی چەکی گۆڕینە. گەشەکردنی زانست و
بەرەوپێش چوونی دۆزینەوەکان، بەڵگەی راست بوونی تئۆرییە
فەلسەفییەکان مۆر دەکەن. کەوابوو وەك پەرەسەندنی زانست و دۆزینەوەی
یاساکانی سروشت و فێربوون و فێرکردن، بۆ زاڵ بوون بەسەر رق و
تووڕەیی سروشت و خستنەژێر رکێفی، پێویستە، فێربوونی فەلسەفەی
زانستییش بۆ شێوەی بەکارهێنانی بەرهەمە زانستییەکان و گۆڕانی کۆمەڵ و
رێ خۆش کردن بۆ لابردنی هەرچەشنە چەوسانەوەیەك، پێویستە. نەك
هەر پێویستە بەڵکوو لە نانی شەوێش واجب ترە. بێجگە لەوە فەلسەفەی
زانستی لە گشتی بوونی خۆی دا، پێوەندی بە هەموو خەڵکی جیهانەوە
هەیەو تەواوی خەڵکی جیهان دەتوانن، کەڵکی لێ وەرگرن.

بۆ گەشەکردنی هەرکۆمەڵێك ، هەرگەلێك خاوەنی فەلسەفەی زانستیی خۆیەتی . بەو فەلسەفە دەکرێ هەموو ئەندامەکانی لەشی کۆمەڵ وەکار بخرێ . مرۆڤێك کە ئەندامەکانی لەشی پێکەوە هاریکاری نەکەن نەخۆشە . هەرکام لەو ئەندامانە بە باشی ئەرکی خۆیان بەجێ نەگەیەنن ، بەشێك لە ژیانی ئەو دەکەوێتە مەترسی یەوە . بزووتنەوەی هەر گەلێك بۆ گەشەکردن و دابین کردنی ژیانێکی بەختەوەرانە ، فەلسەفەی زانستیی ئەو گەلەیە ، لەباری تایبەتی یەوە لە ناوەرۆکی هەڵس وکەوتی ئەو گەلە ئەدوێ . هەر گەلێك نەتوانێ جووڵانەوەی خۆی بۆ گەشەکردن نیشان بدا ، بە ئاسانی ڕێگای ڕاستی لێ ون دەبێ .

پێویستە پلەی زانست ئەوەندە بچێتە پێش کە زانست فەرمانڕەوایی بکا . بەڵام دەبێ هوشیار بین ، تاریکی ونەزانین لانەبەین و زانست بکەینە ئاغای خۆمان و ئێمەش وەك ئامپیوتێر لەبەر دەستی دا کار بکەین . خۆشەویستی زانست وامان لێ نەکا ، زانا بپەرستین . بەڵکوو بە بیروباوەڕی قووڵ و پەیت و بەرەکەت بڕوا بکەین و زانستەکان بنە مامۆستامان . مرۆڤ بە زانست هەڵسەنگێنین . لە هەمان کات دا نرخ بۆ زانا دابنێین ، باری ئاسایش و ژیانی دابین بکەین تا بتوانێ بە ژیر بێژی و بیردۆزی خۆی ، هەرساتێك جیهانێکی تازەمان لە زانست نیشان بدا . بەهەرحاڵ بۆئەوەی بچینە نێو باسە فەلسەفی یەکانەوە ، پێویستە بەرەبەرە بچینە پێش . لەسەرەتادا پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین کە مرۆڤ چلۆن بۆتە خاوەن هۆش و چلۆن لە بوونی هەستی و خولقێنەری پرسیاری کرد و وەڵامەکان کامە بوون ؟ هێندێك لە پاڵەوانەکانی ئەو مەیدانە کێ بوون ؟ هەروەها پاش باس لەسەر کەڵك وەرگرتن لە دەست بۆ کار کردن ، زمان بۆ ئاخاوتن و پێنووس بۆ ڕاگرتنی میراتی پێشینیان و دەوری ئەمانە لە خولقاندنی مرۆڤ دا وەك " ئینسان " ، بە ناچار بیرو بۆچوونە جۆراوجۆرەکان لەو بارەدا ، هەروەها باس لەسەر ناسین و هەستەکان و هۆش و پلەکانی ناسین کراوە . پاشان بەوە هێما کراوە کە لە کۆن دا فەلسەفە هەموو زانستەکانی گرتبوەبەر . پاش ڕێك و پێك کردنی زانستەکان وردەوردە لە فەلسەفە جیابوونەوەو زانستە ئینسانی و سروشتی یەکان جێی خۆیان گرت و بەشێك لە زانستەکان لەژێر ڕکێفی فەلسەفەدا مانەوە .

پاشان ئەوانیش سەربەخۆیی یان وەرگرت و فەلسەفە وەك زانستێك بەتەنێ مایەوە . ئینجا پەنجەم بۆ ڕێگەر بوونی فەلسەفە لە پێوەندی لەگەڵ زانستەکان دا ڕاکێشاوە و پێویست بوونیم لە حاست زانستەکان و ژیانی کۆمەڵایەتی دا ، سەلماندوە . پاشان فەلسەفە جۆراوجۆرەکان باس کراوە .

مەسەلە بنەرەتی یەکانی فەلسەفەو ئەو باسانەی پێوەندی بەوانەوە هەیە ، بوونەتە بەشێکی گەورە لەم کتێبە . تێکۆشاوم کەمتر ڕای خۆم دەربڕم ، پتر ویستوومە خوێندەوارەکان هان بدەم ، خۆیان ڕێبازە فەلسەفی یەکان هەڵسەنگێنن و خۆیان بڕیار بدەن .

بەهۆی بارودوخی تایبەتی ژیانم لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا ، دەستم بە سەرچاوە بەرفراوان و زۆرو زەبەندە فەلسەفی یەکان ڕانەگەیشت و ناچار بووم بە هێندێك کتێبی عەرەبی ، فارسی و کوردی کە بەدەستەوە بوون وەك سەرچاوە کەڵك وەربگرم و ئەم کۆمەڵە باسە لە فەلسەفەدا بە گەلەکەم پێش کێش بکەم .

وەك ڕام گەیاند ، هەڵەم زۆرە ، داخوازیشم ئەوەیە بە چاوی دڵسۆزی یەوە هەڵەم لێ ڕاست بکەنەوەو شەرمم لێ پینە بکەن .

بەو هیوایە لە خولی بیستەمدا ، گەلی کورد یش وەك گەلانی پێشکەوتووی جیهان خۆی بەدەس خورافات و دێو و درنج و بەرد و کێلی گۆڕو مردوو و زیندووپەرستی و ژیان لە جیهانی گومان و خەیال و فاڵگرتن و هیوای پووچی ژیان ، ڕزگار بکا . یاسا زانستی یەکان و بیروبیناوەری زانستی و چرای دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستەقینەی ژیانێکی بەختەوەرانە بکاتە مامۆستای خۆی و بیان کاتە ئامرازی ڕزگاربوونی لە چەوسانەوە وەك بنەماڵەیەك لە جەرگەی بنەماڵەی گەورەی مرۆڤایەتی لەم گەردوونەدا ئەرکی خۆی لە حاست بەرەوپێش بردنی پلەی زانست و خزمەتی هاوبەش بە جیهانی مرۆڤایەتی ، بە ئەنجام بگەیەنێ .

دانەر : د ــ حسین خلیقی

کوردستان ــ هاوینی ۱۳٦۸ هەتاوی و نیوەی دووەمی ۱۹۸۹ ی زایینی

گەشەکردنی مرۆڤ لە ئاڵ وگۆڕە کۆمەڵایەتی یەکان دا ، وەك مێژوو نیشانی داوە ، بەرەبەرەو لە درێژایی دەیان هەزار ساڵ دا ، خۆی نواندوە ، پێش ژیانی هاوبەشی سەرەتایی ( کمون اولیە ) ، مرۆڤ چەند قۆناخی لە ژیانی پڕلە تەنگ و چەڵەمەی خۆی تێپەڕکردوەو لەباری زانست و ئاگادار بوون لە پێوەندی یە جۆراوجۆرەکانی دەرونی سروشت ، لەوپەڕی هەژاری دا ژیاوە . تازە پاش پەیداکردنی ئاگرو دەست کردنی هێندێک کەرەسەی پارێزگاری ، ژیانی وردە جیاوازی یەك لەگەڵ ژیانی ئاژەڵ پەیدا دەکاو بەرەبەرە خۆی دەناسێ و بۆ وەرگرتنی ئەرك و دابین کردنی پێداویستی یەکانی ژیان ، دێتە گۆڕەپانی بیروبیرکردنەوەو تێکۆشانەوە . شتەکان ، شوێن لەسەر هەستی وپاشان بەو هۆیەوە لەسەر مێشکی دادەنێن ولە هەمووی گرنگتر ، لەم کارەساتە ئاگادار دەبێ .

مێشکی وەك مادەیەکی ئامادە بۆ پەرەسەندن و گەیشتن بە هەستوەری و هۆشمەندی ، لە جەرەیانی هەڵس و کەوتەکانی ژیان دا ، خۆ دەنوێنێ . تاقە جیاوازی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ ، لەم قۆناخەدا ئەوە دەبێ کە لە کاتی گەڕان بۆ دابین کردنی خواردەمەنی ، ئاژەڵ رەفتاری وابوەو ئێستاش هەروایە کە ئەگەر جێگایەك ، شوێنێك وەڵامدەری داخوازی خواردەمەنی ئەو نەبووبێ و هیچ لە ئارادا نەمابێ ، ئەو جێگایەی بەجێ هێشتوەو بە دوای شوێنێکی خاوەن خواردەمەنی تردا ، گەڕاوە ، کەچی مرۆڤ بەرەبەرە لە جێگایەك سەقامگیر بوە ، بە دۆزینەوەی تۆی دانەوێڵەو گیاکان و کەرەسەی

خانوو دروست کردن ، له جیاتی جێ گۆڕان ، شوێنی ژیانیان گۆڕاوه ٠
ئێره‌را کارلێك کردنه‌کان واتا شوێن دانانی شته‌کانی ده‌وروبه‌ر له‌سه‌ر زه‌مینی مرۆڤ ، به‌ له‌گه‌ڵك وه‌رگرتن له‌و وێنانه‌ی جیهانی ده‌ره‌وه‌و دانه‌ویان به‌عین ، هه‌نگاوهه‌ڵگرتن بۆ گۆڕینی شوێنی ژیان ، به‌ته‌واوی ده‌ستی پێکرده‌وه‌و باری ژیانی مرۆڤ که‌وتوه‌ته قوناخێکی گرنگی ژیانی کۆمه‌ڵایه‌تی یه‌وه ٠

## مـرۆڤ کـێـیـه ؟

ئه‌رستوو : مرۆڤ گیانداریکه ، بیرده‌کاته‌وه ٠ ئه‌م بۆچوونه دوو هه‌زار ساڵ ده‌سه‌ڵاتی خۆی دریژه پێ‌دا ٠
ئیسپی نووزا : مرۆڤ گیانداریکه ده‌ڵێ " نه‌ " ٠ ئێستا ده‌ڵێن مرۆڤ گیانداریکی ئامرازخوڵقێنه‌ره ٠
له فه‌یله‌سووفه‌کانی ئیسلام ابن مسکویه سه‌بارەت به گه‌شه‌کردن باسێکی قوڵی کرده‌وه ٠ به بڕوای ئه‌و ، مه‌وجوده‌کان خاوه‌نی پله‌ی زنجیره‌یه‌کی لێك نه‌پچڕاون و هه‌ر مه‌وجودێك له‌باری ساکارو سه‌ره‌تایه‌وه ده‌ستی پێکرده‌وه ٠ پاشان بێ‌وچان به‌ره‌وپێش چووه‌و پێچیده‌وگرێ وگوڵدار بوه ٠ هه‌تا به ئاسۆی جۆر ( نوع ) گه‌یشتوه که رێگاکه‌ی پێواوه ٠ گیاکان له بێ‌گیانه‌وه هاتوون و سه‌ریان هه‌ڵداوه ، پاشان به‌ره‌وپێش چوون تا به به‌رزترین پله گه‌یشتوون ٠ کاتێك به‌رمبه‌ره ئه‌و رێگایه‌یان پێواوه ، شێوازی گیانداریان قبووڵ کرده‌وه ٠ گیانداریش له ساکاره‌وه ده‌ست پێ ده‌کا ٠ پاشان به‌ره‌وپێش ده‌چێ تا ئه‌گاته پله‌یه‌کی نزیك به ئینسان ٠
پاشان مرۆڤ به‌ره‌وپێش به رێگای گه‌شه‌کردنی درێژه‌ده‌داو هۆشی زیاد ده‌بێ وراستیی بیروڕای ده‌رئه‌که‌وێ ٠ بڕیاری باش ده‌دا تا ده‌گاته به‌رزترین پله‌ی دووهه‌وارگه ، یان به لێکۆڵینه‌وه‌و تێ‌ڕوانین له مه‌وجوده‌کان که رێژه ده‌دا تا به راستقینه‌کان بگاو ده‌سکرده‌کانی خودای بۆ روون ببێته‌وه یان بێ تێکۆشان ، لای خواوه ئه‌و زانسته‌ی بۆدێ ٠ خاوەن پله‌ی یه‌که‌م " فیلسوف "ه ٠ خاوه‌ن پله‌ی دووه‌م " په‌یامبه‌ر "ه ٠ که خه‌یره‌خشش له خواوه وه‌رده‌گرێ ٠ ئه‌و دووکه‌سه ، ئه‌گه‌ر یه‌ك بگرن ، رایان یه‌ك ده‌گرێته‌وه ٠ یه‌کیان ئه‌وی‌تریان په‌سند ده‌کا ، چونکه له ناسینی

ئەو راستەقینانەدا ، یەکدەگن • ( ۱ )

بەمجۆرە مرۆڤ لە سەرەتای ژیانی یەك ملیۆن ساڵەی خۆیدا ،لەباری ناسینەوە هەروەها لەباری قەبارەشەوە ، ساکار بوە • بەڵام نیازی بە خواردن و خۆپاراستن و جێگای ژیان هەبوە • نیاز ، کاری خوڵقاندەوە ، کارکردن مرۆڤایەتی دروست کردوە • هەر لە ئاکاری کارکردندا ، لەنێو چالاکیی بەرهەمهێناندا ،مێشك وهۆشمەندی پەرەی سەندوە •هۆشمەندی بەرهەمی کاری مرۆڤەو هەرواش دەبێ • هۆشمەندی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یە • زمان و ئاخاوتنیش هەروەهان •هەردووکیان وەك پێداویستی یەك و هۆیەك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو پەیوەندی گرتن لەنێوان خەڵکن • تەنیا لەنێو وشەدا بیر دەبێتە شتێکی راستەقینە•تا بیرکردنەوە لەنێو مێشکی مرۆڤدا بێ ، شتێکی مردەوو ناگونجێ دەستی خەڵك بکەوێ • زمان بریتی یە لە واقیعی راستەوخۆی بیرو ئەمەش مانای وایە کە بەبێ بەرگی زمانەکە ، بیرکردنەوە نیە • • • لە سایەی زمانەوە ، نەك تەنیا بیروڕایەکان ، دادەڕێژرێن ، بەڵکوو هەروەها بۆ کەسانی تریش دەری دەبڕن • • • هیچ ئامرازێك جێگەی مێشکی مرۆڤ ناگرێتەوە ، چونکە مێشك و بیرکردنەوەی مرۆڤ بەرهەمی ژیانی کۆمەڵایەتی یە • مرۆڤ ئامرازەکان بۆ مەبەستی تایبەتی بەکاردەبەن و بۆ چارەسەرکردنی ئەرکەکانی بەرهەمهێنان • ئامراز توانای بیرکردنەوەی نیەو تەنیا یارمەتی مرۆڤ دەدا بو بیرکردنەوە • ( ۲ ) خۆ ئەگەر ئاوڕێك بۆ بیروڕای داروینیش بدەینەوە کەلك وەرگرتنی مرۆڤ لە دەست بۆ کارکردن ، لە جیاتی کەلك وەرگرتن بۆ رێگا رۆیشتن ، دەتوانین بڵێین ، دەورێکی کاریگەری لە گەشەکردنی مرۆڤدا هەبوە • خۆ باسی پێنووس لەو بوارەشدا هەر ناکرێ • چونکە ، مێشك بیر دەدا بە ئاخاوتن و پێنووس دەیخاتە سەر قاقەزو لە ئاکامدا ، مرۆڤ بوەتە ئەوەی کە ئێستا هەیە •

---

( ۱ ) ــ قصة الایمان ؛ بین الفلسفة و العلم و القرآن ، الشیخ ندیم الجسر ، مفتی طرابلس بەرگی ٦٤ •

( ۲ ) ــ کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیکی ، جەلال دەباغ ۱۹۷۷ ، بەرگی ٥١ ــ ٥٠

مرۆڤ لە سەرەتایی‌ترین دەورەکانی ژیانیەوە، لەبەر ئەوە زانیاری کەم بوو، بە هێزەکانی سروشت کەسایەتی داوە! رووداوە ترس‌هێنەرەکانی بە جۆرێکی خەیاڵاوی، پاڵ داوەتە لای رق و تووڕەیی خواکان. پاشتر کۆمەڵگای چینایەتی کە مرۆڤ ناچار بوو، جموجۆڵی تایبەتی هەبێ، نوێنەرایەتی سەرەوەی سروشتی خوڵقاند، خواکان بە شێوەی لە سەرەوەی سروشت خوڵقێندران! هەروەک چۆن پادشا و ئاغاکان لە سەرەوەی خەڵک دادەندران!

ئەمە شتێکی سروشتی‌یە کە مرۆڤ هۆی رووداوێک نەزانێ، زیاتر لێی دەترسێ تا لە هۆیەکەی ئاگادار بێ. چونکە لەباری دووهەم دا، رەنگە کەرەسەی بەربەرەکانی و چارەی دەرد و زیانی رووداوە سروشتی‌یەکە بدۆزێتەوە و لە ئاکام دا، ترس کەمترە هیچ، بەڵکوو چارەی دۆزینەوە خۆی جۆرێک زاڵ بوونە، نەک ترس.

## فەلسەفە چی‌یە ؟

فەلسەفە بریتی‌یە لە روانین بۆ گەردوون بە گشتی. مرۆڤ لەو کاتەوە فێری بیرکردنەوەی رێک و پێک بوو و پێویستی لە هۆی ئاڵ وگۆڕ و جموجۆڵی شتەکانی دەوروبەری ئاگادار بێ، دیاردەیەک بە ناوی فەلسەفە پەیدا بوو. وشەکە یونانیەو لە " فیلاسوفیا " وە هاتوە بە واتای دۆستی زانست " ئەوا بوو فیلسوف کەسێکە کە رێک و پێک بیر دەکاتەوە و تێ دەکۆشێ بۆ هەر پرسیارێک وەڵامێکی رێک و پێک بدۆزێتەوە.

فەلسەفە یەکێکە لە زانستە هەرە کۆنەکان، لە سەرەتای سەرهەڵدانی بیری رێک و پێکی مرۆڤەوە، پرسیاری جۆراوجۆر، هاتووەتە زەمینیەوە. مرۆڤ کە تەماشای شتەکانی دەوروبەری خۆی کردووە و هەستی پێ کردوون و تێ گەیشتوە کە ئەوانە نەیان خوڵقاندووە و لە ئاکامدا لە پێوەندی‌یەکانی دەروونی شتەکان ئاگادار نەبوە، پرسیاری لە خۆی و هاوڕێیانەکانی کردووە: ئەمانە چین؟ لە کوێ را هاتوون؟ کێ خوڵقاندوونی؟ سەرچاوەیان چی‌یە؟ چۆن خوڵقاون یان چۆن هاتوون؟ لە چ کاتێکەوە هەن؟ چیان بەسەر دێ؟ هەروەها منی مرۆڤ چیم و لەگەڵ ئەم شتانە چ جیاوازی‌یەکم هەیە؟ و

سەرئەنجام بە کوێ دەگاو هتد ...؟

بە باش یان خراپ، وەڵامی ئەم پرسیارانە بە درێژایی مێژوودا ، دراوەتەوەو هەرکەسە بە پێی توانا و هێزی بیرو بۆچوونی ، وەڵامێکی بۆیان ئامادە کردوە . بەڵام ئەوکەسانەی لە بە رێك و پێکی و بە تێبینی و لێکۆڵینەوەی ورد و بە پێی توانا ،وەڵامیان داپێتەوە ، پێیان گوتوە " فیلسوف " . کەوابوو ، بە واتایەکی تر فەلسەفە ئەو زانستەیە کە تێیدەکۆشێ وەڵامی ئەم پرسیارانە لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا ، بداتەوە . بەڵام ئایا وەڵامی دروست دەداتەوە یان نا ؟ پێوەندی بە ئەندازەی زانیاری فیلسۆف و بارودۆخی سەردەمەکەی و پرسیارەکەوە هەیە . دەردەکەوێ فەلسەفە دەیهەوێ لە نێوەرۆکی شتەکان ، بنەڕەت و ئامانجیان تێ بگاو بە ناسینی رواڵەتی شتەکان و بە دیاردەکانەوە نەوەستێ . بەڵکوو دەشی هەوێ بچێتە ناخی شتەکانەوە . نایهەوێ بۆناسینیان تەنیا لە هەست کەلك وەربگرێ و بەوەی کە هەستی پێ دەکا ،دڵ گەچ بێ ، بەڵکوو لە پێش دا دەیهەوێ بچێتە سەرەوەی شتەکان ، بچێتە پشتەوە و تەنانەت بۆ خولقێنەریان بگەڕێ و تێبگا لە چی خولقاون ؟ کەنگێ خولقاون ؟ خولقێنەرەکەیان چیەو چ پەسنێکی هەیە ؟ هەروەها دەی هەوێ بزانێ مرۆڤ بۆخۆی چیەو لە چ جێگایەکەوە سەری هەڵداوە ، نێوەرۆکی چیەو سەرچاوەی هۆش و شعووری کامەیە ؟ چۆن تێگەیشتنی ئەوا دەکاو نرخ و ئەندازەی ئەو تێگەیشتنە چەندە راستە یان نا ، خەیرو جوانی و دادگەری و ستەم چۆن و هتد ...؟

لە سەرەتادا فەلسەفە باسی نێوەرۆکی ماددە ، بنەڕەتی ، هەستی بەوجوود هاتنی ، واتای کات و شوێن ، نێوەرۆکی هۆش ،راستییەکەی ، نرخەکەی لەباری نەخۆش نەبوون و هێزی لەسەر تێگەیشتن لە شتەکان ، بە گشتی هەموو ئەو شتانەی وەبەر زەین دەکەوت ، دەکرد .

هێندێك فەلسەفەیان ئاوا ناساندوە : بریتییە لە تێ روانین لە راستەقینەی شتەکان . هێندێك وتوویانە : فەلسەفە زانستی هۆیە سەرەتاییەکانە ، تێکۆشانی هۆشە بۆئەوەی بگاتە نێوەرۆکی گشت هۆیە سەرەتاییەکان . هێندێك دەڵێن ،زانست کاری لێکۆڵینەوەی رواڵەتەکانی ئەم گەردوونەو ناسینی رێك و پێکی و کارتێکەکانی و کارە سروشتییەکانیە .

بەلام فەلسەفە بۆ دۆزینەوەی بنەمای گەردوون ، هۆیەکەی ، راستییەکەی ، تێدەکۆشێ · کەوابوو زانای سروشتی ، بۆ لێکۆلینەوەی رواڵەتەکانی سروشتی مادە ، هەنگاو هەڵدەگرێ ،بێ ئەوەی بیر لە بنەرەتی و سۆی بوونەکەی بکاتەوە · ( ١ )

خەریك بوون بە فەلسەفەوە ، بە واتای دڕێژەدان بە ڕێگایە ، هەربۆیە فەلسەفە هەمیشە لە ڕێگادایە · بەلام ئەم ڕێگایە بەرەو نشێو نیەو بەرەو هەورازە · دیاردەیەکی بەرەو گەشەکردن ٬چوونی عێشە ، زانیاری مرۆڤە و هیچ کاتێك دانابەزێ · تەنیا سەرنجدانی مرۆڤ بۆ فەلسەفەیە کە لە هەموو دەورەکان و لە هەموو جێگاکان دا ، یەك جۆر نیە · جاری وایە کەمترەو جاری واشە زۆرترە · · · هەرکات سەرنجدان بە ناسین بە شێوەی ئەوین و ئەویندار ی خۆی بنوێنێ ، ئەوکات فەلسەفە دەبێتە زانیاری و بەرەوپێش چوونی بیروباوەڕ · ئەوکات مرۆڤ بۆچوونی سەرەتایی خۆی ، بە باشترین و دروسترین بیروبۆچوون دابنێ ،بە کەلك وەرگرتن لە کات ، بەرەوی پێ بدا و بە خەڵکی دی ، بسەلمێنێ ، ئەوکات فەلسەفەیەك دروست دەبێ لە لە راستی دا ، فەلسەفە نیە ، بەڵکوو ئەو شتەیە کە خەڵك بەراستی پێی دەڵێن فەلسەفە هۆنینەوە · ( ٢ )

هەر لە سەردەمی ، پێش لەدایك بوونی مەسیحەوە ، بەپێی بۆچوونە جۆراوجۆرەکان ، چەند رێبازی فەلسەفی پەیدا بوە کە لە باسی " ناسین "ی پەرتووکەدا بە پێی توانا لێی دەدوێین · باسی ئەوە دەکەین کە فەلسەفە دایکی گشت زانستەکانە · فەلسەفەی زانستی روانین و تێگەیشتنە لە گەردوون · تێگەیشتن لە گەردوون و جیهانبینییە لە لەرەسەی گۆڕین و گەیشتن بە ئامانج ، مرۆڤ لە کاری تێگەیشتن دا ، بەرامبەر بە شتەکان هەڵوێستی دەگۆڕێ · ( ٣ ) تێگەیشتن لە جیهان شوێنی راستەقینەی مرۆڤ لەسەر نەخشەی جیهان دەستنیشان دەکا ،

---

( ١ ) ــ قصة الایمان ، بەلگەی پێشوو بەرگی ٢٧ ــ ٢٦ · ( ٢ ) ــ دوکتور مەحموودی هومەن ،تاریخ،فەلسەفە،دەفتەرییەکەم چاپی ٣٥٤ ای هەتاوی بەرگی ٢ ــ ١ تاران · ( ٣ ) ــ نالەی فەلسەفەو زانست و جوولانەوەی نوێ · جەلال دەباغ چاپی ١٩٨١ ی زایینی ، بەرگی ١٢ ــ ١١ ·

دەست نیشان کردنێکی دیاری کراو دەبێتە هۆی جوولانەوەیەکی دیاری کراو .

وەك باسی دەکەین مرۆڤ بەشێکە لە سروشت و پلەیەکی تایبەتی یە لە پلەکانی باروخێکی تایبەتی مادەو لە پلەیەکی سەرکەوتووی پێشکەوتن دایە. کەوابوو یاساکانی سروشتی بەسەردا دەسەپێ و وەك مادەکانی تر لەشاو یاساو بیردۆزەکان دا ، ئەژی و بەرەوپیش ئەچێ . زۆر لە جوولانەوە و باروخی گەردوون ،بە ویستی ئێمە نیە . فەلسەفەی زانستی مرۆڤ ئەخاتە نێو جیهانی راستی یەوە .

فەلسەفەکانی تر بە ئەندازەی بەرژەوەندی خۆیان لەجیهانی راستی ئەدوێن . مرۆڤ پێویستە نییەت بکا کە تێ بگا . رێبازی دوور لە زانست پێی وایە ، مرۆڤ بەتایبەتی و جیا لە جیهان دروست کراوە ، پێش ئەوەی لە دایك ببێ ، چارەنووسی بەنێو چاوانیەوە نووسراوە . یەکێك بە گەورەیی و خاوەن دەسەلات دروست بۆەو ئەوی تر بە رووتی و برسیەتی و ژێردەستی، خولقاوەو هەرواش ئەمێنێتەوە ! ئەو رێبازە هەتا لێواری زانست دەڕوا ، چونکە بڕیاری داوە کە تێنەگا و بە بەرژەوەندی و بۆچوونی خۆی نەترازێ ، لەو سنوورە تێپەڕ نەبێ . لەگەڵ بیری زانستی هەڵوێست دەگرێ . فەلسەفە پێوەندی یە گشتی یەکانی نێوان ئالقەکانی زانستەو پێویستە خۆی لەسەر بناخەی زانست دابڕێژێ . پاش جیابوونەوەی زانستەکان لە فەلسەفە ، دەرکەوت ئەوانە بێ یەکتر نایان کرێ . ئەگەر فیلسوف زانا نەبێ ، لە بۆچوونەکانی دا هەڵە دەکا . وای لێ دەکا نەتوانێ راستی و نهێنی یەکانی گەردوون بدۆزێتەوە . هەروەها وپشت گوێ خستنی فەلسەفە لەلایەن زاناوە ، ئەبێتە هۆی ونکردنی ئامانجی دۆزینەوەکانی ، لێ هەڵە بوونی شێوەی گۆڕینی کۆمەڵ و بەکارهێنانی ئاکامی زانستەکان لە پێناوی وەدی هاتنی بەرژەوەندی مرۆڤ دا .

فەلسەفەی زانستی بریتی یە لە پێوەندی یە گشتی یەکانی نێوان ئالقەکانی زانست . لێرەوە زەمینەی بیرکردنەوەمان دیاردەبێت و ئەبین بە خاوەنی هەڵوێستی دیاری کراو لە بەرامبەر گشت مەسەلەیەك دا . لە یەك سەرچاوەوە تەماشای ئابووری ، رامیاری ، ئەدەب و کۆمەڵ دەکرێ . لەو پەنجەرەوە ئەتوانین بزانین ، هەڵس وکەوتمان بەجێ یە یان نا ؟ چی

پەروەردە بکەین و چی لەنێو بەرین ، مل بۆچی دابنوێنین و چی رەت بکەینەوە • ( ۱ )

ئەوەی لە شتە بنەڕەتی و بچووکەکان ئەکۆڵێتەوە کە لە سەرێکی ترەوە گەورەن ، زانستە کە وابڕوژلەد وای رۆژ ئەرکی زانست گرنگتر ئەبێ و زیاتر پێش ئەکەوێ • ئەگەر فەلسەفە بریتی بێ لە پێوەندییە گشتییەکانی نێوان ئالقەکانی زانست ، پێویستە خودی فەلسەفە ، خۆی لەسەر زانست دابڕێژێ • بەڵێ فەلسەفە لەسەر زانست راوەستاوە ، نەك بە پێچەوانەوە ، هەربۆیە پێویستە فەلسەفەی ئەمڕۆ لەسەر زانستی ئەمڕۆ بدوێ ( بەو پێیە فەلسەفەی دوێنێ ئەرکی ئەوە بوو لەسەر زانستی خولی خۆی بدوێ ) • زانستی پێشکەوتوو لەنێو فەلسەفەیەکی دواکەوتوودا ، جێگای نابێتەوە • بەرامبەر بە هەر زانستێکی نوێ ، فەلسەفەیەکی نوێ هەیە • ئەگەر بە پێی زانستی سەردەم فەلسەفەیەکی نوێ نەبوو ، واتای ئەوەیە کە هێشتا ئەو فەلسەفەیە نەدۆزراوەتەوەو گەڵاڵە نەکراوە • بێجگە لەوە ، پێویستە بەوە بڕوامان هەبێ کە لە بەرامبەر هەر زانستێکی نوێ دا ،فەلسەفەیەکی نوێ هەیە • بە پێی بەرەوپێش چوونی زانست ، فەلسەفەش جل وەرگی خۆی دەگۆڕێ • پێویستە لە فەلسەفەوە بێینە خوارەوە بۆ نێو ئالقەکانی زانست و لە زانستەوە سەر بکەوینەوە بۆ نێو فەلسەفە • جیاکردنەوەی فەلسەفەو زانست ، وەك جیاکردنەوەی لەش و سەر وایە • فەلسەفە بەبێ زانست ، جیهانێکی خەیاڵی و هەڵاوەسراوەو لە راستی دوورە • زانستیش بەبێ فەلسەفە ئەبێتە هیرۆشیما و جێگاکانی تر • دەرچوونی زانست لەژێر رکێفی فەلسەفە ، هەرەشە لە ژیانی مرۆڤ دەکا • ئەو شتە مرۆڤ بەدەستی هێناوە ، لە خۆی گەورەترە • ئەگەر بیروبۆچوونێکی فەلسەفی نەبێ ، سەری ئەخوات • بە هۆی زانستەوە ، زۆربەی گرێیەکان ئەکەینەوەو لە شتەکان ئاگادار ئەبین • بەهۆی بیردۆز ( نظریە ) وە ، یاسا زانستییەکان ، بە راستترین تێوازئەگەین • لەم بوارەدا ، گۆڕین شتێکی بێ ئەملاوئەولایە •

وەك باس دەکرێ ، فیلسوف لە کۆن دا دەسێك بوو لە بە گشت زانستەکانی دەورانی خۆی ئاشنا بوو ، وەك لە باسی فیلسوفەکانی پێشوو

---

( ۱ ) ــ ئالەی فەلسەفەو زانست ، سەرچاوەی پێشوو بەرگی ۲۱ ــ ۱٦ •

پاش لەدایك بوونی مەسیح دادێ، بە پێی توانا باسی هەموو شتێکیان کردوە، دیاردەکانی سروشت،هۆیەکان، بناخەی شتەکان و هتد...

هەرچەندە ئەوەی ئێستا زانستێکی سەربەخۆیە، ئەوکات لە چوارچێوەی باسە فەلسەفی یەکان دا، خۆی دەخواند. لەوانەبوو زانستەکان وەك فیزیك، شیمی، گیان لەبەرناسی، ماتماتیك و هەندەسەو میکانیکی ئاسمان، بە گشتی زانستە سروشتی یەکان، هەروەها دەروون ناسی، مێژوو، ژیریی (منطق)، کۆمەڵ ناسی، ئەدەبیات، ئەخلاق،بە گشتی زانستە ئینسانی یەکان لە تێکەڵاوی باسە فەلسەفی یەکان بوون، بەرەبەرەو بە پێی پێش چوونی زانست، لە فەلسەفە جیابوونەوەو هەرکامە بەشێك لە هەستی سروشت یان بارەکانی زمین و دەروونی مرۆڤیان کردە مەیدانی تاوتوێ خۆیان و سنوورو سەراوردیان دیاری کرد و بۆ لێکۆڵینەوە تەرخان کرا. بەم جورە بە گەمارودانی ئەو بەشە کە پێی دەگوترێ "موضوع"ی زانست (بۆ هەر زانستێك شتێکی وا هەیە) سەرکەوتنی سەرسوڕهێنەریان وەدەست هێنا.

لە بواری فەلسەفەی کۆن دا، چەند باسی فەلسەفی شی کرانەوە: باس لەسەر ئەم گەردوونەو هۆیەکەی "فەلسەفەی هەستی"، باس لەسەر هۆش و هێزو نێوەرۆکی "فەلسەفەی ناسین" باس لەسەر خەیرو جوانی و خراپی "فەلسەفە قیەم" ڕێ و شوێنی هێنایە کایەوە. (١)

لای خواپەرستان گەوهەری فەلسەفە باسی خودا پەیسینەو لای ماتریالیستەکان، باسی مادەو ئاڵ وگۆڕەکانی و هۆشمەندی (شعور) گەوهەری فەلسەفەیە.

هەرکامە لە فیلسوفەکانی جیهانی کۆن، بەگوێرەی توانا ئەوباسانە و باسی تریان گەڵاڵە کردوەو بیروڕای خۆیان ڕاگەیاندوە. کاتێك پرسیارێ نە هەستی و هۆیە بنەرەتی یەکەی دەکرێ، داخوا فیلسوفەکان ئەو هۆیەیان چۆن ناساندبێ و بە چیان زانیبێ؟ خودا؟ مادە؟ کامیان؟ لە لێکۆڵینەوەی خۆیان دا بۆ دۆزینەوەی ئەو هۆیە، هێندێکیان خودایان دیاری کردوەو هێندێکیان کێشی هۆشیان نەیانی گەیاند وەتە ئەو پلەو

---

(١) ــ قصة الایمان، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی ٢٧.

هێندێکیان گۆڕلیان لێ کرد وه ٠
وەك پاشان روون دەبێتەوە ، بە پێی باس کردن لەسەر بابەتەکان لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی سروشت و شتەکانی دەوروبەر ، ئەم گەلالەیە وەبەر چاو دەکەوێ :
١ـ تێکۆشانی بۆ ناسینی هۆی بنەرەتی و سەرەکی جموجۆڵ و جوڵاندن ، واتا " خودا " ٠
٢ـ لەو پێوەندییەدا مرۆڤ ناسینەرەو لە بەرامبەری دا دەبێ " ئینسان " دابندرێ ٠
٣ـ لایەکی تری زەمینەی لێکۆڵینەوەی شتەکانی دەوروبەرە کە دەبێ " سروشت " دابندرێ ٠ کەوابوو : خودا ، ئینسان ، سروشت ، سێ بابەتی ناسینن و لە گەلالەیەکی تردا ، ئەم شێوازە دێتە بەرچاو :
١ـ سروشت ٢ـ مرۆڤ ٣ـ هۆشمەندی ٠ یەکەمیان بوو بە گەلالەی خوداپەرستان و دووهەمیان بوو بە گەلالەی پەیڕەوانی مادە ( ماتریالیستەکان ) ٠
ئێستا با بزانین ، فیلسۆفانی جیهانی کۆن ، چۆن بۆ شتەکان چوون و چۆن شتەکانیان شی کردوەتەوە :
سوقرات : ئەو بە جێگای باس لە ئامانجەکانی جیهان و بناخەی سروشت و هۆی هەستی و ژیان ، سەرنجی بۆلای هەڵسەنگاندنی حالەکانی مرۆڤ و دۆزینەوەی توانایەکانی ئەو ، راکێشاوە ٠ تێکۆشانی بۆ ناسینی راستی لەگەڵ هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی کردەوەی و ئاخاوتنی خۆی و ئەوانی تر ، تێکەڵ بوو و بۆ بارهێنانی مرۆڤ ، هەوڵی دەداو دەیویست خەڵك بۆلای هونەرو گەورەیی ، رێنوێنی بکا ٠ بە پەیڕەوی لە رەوشی دیالکتیك بۆ دۆزینەوەی راستەقینەی شتەکان و کارەکان ، تێدەکوشا ٠ ئەگەر بە ئاکامی دروست نەگەیشتبایە ، خۆی بە نەزان لە قەڵەم دەدا ٠ (١)
سوقرات بناخەی فەلسەفەی ناسینی داناو ریشەی پەرهێزگاری لەسەر بناخەی راستی پتەو کرد ٠٠٠ دژی پڕوپاگەندەی سوفەستایەکان کە لایان وابوو ، ئامرازی ناسین تەنیا هەستە ، راپەری و ویستی خەڵك

---

(١) دکتور محمود هومن ، تاریخ فلسفه ، سەرچاوەی پێشوو ، پەرگی ٤ـ٢ ٠

بەرەو کاریگەربوونی هۆش لە ناسین دا ، ڕێنوێنی بکا ، تا بۆ گەورەیی ( فضیلت ) ، ناسینێکی باش ، نیشان بدا ٠ سوقرات وتی : ئەمە کە بناخەی ناسین لەسەر هەستەکانەوە دانراوە ، هۆشمەندانە نیە ، چونکە هەستەکان بە جیاوازی کەسەکان و هەل ومەرج ، جیاوازی‌یان هەیە و پێویستە بناخەیەکی سابێت بدۆزینەوە کێشەی تیدا نەبێ ٠ کاتێک تەماشای ناسینەکانی خۆمان دەکەین ، ئاگادار دەبین کە تێگەیشتنە بەش بەشەکان ( جزئی ) ئەگرنە بەرکە لەلایەن هەستەکانەوە بە ئێمە گەیشتوون ٠ هەروەها بە چەند تێگەیشتن دەگەین کە بوونی دەرەوەی‌یان نیە تا هەستەکان بتوانن بەرەوروویان بن و پێوەندی‌یان لەگەڵ بگرن .وەک واتای جۆر ( نوع ) ، کە بە تەواوی لە هۆش‌یان لە زەین دایە ٠ تێگەیشتن لەم شتە کاری هۆشەو ئەمەش گشتی هۆشی " لی عقلی " یە کە پێویستە لەسەر ئەوناسین دابندرێ ٠ ئێمە بەم تێگەیشتنە دەتوانین بۆ هەموو شتێک ناسینێک ( تعریف ) دابنێین و پێوانەی دروست و سابیتیان بۆ لەبەرچاو بگرین ٠٠٠ ( ١ )

لە پێوەندی لەگەڵ رەخنەی سوقرات لە سوفستایەکان دا پێویستە بڵێم بەداخەوە ئەوانە کە پاشان بە بەرناوەژوو نیشاندەری راستی‌یەکان ناویانگیان دەرکرد ، لەراستی‌دا ئەو مامۆستایانە بوون ، بۆ دۆزینەوەی نهێنی‌یەکانی سروشت ، لە ناخی خودی سروشت دا دەگەڕان و پەنایان بۆ خەون و خەیاڵ نەدەبرد ، پێیان وابوو ناسینی سروشت ودیاردەکانی ، تەنیا لە ڕێگای هەستەکانەوە دەگونجێ و لە هەستەکانەوە دەبێ بەرەو هۆش بچین و دەسبەجێ و بێ کەڵک وەرگرتن لە هەست نابێ پەنا بۆ هۆش بەرین ٠

ئوکلیدس : لە ساڵی ٤٥٠ ی پ ز لە شاری " مەگار " لە دایک بوو ٠ دەی‌گوت : " یەک " پارمنیدس هەر ئەو شتەیە کە سوقرات پێی‌دەگوت " چاکە " ٠ ئەوەی کە دژی چاکەیە " ناتوانێ ببێ " چونکە چاکە وەک " یەک " هەمیشە خۆیەتی ٠ هەرچەند بە چەند ناو وەک : خودا ، زانایی هۆش ، ناوی هەبێ ، بەڵام ناگۆڕدرێ ٠ ( ٢ )

---

( ١ ) ــ د ــ خلیفی ، تاریخ فلسفە اسلام ، پێشوو ، بەرگی ١٩ ــ ١٨ ٠

( ٢ ) ــ د ــ هومن ، سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی ٧

ئانتی ستن ؛ قوتابی سوقرات، لە جۆرە دیالکتیکێك کەڵك وەردەگرێ ، بەدوای ئاخاوتن دا دەڕوا و چەمکە ( مفهوم )ەکان ئەناسێنی • پێی وایە ئەمە هەنگاوی یەکەمە لە فێرکردن و بارهێنان دا • لەم بارەوە کتێبێکی بە ناوی " پەروەردەکردن " نووسیوە • ( ١ )

ئاریستیپرس ؛ لە سالی ٣٥ پ ز لەدایك بوە • پێی وایە هەستکردن بناخەی ناسینە • هەستکردن ( کارلێك )ی لەو شتەی کە هەست پێك دێنێ ،جیاوازە • تەنیا هەستکردن بۆ ئێمە ئاشکرایە • بەڵام ئەوەی هەست ئەبزوێنێ بۆ ئێمە نەناسراوە • هەرچەند هەموومان بۆ شتەکانی دەرەوەی زەینمان ، یەك بۆچوونمان هەیە ، ئەوەش نازانین هەستی خەڵکی دیکە لەگەڵ ئێمە دا یەکن یان جیاوازن ؟ بەختەوەری یانی خۆشی لەشی ، نەك روحی • فەلسەفەش ئامرازی ژیانی مرۆڤایەتی یەو مرۆڤ لە دیلی رزگار دەکا ،چونکە ژیانی مرۆڤ بریتی یە لە تێکۆشان بۆ کەڵك وەرگرتن لە خۆشی ئێستا ، بێ ترس لە داهاتوو و پەرۆش بوون بۆ رابردوو • ( ٢ )

ئود وکسوس ؛ قوتابی ئەفلاتوونە • لە زانستەکانی ئەو سەردەمە دا ، دەستی هەبوە • وەك ئەژمێر، جوگرافی ،پزیشکی ؛ یاسادانان ، ئەستێرە ناسی • پێی وابوو ئەژمێرو هەندەسە بەیەکەوە پێوەندی یان هەیە • پێش دیکارت بەشی هەندەسەی تەحلیلی دۆزیەوە ، رەوشی بەش بەش کردن ( تجزیەو حل کردنی ئەژمێر) کە سەرەتای " جەبر"ە ، دەڵێن ئەو پێی گەیوە • هێندێك لە دۆزینەوەکانی تری هەندەسی لە ئێستا سەلمێندراون ، ئەو خەڵکی بۆ دۆزینەوەیان داوە ، لای ئەو خۆشی بەرزترین چاکیە • ( ٣ )

هیراکلیتۆس ؛ بە گەڕانی زەوی بەدەور تەوەرە ( محور)ی خۆی دا ، ... ئەبوە • ( ٤ )

ئەوکە لەنێوان بیروڕای دارنین ( ذهن ) و سروشت ( عین ) دا

---

( ١ ) ــ دکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ١٣ــ ١٢ •
( ٢ ) ــ دوکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ١٩ــ ١٨
( ٣ ) ــ دوکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ٢٥ــ ٢٧
( ٤ ) ــ هەر ئەم سەرچاوەیە ، بەرگی ٣٥

گومانی هەبوو و ئەم دەس و ئەو دەسی دەکرد ، وتی : وەك دەبینـــم شتەکان وان لە گۆڕانی هەمیشەیی و بێ پسانەوەدا ، ساتێك ولەسەر یەك دوخ نامێننەوە . راوەستانی رواڵەتی لەگەڵ سەقامگیربوونی نیسبی لــە شتەکان دا ، دەبینین ، خەیاڵی یەو نیشانەی بێ توانایی ئێمە لە دیتنی ئاڵ وگۆڕی وان دایە . ئەو لەم بۆچوونە ئاکام وەرد ەگرێ کە شتێك لە یەك سات دا ،هەم هەیەو هەم نیە ! ئەم یەك بوونە ساتی یە لەنێوان وجــوود و ناوجوود و بوون و نەبوون دا ناوی " گەڕان = صیرورت " ەو راستـــی وجوودە . لەم بۆچوونە لە تەوجی خوڵقاندن دا ، دەڵێ وەرناگـــرێ و ئەگەڕێتەوە بۆ بیروبۆچوونی ئەوانەی تەماشای سروشت دەکەن و دەڵـــێ : ئاگر ، بنەڕەتی جیهانە، چونکە دەبێتە هەوا و هەواد ەبێتە ئاو و ئاو دەبێتـــە شتی ویشك ( جەستە ) پاشان ئەویش ئەبێتە هەوا و ئەویش ئەبێتە ئاگـر . لەبەرئەوە گەرمای تێکەڵ ژیان دەکرد ، پێی وابوو " روح " بۆخـــۆی ئاگرە . ( ١ )

فیلیپوس : ئەگەر ژمارە لە مرۆڤ وەربگرن ،ناتوانێ بە زانیاری بگـــا ، لە هەرجێگایەك ئەژمار هەیە ، رێك وپێکییش هەیەو بە پێچەوانەکەشـــی راستە . پێنج جیسمی رێك و پێك هەیەو گشت شێوازەکانی تر لەوانـــەوە سەرچاوە ئەگرن . یەك شێواز هەیە کە ناجیسمانی و بێ رەنگە ، ئەویـــش رەوانەو خودایی ترین جۆر ( نوع )ە . کاری دروست کردن و جم وجـــۆڵ وەکارخستنە ، دروست کردن ، دیتن ، بۆ جیسمە ، بەڵام رەوان ،هـــۆش و فامی هەیە ،نابیندرێ ، بەڵام بێ لێ تێگەیشتن دەبێ و دەتوانـــێ ئاڵ وگۆڕەکانی ئەژماری ، جووت و تاق وەبیر بێنێتەوەو بیان ژمێرێ . ( ٢ )

قوتابخانەی جینا لە هیندوستان :

ئەم فیلسوفانە لە هیندی کۆن دا پێیان وایە : لە جیهان دا تەنیـــا دوو جۆر بوون هەیە . یەکەم ــ ژیان دووهەم ــ نە ژیان و خاوەن چەنـــد

---

( ١ ) ــ د ــ خلیفی، تاریخ فلسفة اسلام ،پێشوو بەرگی ١٥ .
( ٢ ) ــ د ــ هومن، تاریخ فلسفە سەرچاوەی پێشوو،بەرگی ٢٨ ــ ٢٧

هێزن کە بە کارلێکی ئەوان ژیان و نە ژیان تێکەڵ دەبن • هەروەها بەپێی پلۆنایەتی جیهان و شتەکان بەم دوو جۆرەو پێنج هێزەکانیانەوە، پێوەندییان هەیە • ئەم حەوت شتە لە پێیدەڵێن " اینی " و بریتین لە : ١ـ ژیان ٢ـ نە ژیان کە راستەقینەو واقیعی بنەرەتی جیهانن و پێنج هێزیان ئەمانەن : ١ـ نفووز ٢ـ بەند یان بەستن ٣ـ پێشگیری کردن ٤ـ دوورکردنەوە ٥ـ رزگاری • نە ژیان دەتوانێ لەژیان دا نفووز بکا • ژیان دەتوانێ پێش بەوە بگرێ و نەهێڵێ و خۆی رزگار بکا • کارلێکی ئەم دوو جۆر ( نوع ) میە لە جیهان و هەر شتێک لەودا هەیە، ئاوا دەبێ و ئاوا نابێ • • • باسی رەوان ( دەروون ) گەوهەرە بێ رەوانەکان، مادە، شوێن، کات و هتد • • • دەکەن و بە هەرکامەیان ئەرکێک لە ژیانی ئۆمەلایەتی و جەستەیی دا، ئەسپێرن • مەبەستی پەیڕەوانی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە " رەوان = دەروون " ی مرۆڤ، بە پلەیەک لە فێربوونی تەواو بگەیەن • • • ( ١ )

قوتابخانەی چارواکەی هیندوستان :

گشت سیستەمەکەی مادیەت لەسەر بناخەی بۆچوونی ناسینیان داڕێژراوە • پرسیاری بنەرەتی ئەمەیە : راستی تا چ ئەندازە بۆناسین دەبێ ؟ دەڵێن : هەست کردن تەنیا سەرچاوەی ناسینە • هەڵسەنگاندنی ژیربێژی و شاهیدی خەڵکی تر هۆی دروست بوونی دادگەری نیە • تا شتێک هەست، هەستی پێنەکا، ناتوانێ دان بە بوونی دابندرێ، چونکە هەست کردن تەنیا جیهانی مادی دەناسێ • کەوابوو هیچ شتێک بێجگە شتی جیسمانی و مادی وجودی نیە • جیهان لە چوار توخمی مادی : ئاو ـ خاک ـ ئاگر و هەوا لە بوونیان بە هەست کردن ئاشکرا دەبێ، دروست دراوە • هەرشتێک هەیە مادیەو جیسمانی، شتی نە مادی لە ئارادا نیە • ( ٢ )

---

( ١ ) ـ دوکتور هومن، پێشوو، بەرگی ٥٩ ـ ٥٠
( ٢ ) ـ دوکتورهومن، پێشوو، بەرگی ٦٢ ـ ٦١

بەم جۆرە دەبینین ، بیروبۆچوونی مادی و بڕوا بەوەکە مادە سەرچاوەی هەموو ئاڵوگۆڕێکەو بێجگە لە مادە هیچ شتێك لەم گەردوونەدا ، لە ئارادا نیە ،لە چەند سەد ساڵ پێش زایینی یەوە ، ئاوەها باس کراوە . مسرێف ، سروشت و هەست پێ کردن و دۆزینەوەی پێوەندی یەکانی مادە .

سیستەمی سانکیە :

---

نرخ و گرنگی ناسین لێرەدایە کە بە هۆی ناسینەوە دەکرێ ، هـۆی دەرد و رەنج بزانرێ و بە لابردنی ئەم دەرد و رەنجە " رەوان ، دەروون " رزگار بکرێ . هێندێك لە ناسینەکان بەشێوەی کاتی ، دەتوانن رەنـج لەنێوەرن . بەڵام پێویستە بۆ دوورترین هۆیەکان بگەڕێین تا بەدۆزینەوەیان ڕێگای رەوشی ژیان و رزگاری لە چارەڕەشی ، بدۆزینەوە . . . بـۆ سەرهەڵدان و پەیدابوونی جیهان دەڵێن : " پرکریتی " ناهۆشیار و نەزانە " پوروشە " کارنەکەرو بێ کارلێکە . یەکەم بە دووەم نیازی هەبوو ، تا بناسرێ و نرخ پەیدا بکاو دووەم بە یەکەم نیازی هەبوو تا پێوەندی و خۆشەویستی بکێشێتە مەیدانی ئەزموونەوە و تێ بکۆشێ خۆی لە زنجیری " پرکریتی " رزگار بکا . لە لێکدان و بە یەك گەیشتنیان ، پشکوتنی جیهان دەستی پێ کرد . . . ( ۱ ) ۳ سەرچاوەیان بۆ ناسین هەیە : هەسـت پێ کردن ، بەرهەمهێنان و شایەتی . هەرسێکیان لە دیاردەکانی هۆشن ، هۆشیش نووری زانستی " خود " ە . . . ناسین بە هۆی هەست و رەوشتەوە دەبێ کە وێنە ( تصویر )ەکان لە هۆش دا دەرکەون و بەهۆی زانیاری یەوە روون ببێتەوە . هەست کردن بریتی یە لە ناسینی بێ کەرەسەی یەك شت لە ڕێگای پێوەندی لەگەڵ ئەو شتەدا . کاتێك شتێك دێتە مەیدانی چاوپێکەوتن ، لە نێوان چاو و ئەو شتەدا پێوەندی یەك پەیدا دەبێ ، ئەو شتە وەك نەخشەیەك یان گۆڕانێك لەو هەستەدا بە وجود دێنێ ، ئەمیش بەهۆی ئاکارەوە شی دەکرێتەوە . ئاکاریش دەبێتە هۆی گۆڕان یان دیاری کردنی هۆش . بەم جۆرە هۆش لە شێوازی ئەو شتەدا ، دیاری

---

( ۱ ) ـ دوکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ۲ ـ ۷ ـ ٦٦

دەکرێ و بەم پێیە ئامادەی نووری زانایی دەبێ و وەك ئاوێنەیەکــــــی لێ بەسەردێ ، کە لەلایەك ڕووناکی زانیاری لە " خود " ەوە وەردەگــرێ و لە ئاکاردا ، ڕەنگی پێدەداتەوەو لەلایەکی ترەوە خۆی بە تێوازی ئەو شتــــە هەست پێکراو و دیاری کراوە بە " خود " پێشکەش دەکرێ ، بەو شتــــە زانیاری دەست دەکەوێ . هەست کردن دوو جۆرە : ١ــ دیاری کــــراو ٢ــ دیاری نەکراو . دیاری نەکراو ساکارەو ئەوی تریان قووڵەو شــــــی دەکرێتەوە . . . لەباری سیستەوە دوئالیستی یە : پرکریتی و پوروشە . ( ١ )

## سیستەمی نیایە :

خاوەنی بیروباوەڕی ناسین سەبارەت بە جیهان و سروشت ، ئازادی و ڕزگاربوون لە ڕەنج و خود اناسینن . دانەری زیرێتی ( منطق ) کە هۆ بــوە بۆناسینی دروستی سروشت و ژیان . مەبەست لە ناسین ڕزگاربوون لــــە دەرد و چارەرەشی یە . ڕێگای دروستی ناسین شازدە هەنگاوە : بابــــەت ( موضوع )ی ناسینی دروست ، واتە ڕاستەقینە و واقیعی ، گومــــــان ، مەبەست و ئامانج ، نموونە واتا کارێك کە بناخەیەکی نکوولی لێ نەکــــراو نیشان بدا ، دوکتورین واتا کۆی فێرکردنەکانی چوارچێوەیەك کــــــــە ڕاستی یەکەی سەلمێندراوە ، بەشەکانی دادگەری ، ئاکام وەرگرتــــــــن ، سەلماندنی ناڕاستەوخۆ ، سەلماندنی شتێك لە ڕێگای نیشاندانیــــەوە ، نادروست بوون و ناگونجاوبوونی ناتەباکەی ئەو شتە ، ناسینی متمانە پــێ ــ کراوی هەر شت واتا متمانە دەربارەی یەك شت ، وت وێژ واتا دیالکتیك بــە واتای سوقراتیەکەی ، کێشەو خستنە بەرباس ، باس بۆ نادروست نیشــــان دانی وتەی لایەنی تر ، بێ ئەوەی خۆت نیشان بدەی ، وتەیەك کــــە وەك بەڵگە وایە بەڵام بەڵگە نیە ، وەرچەرخان واتای وتەی لایەنی وت وێژ واتـــا چەند چەمك " مفهوم " لە وتەی ئەو لایەنە بگرێ لە واتایەکی تردا کەڵکـــی لێ وەرگرێ ، شوبهاندنی نابەجێ ، خراپ لێ تێگەیشتن یان تێ نەگەیشتـــن لە وتەی لایەنی تر . ئەرستوش دەپلەی یەکەمی هێناوە . ( ٢ ) . ناسیـــن

---

( ١ ) ــ د ــ هومن ، تاریخ فلسفە ، پێشوو ، بەرگی ٨٠ــ٧٦ ( ٢ ) ــ دوکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ٨٢ــ٨٠

دوو جۆره : دروست و نادروست . دروست تێڕوانین ، بیرلێکردنەوە ، هەڵسەنگاندن و سەلماندن دەگرێتەوە . دووەمی : گومان ، هەڵـــە و سەلماندنی ناراستەوخۆ دەگرێتەوە . دروست لەبەرچاوگرتنی دوور لە هەڵە و بێ ئەملا وئەولا و دیاری کراوی شتەکانە یان خودی شتەکانەو لەگەڵیـــان دێتەوە . نادروست وانیە . ( ۱ )

ئەمەو بیروبۆچوونی بەم جۆرە بوونە بناخە ، چوارچێوەی بیری فەرانسیس بیکەن و روجرز بیکەن و سەرەنجام رەوشی لێکۆڵینەوەی زانستیان دانا و بوونە هۆی ئەو گشت گەشەکردن و بەرەوپێش چوونەی زانست وکۆمەڵ . هەروەهـــا چوارچێوەی ژیریێتی ( منطق )ی ئەرستووی دانا .

سیستەمی ویشیکە :

ئەم سیستەمە بە نیایەوە نزیکە . بەڵام باسی جیهانناسی ئەم بـــەر فراوانترە . پەیرەوانی دەڵێن : حەوت چەمك گشت شتەکانی جیهـــان ئەگرێتەوە : گەوهەر ، چلۆنی ، جم وجۆڵ ، نیسبەت ، نەبوون ، گشتـــی و بەش بەشن ( کلی و جزئی ) . گەوهەر نۆ بەشە : ئاو ، خاك ، ئاگر ، هەوا ، ئێتر ، با ، کات ، شوێن و خۆ و دەروون . چوار گەوهەری یەکەمی لـــە گەردیلە دیتراوەکان و لەنێو نەچووەکان دروست کراون و مادە دروســـت دەکەن گەردیلەکان لە بوونەکانی کۆن و بچووکترین بەشی مادەن . بـــە خۆیانەوە جم وجۆڵیان نیە ، سەرچاوەی کارلێکیان ،بریتی یە لە ئێرادەی خوا . خودا بۆیە گەردیلەکانی دروستکردوە کە لەوان جیهان بخوڵقێنـــێ و دەروونە تاقە کەسی یەکان بتوانن لە جیهاندا خەریکی کردەوەی ئاکـــاری بن و بەپاداشتی ئەخلاقی بگەن . سێ یەکەی تریان : ئێتر ، کات و شوێن ، بۆ هەست پێکردن نابن ، هەتا هەتایین و لە هەموو شتێك دا نفووزیـــان هەیەو دەچنە ناخـــی شتەکانەوە . گەوهەری هەشتەمیش هەتا هەتایـــە و بەڵام لە گشت شتێك دا نفووزی نیەو بێ ئەندازە بچووکەوەك گەردیلەیـــەك وایە ، هەریەکە لە یەك چرکە ( ثانیە ) دا ، پتر لە یەك هەستمان نابـــێ .

---

( ۱ ) ـ دوکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ۸۵ .

خوّ و ئاکار وەك هەستی دەروونی یەك وایە کە لەگەڵ گشت کــــارە دەروونی یەکاں دا وەك : ناسین و هەست و ئیٚرادە ، پێوەندی هەیـــە. دەروون هەتا هەتایەو لە هەموو شتێك دا نفووزی هەیەو گەوهەری گشـــت زانستەکانە . دەروونی ناقەکەسی ئەوەیە کە بە هۆی ناکاری فەردی لـــە دەروونەوە ، تەماشا نەکرێ ! بۆ نموونە ئەوکات کە مرۆڤ دەڵێ " من تنادم " یان " خەمبارم " باری دەروونی و رەوانی ئەو بە هۆی ئاکـــارەوە وا هەست پێ دەکرێ و ئەبیندرێ . سەبارەت بە ٦ چەمکەکەی ترئـــــەم دابەش کردنە کراوە . چۆنی بە ٢٤ و جموجۆڵ ٥ ، ئەبوون بە ٤ بـــەش ، دابەش کراوە . ( ١ )

## گــەرانەوە بۆلای بیروباوەری یونانی یەکان :

فیلسوفەکانی کۆنی یونان لە راستی دا بناخەدانەری زانستەکانـــی ئەوڕۆن . هەربۆیە بۆ ئەوە بزانـــین تا گەیشتن بە زانستە جۆراوجۆرەکـان و فەلسەفەی زانستی ، بۆ ئەم کۆشکە رازاوانە ، سەدان زانای بە توانـــا بەردیان بە کۆڵ کێشاوەو سەدان کەڵێن و قوژبنی ئەو کۆشکانەیان پـــڕ کردۆتەوە، دیوارەکانیان بەرز کردۆتەوە ئەم باسە پێویستە .

سپوسیپوس : قوتابی یەکی تری سوقرات پێی وابوو ، ئەژمار ، ئەندازە و دەروون ، بناخەیەکی جیاوازییان هەیە . ئەژماری ماتماتیکی وەك بناخـەی شتەکان لەبەرچاو گرت . ئەرستوو رەخنەی لێ گرتوە کە ماتماتیکی لە جێگای فەلسەفە داناوە ! . . . سەبارەت بە ناسین پێی وایە : هەست کـــردن دەتوانێ ئێمە بە زانست بگەیەنێ . واتا بێجگە لە وتەی زانستی کە زانستی گشتی شتەکان نیشان دەدا ، هەستی زانستیش هەیە . ئەمە بۆچوونێکـــی دروستە . چونکە تێگەیشتن و فامیش لەودا کاریگەرە . . . سەبارەت بـــە ئەخلاق وەك مامۆستای بیر دەکاتەوە .

کسنوکرات : لای ئەو ناسین سێ بەشە : زانست ، هەست کـردن و بیرکردنەوە . زانست راستی تەواوی هەیە بەڵام راستی هەست کـــردن

( ١ ) ــ دکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ٩٨ ــ ٩٧ .

بێ ئەملا وئەولا نیە · لە بیرکردنەوە یان گومان کردن دا ، راستــی و درۆ پێکەوەن · بابەتی ناسینیش سێ بەشە ، یەکەم ــ زاتە ناسێند راوەکان ، کــە پێوەندی بەوەری ئاسمانەوە هەیەو بە زانستی زانایان ، دەناسێند رێــن · دووەم ــ شتەکانی ژێرئاسمان واتا زاتە هەست پێکراوەکان کە لە رێگــای هەستکردنەوە ، دەناسێند رێن · سێیەم ــ خودی ئاسمان کە زاتیــەو تێکەڵا و و بابەتی گومانەو بەهەستیش دەناسێند رێ و بە چاویش دەبیند رێ و لە رێگای زانستی زانایانیشەوە بۆناسین دەبێ · واتا بە هۆی ئەستێــرە ــ ناسییەوەو لەودا راستی و نەراستی پێکەوە تێکەلاون · فەلسەفە سێ بەشە ، یەکیان ئەوەیە کە پاشان نــاونرا ، زیرێنی ، بەشی تریان فیزیکی ئەوروپــە و بەشی سێیەم " ئەخلاق "ە لە دروستکردنی جیهان دا بناخــــەی " یەلی " و " دووەی " ئەفلاتوونی ، پەسند کرد · (١)

تالس ، جیهان ناتوانێ لە هیچ خولقابێ · هەر سەرەتایــــەك بریتییە لە ئاڵ وگۆڕ · بەو پێیە پێویستە ماد میەك سەرەتایی و بێ کات هەبێ کە گشت هەبوەکان لەوەوە سەرچاوەیان گرتبێ · ئەویش ئاوە · هۆیەکەشــی ئەوە بوو کە ئاو بۆ ئاڵ وگۆڕ دەبێ ·

ئاناکسیمند روس ، سەرچاوەی شتەکان لای ئەو ، ئاو و هەوایــــە · پێی وابوو ماد میەکی بێ شێوازو بێ سنوور کە بنمابێ پێویستە هەبــێ · ئاناکسیمنــس هەوا بە شیاوتر دادەنێ ·

فیساغورس ، ئەژمار سەرچاوەیە · ( یەك ) بنەرەتی ئەم گەرد وونەیــەو هۆ و راستەقینەیەتی · بەکورتی ئەو شتێکی دانا کە هەم مادە بێ و هــەم نامادە · بە بڕوای ئەو هەر شتێك دەتوانێ بێ بۆن و رەنگ و پانایــی و چێژایی هەبێ · بەڵام ناتوانین بڵێین ، نا ژمێرد رێ · هەربۆیە ژمــارە خاوەنی ئەو شیاوییەیە ،چونکە هەموو شتێك لە جیهان دا بریتییە لــە دەویات کردنەوەی ژمارە · ژمارەش خۆی لە دەویات کردنەوەی مــــادەوە دەمەرد ەکەوێ · کەوابوو " یەك " بناخەی هۆ و راستی جیهانە (٢) دیارە ئەم بیروباوەڕانە کەمتر لایەنی زانستییان هەیە ·

---

(١) ــ دوکتور هومن ، پێشوو ، بەرگی ١٠٢ ــ ٩٩

(٢) ــ د ــ خلیقی ، تاریخ فلسفه اسلام ،پێشوو ، بەرگی ١٥

گزنوفانس : خەلك خۆیان خودایان خولقاندوە . ئەویان وەك خۆیـــان لەبەرچاو گرتوە . ئەگەر کەروگاش خودایان ببایە ، ئەوانیش وێنەکەیان وەك خـۆیان دەکێشایەوە . لە حالێك دا لەو جیهانەدا بێجگە لە یەك خـودا ، خودایەکی تر نیە . ئەویش گشتی ، بینەر ، بیسەرو بیرە . بەلام ناسینی بـــۆ هێزی ناسینمان نەگونجە . هیچ مرۆڤێك ناتوانێ بەوردی خودا بناســـێ ، تەنانەت ئەگەر کوێرکوێرانەش پەسنی راستەقینەی خوداش رابگەیەنێ ، خۆی بەوە کە راست دەلێ و پێکاویە ، ئاگادار نیە ( ١ ) .

پارمنیدس : ئاو و هەواو ژمارە یان هەر شتێکی تر بۆنەوە سەرچـــاوەی جیهان بن ، شیاو نین ، چونکە لە ئالوگۆردان و ئێمە تەنیا لە روالـــەت و دیاردەکانیان ئاگادارین و لە راستی دا ئەمانەن کە ئال و گۆریان بەســەر دادێ . تەنیا پەسنی " وجود " شیاوی ئەویە . کەوابوو وجـــــــودی هەمیشەیی شیاوی ئەویە کە سەرچاوەی جیهان بێ . ئەو وجودە بـــێ سەرەتا ( ازلی ) بێ ئال وگۆر ، هەمیشەیی بێ رابردوو ، بێ داهاتــــوو دەگرێتە بەر ، ناجوولێتەوە ، بۆ دابەش کردن نابێ ، چونکە جموجــــۆل شێوازێکە لە بەرەوپێش چوون ، تەواوەو پێش ئەو هەبوویەکی تر نیە .

شتە هەست پێ کراوەکان لای ئەو لە بنەمالەی وجود نین ( ئـــەوان روالەتەکانی وجودن ) چونکە بەرەو نەمان ئەچن . لە حالێك دا وجـــود هەمیشەیی یە . ئەوان ئال وگۆریان بەسەردادێ و شتی واش خوازیــــاری بوون و نەبوونەو ئەمەش نەگونجاوە ( ٢ ) . لێرەدا بناخەی " وجـــودی مومکین " ی فیلسۆفەکانی ئیسلامی دارشتوە کە لەباری زاتەوە نــە داوای بوون ئەکا و نە نەبوون و بەستراوەتەوە بەهۆیەکەیەوە .

ملیسوس : قوتابی پارمنیدس بوو . لە پەسنەکانی ئەم وجـــــودە بێ پـایانە ، پەسنی " ژیان و هۆش " ی زیاد کرد . رای گەیاند لە هــەر شتێك لە نەبوونەوە هاتبێتە بوون ( حادث ) ، سەرچاوەیەکی هەیـــــە . خودی وجود وانیە ، چونکە ئەگەر وابێ ئەبێتە جۆری ناوجود ، کەوابـــوو خۆی سەرچاوەی نیە ، شتی وا پایانیشی نابێ ، بێ جموجۆلیشە ، چونکـــە

---

( ١ ) ـ قصةالایمان ، پێشوو بەرگی ٣٤ ـ ٢٨

( ٢ ) ـ د ـ خلیقی ، تاریخ فلسفە اسلام ، لاپەری ١٤ ـ ١٣

پاش ئەو شوێنێك نیە تا بەرەولای بڕوا ، ناجوولێ چونکە ئەگەر ئال وگــــۆڕی بەسەردا بێ ، لە " یەك " زیاتر دەبێ . تاقانە ،بێ سەرەتا ، بێ پایـــان ، زیند وو ،هۆشمەند و بێ گۆڕانە . ( ۱ )

ئامپد وکلس : فیلسوفی توخمی چوارینە لە سەرەتاوە ویستی لە نێـــوان بۆچوونی پارمنید س و هیراکلیتو س دا بە یەك گەیشتنێك پێك بێنێ ، هـەر بۆیە رای گەیاند : وجود یان جیهان لە " گەرد یلەکان " پێك هاتـــوە . بەسبی پارمنید س سەبارەت بە وجود ، " گەرد یلە " دەگرێتەوە . وتـــەی هیراکلیتوس لە " گۆڕان = صیرورت " ی هەمیشەیی جستەکان ، لـــەو بارەوە کە روانمتە خاوەن گۆڕانەکان لەواندا ، دەگرێتەوە . پاشان بـــۆ ئاشتی خستنە نێوان هەرد ووك بۆچوون ، بیروڕای توخمە چوارینەکــان ( عناصر اربعە) ی پێك هێنا . ئەم بۆچوونە تا خولی ۱۸ ای زایینی د رێژەی هەبوو . تا ئێرە ناویرا و لەگەڵ زانستی خولی خۆی دا ، هەنگـــــــاوی هەڵ گرتوە ، بەڵکوو لەوە کە گەرد یلەی بۆ سەرچاوەی جیهان دانا ، وە پێش کەوت . بەڵام ئەوکات کە لە سەرچاوەی دنەدەری گەرد یلەکان باس دەکـا ، بە بیروڕای د روست دەست پێ دەکاو بە خەیاڵی لەرزۆك و بێ ئاکام دەگاتــە ئەنجام! د ەڵێ مادەی جیهان مرد ووە و لە ڕێی خۆی دا بێ گیـــان و بێ جم وجۆڵە ، کەوابوو دەبێ دنەدەرێکی دەرەوەیی هەبێ وە جم وجۆڵـــــی بخا . جاری واشە دەڵێ : جم وجۆڵی مادە بریتی یە لە پێك گەیشتـــن و لێك پچڕان و ئەمانە پێکەوەن و سەرچاوەشی ناتوانێ یەك هێز بـــێ ، بەڵکوو دەبێ دوو هێز بێ . یەکیان پاڵ پێوەنەر بێ و ئەوی تریشیان راکێشەر . راکێشان و پاڵ پێوەنان بریتین لە خۆشەویستی و بێزاری . توخمـــــــــە چوارینەکان هەمیشە بە شێوەی هێزی خۆشەویستی بوون هێزی بێـــزاری کرد ووی بە چوار . پاشان خۆشەویستی هێزی خۆی کۆکرد ۆتەوەو لە نێـوان توخمەکان دا ، ئاشتی دامەزراند وە . لە ئاکام دا ئەو شتانە کـــــــە دەیان بینی ، بە وجود هاتوون . ئەو پێی وابوو خوا و ئەفسانەکانیش و هـەوا " هیرا = خودا " و زەوی " دارکوس= خودا " و ئاو خوای چـــوارەم بەناوی " ئەنستین " ئەوەی دەگری و فرمێسکی دەرێتە سەر زەوی ، لـــە

---

( ۱ ) ــ قصةالایمان ، لاپەڕی ۳٤ ــ ۲۸

توخمە چوارینەکان بە وجود هاتوون . ئەوندە چوو پێشەوە گوتی ، نەفسەکانی مرۆڤ هەموویان خودان یان هەڵەکارن . پێیان راگەیەند راوە ، دوور لە جێگای خۆشبەختی خۆیان دانیشن و لەگەڵ جەستەکان و ڕێبەرەو مردن چوەکان ، تێکەڵ بن . جەستە زیندووەکان لەسەر زەوی تەنیا سەری بێ ملن ، قۆڵی بێشانن ، چاوی بی تەوێڵن و پاشان لە هێزی خۆشەویستی نزیکەوە بوون و بوون بە مرۆڤ (١) .

دیموکریتوس : جیهان لە گەردیلەی بێ ئەژماری وەك یەك و بێ سەرەتاو بێ پایان ، کە بە زات جموجۆڵیان هەیە ، لە پانایی و مەیدان (فراغ) دا تێکەلا و بوون . لە جموجۆڵی و تێکەلا ویان ، شتەکان و لە ئاکام دا گشت جیهان بە وجوود هاتوە . جیاوازی پەیمەکانی شتەکان لە ئاکامی جیاوازی لێکدان ، شێوەی تێکەلا وی و باری ئەوان لە جەستەو جیسمدا ، جیاوازی بینەرانی ئەوان ، بە وجود هاتوە . گەردیلەکان بێ پایانن . چونکە بوون لە نەبوون پەیدا نابێ . هەروەها بوون نابێتە نەبوون . ئەگەر مەیدانیان نەبایە ، جموجۆڵیان نەدەبوو . هەربۆیە پێی وابوو لە جیهان دا سێ راستی هەیە :

١ــ گەردیلە
٢ــ مەیدان یان پانایی
٣ــ جموجۆڵ

هۆش لە دروستکردنی جیهان لە گەردیلەکان نکوولی ناکا ، بەلام چ کەسێك گەردیلەی خۆڵقاندوە؟ خۆی وەلام نادا تەوە . بەلام گوتراوە : چونکە ئەو خۆی ، جموجۆڵی گەردیلەکان بە ئاکامی " پێویستیی کردەوەیی = تاریکی یان لەجە " دەزانێ ، کە بۆتە هۆی جموجۆڵی و لێکدان و تێکەلا ویان ، نەیتوانیوە لە هۆشی کەلك وەربگرێ! دروست ــ بوونی جیهان ، وشك و گیاندار ، روح و خودا ، تێکەلا وێك لە گەردیلەکانە کە بە هێزی ئەم کوێرە یان هێزە کوێرە ، دەگەڕێ .

ئاناکساگوراس : پێویست بوونی تاریکی دیموکریتوسی رەت کردۆتەوە . رای گەیاند : ئەو ناتوانێ ئەم گشت جوانی و رێك و پێکی یە رابگەیەنێ ،

---

(١) ــ تاریخ فلسفه اسلام ، نوسەر ، لاپەڕی ١٦ ــ ١٥

چونکه هێزێکی وا بێجگه بێ سەرەوبەرەیی ، ئاکامێکی نابێ . ئەوەی مادە دەخاتە جموجۆڵ " هۆش "ە . هەربۆیە ، بە بناخەدانەری فەلسەفەی روحی ناسراوە .

پروتاگوراس : پێی وابوو مرۆڤ پێوانەی هەموو شتێکە . فیلسوفەکان ئەیانوت ، " هۆش " ئامرازی تێگەیشتنە . ئەودەیگوت ، تەنیا ئامرازی تێگەیشتنی مرۆڤ ، هەستە (١) .

گورگیاس : لە بوونی شتەکان نکوولی کرد و وتی : ناسین نەگونجاوە ، تێگەیشتن وناسین وناساندن لە نێوان خەڵك دا بێ بناخەیە .

ئەفلاتوون : بیروڕای سوقراتی مامۆستای پەسند کرد ، بەڵام ئەو بیروڕا و رێبازێکی " مثلی " دانا .بە بڕوای ئەو واتا گشتی یەکان ( مقولەکان ) بوونێکی راستەقینەیان هەیە کە لە پشتەوەی هۆشی ئێمەوەیە . ئەو بە مانە دەڵێ : " مُثُل " ( Idees ).روحی ئێمە ، پێش ئەوەی بێتە جیهانی لەشەکانەوە لە جیهانی " مُثُل " دا ژیاوە . ئەوکاتێ کە هاتە نێو لەشەوە ،رابرد ووی خۆیان بە جۆرێك لەبیر دەکەنەوە . بەڵام ئەوکاتەی کە کەوتن بەسەر چەمکە گشتی یەکان دا وەك جوانی و خراپی و چاکە ، وەبیریان هاتەوەو بە هەڵسەنگاندن ولێکدان ، شتەکانیان جیا کردەوە. هەروەها لە داد گەری و خەیرو هتد ... دا . ئەوابوو زانست بریتی یە لە وەبیرهێنانەوەی " مُثُل " ونەزانین بریتی یە لە وەبیرنەهێنانەوەی ئەو ئەزموونەکان کەرەسەی ئاگادارکردنی هۆشەکان و وەبیرهێنانەوەی ئەو شتەن کە لەپێش دا لە جیهانی " مُثُل " دا ناسیونی .

ئەو یەکەم کەسە کە دانی بە بوونی خودا داناوە و وتوویەتی ئەو خوڵقێنەری جیهان و رێنوێنی کاروباریەتی . جیهان نیشانەی جوانی و رێك وپێکی یە ، ناگونجێ کە ئاکامی هۆیە لە نەکاوەکان بێ . بەڵکوو دەسکردی مەوجودێکی هۆشمەند ، تەواو ، خەیرخوازە ،کە هەموو شتێکی لە چوارچێوەی مەبەست و بە هەدەف و ئامانجەوە ، رێك و پێك کردوە . ئەو نەیتوانی خوڵقاندن لە هیچ پەسند بکا . دەڵێ جیهان تێکەڵاوێکە لە مادە ( Matiere ) و رواڵەت (Forme) . ئەم رواڵەتیە کە مادە

---

(١) ـ تاریخ فلسفه اسلام ، نووسەر ، لاپەڕی ١٨ ـ ١٧

بە شێوەی شتی دیاریکراو دەردێنێ و مادەش شوێنی " مثل " ە ٠ ئەو شتەکان مادەیەکن بێ پەسن ( صفت ) و شێواز ، پاشان راستەقینەی هەستی بەدەس‌دێنێ ٠ پاش ئەوە لە نەبوو، بوە ٠ ( واتا ئەو پەسن و شێوازەی نەبوە ) ئەوەی لە شێواز بە مادە دەدا ، ئەی‌خاتە مەیدانی هەستی یەوە ٠ پاش ئەوەی نەبوە ( پێش ئەوەی ئەو شێوازی هەبێ و بیدا )٠ ئەویش خودایە ٠

ئەرستوو ؛ ٣٨٥ پ ز ئیدراکی هەستی بە یەکەم پلەی ناسین دادەنێ ، بە کۆبوونەوەی هێندێك ئیدراکەکانی هەستی و بەش بەش " جزئی " و مانەوەیان لە جێگای راگرتنی هەست پێ کراوەکان (ذاکرە) دا، بیر پلەی دووهەم لە ئەزموون دەست پێ دەکا ٠ ئەو ئەزموونەی کە دەس‌بەجێ لەگەڵ شتەکان ، پێوەندی و هەڵسەنگاندنی هەیەو پاشان پێوەندی یەکان و هۆیەکانی دەگا ٠ پاشان بیر دەچێتە پلەی سێیەم ٠ ئەویش پلەی " دووربینی تێڕوانینە " بۆ گەیشتن بە ئاکام وەرگرتن و بڕیاردان ( استنتاج و حکم ) ٠ بەم جۆرە ؛ ١ــ هۆی مادە ٢ــ شێواز ٣ــ کارکەری ( فاعلی ) ٤ــ ئاکامی ( غایی ) (١) ٠

ئەرستوو کتێبی زۆری نووسیوە ٠ لە زانستەکانی چەرخی خۆی دا زانا بوە ٠ نووسراوەکانی لەم بابەتانەن ؛

١ــ ئورگانوون ( Organon ) واتا ئامراز٠

٢ــ سەبارەت بە فیزیك و زانستە سروشتی یەکان و دەروونناسی ٠

٣ــ متافیزیك = پاش فیزیك ٠

٤ــ ئەخلاق ، ئابووری ، رامیاری ٠

٥ــ شێعرو هونەرە جوانەکان (٢) ٠ هەرکام لەم نووسراوانە پڕە لە زانست و بۆچوون سەبارەت بە جیهانی دەوروبەر ٠

هێندێك لە بۆچوون و شی‌کردنەوەکانی ئەرستوو ؛

---

منطق صوری ( ژیرێژی روالەتی ) ؛

---

(١) ــ قصةالایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ٤٢ــ ٣٤

(٢) ــ د ــ هومن ، پێشوو بەرگی ١١٦ــ ١١٥

بە قسەی ئەو راستی یەکی تازە ، دەکرێ لە دوو رێگاوە بدۆزرێتــەوە ، یەکەم کۆکردنەوە ( استقرأ ) کە تێکۆشانە لە شتە بەش بەشەکانەوە بۆ شتــە گشتی یەکان ٠ بە لێکۆڵینەوەی چەند نموونەکە ژمارەیان بە شێوەی پێویســت زیاد نیە ، بەڵام بە دانانی یەکێک لە تایبەتمەندی یەکانیان کە وا دێتــە بەرچاو لەودا هاوبەشن ، بە ئولەئەیەک ئەگەین ، کە ئەوە سەبارەت بە بارە بە ئەزموون نەکێشراوەکانیش بەدروست دەزانین ٠ چونکە ئەم کۆلەکە لــــەو نموونانە گشتی ترە ٠ لەوابوو ئێمە لە راستی یەکەوە دەست پێ دەکەین کــــە بناخەی هەیە و بۆ ئێمە وەک ناسینەر بنەمایە ٠ پاشان بەرەو راستی یـــەک دەچین کە لە سروشت دا ، بناخەو سەرمایە ٠ لەلایەکی ترەوە ، جــاری وا هەیە دوو راستەقینەی گشتی کە بەزاتی خۆیان ئاشکران یان گومانـــــی تێ ریێژی ناچێتە ناخیانەوە ، بەشێوەی پێویست ،شتێکی سێ یەم کە بچووکتــر لەو دووانەیە ، لە خۆیان دا جێ دەکەنەوە ٠ بەمە دەڵێن هەڵسەنگانـــدن ( قیاس ) یان بەڵگەی ئاشکرا ( برهان ) (١) ٠

لێرەدا دێرەدان بە چالاکی زانستی ئەرەستوو بە باشــی نازانــم و تەنیا شێوازی بەڵگەهێنانەوەی ژیرێژی یەکەی ئەخەمە بەرچاو ٠

پلەکانی ناسین

١ــ بەرەورووبوونی هەستەکان لەگەڵ جیهانی دەرەوەی زەین ، کــــە دەبێتە هۆی رەنگ دانەوەی وێنەکانی شتەکان لە جیهانی زەین دا ٠

٢ــ وێنە ( تصویر ) بۆ نموونە ، قەند ،پەسنەکانی ، سپی ، خــــڕ ، شیرین ، زبر ٠ بۆ کێو ، بڵند ، چڕ ، مرۆڤ ، زەوی ٠

٣ــ پەسندکردن ( تصدیق ) واتا دروست کردنی پێوەندی لەنێوان دوو شت دا ٠ وەک ، کێو بڵندە ٠ مرۆڤ بەهۆشە ٠ قەند شیرینـــە ، زەوی بەپیتە ٠ وینەکان ، بەش بەش "جزئی" ، پەسندکردن ( تصدیق ) چەمکــە گشتی یەکان ٠ ( ژیرێژی زانستی ، باسی پێوەندی دەروونی و قووڵـــــی شتەکان دەکا ) ٠ بەو پێ یە ژیرێژی رواڵەتی ( منطق صوری ) باســـــی پێوەندی رواڵەتی و دەرەوەی نێوان شتەکان دەکا ٠

---

(١) ــ د ــ هومن ، پێشوو ، بەرگی ١٧٦ــ ١٧٥ ٠

| | | |
|---|---|---|
| منطق | دیالێکتیك لە وشەدا | تصور |
| صوری | قیاس | تصدیق |
| | استقراء و تمثیل | استدلال ، حکم ، استنتاج |
| | | تمثیل |
| | | استقراء ــ قیاس ، چەند بەشی هەیە |

برهان = سەرەتاکانی تەواو روون
جدل = کەلك وەرگرتن لە باوەڕی کراوەکانی لایەنی تر .
خطابە = لە باوەڕەکانی ئایینی کەلك وەردەگیرێ .
سفسطە = سەرەتاکانی، هەڵە لەجیاتی دروست .
شعر = سەرەتاکانی لە شتە خەیاڵی یەکان دروست بوە .
مغالطە = سەرەتاکانی مرۆڤ تووشی هەڵە دەکا .

ناسین ، دوو بەشە ، یەکەم هەستی ، دووەم ژیریێتی . لەم پلانــە تێپــەردەبێ ، احساس، ادراك ، مفهوم ، استدلال ، حکم و استنتاج . کە لە مفهوم دا دوو بەشی تحلیلی ، ترکیبی دەخرێتە بەرباس . دیــــــاره هەرکام لەم چەمك و معقولانە ،لە ژیریێتی و فەلسەفەدا ، ناسێند راون کە ئێرە بۆ شی کردنەوەیان نابێ ( ۱ ) . تەنیا ئەوە دەڵێم کە ئەرەستوو ، یەکێك لــەو کەڵە پیاوانە بوە کە شوێنەواری بیروهۆشی ، بناخەی زۆرپێشکەوتنی زانستی بوە . وەك لە پاشان دەردەکەوێ ، بیری رێك و پێکی ئێستا لە ناسیـــن و تێکۆشان بۆ گۆڕینی جیهان ئاکامی تێکۆشانی دڵسۆزانەی ئەو کەڵــــــــە زانایانە بوە کە عەرەب دەڵێ " الفضل للمتقدمین " .

فەلسەفەی ئەفلاتوونی نوێ :

---

فیلسوفەکانی ئەم قوتابخانە پێیان لەسەر خودای خوڵقێنەری گەردوون دادەگرن . رەواقی یەکان لە هێزی هۆش دا سەبارەت بە جیاکردنــــەوەی

---

( ۱ ) ــ جزوەی درسی نووسەر ، دەست نووس ، بەرگی ۳۶ــ ۳۵ .

راست و نا راست. گومانیان تێدا نیه. ئیپی کوریەکان له ڕێبازی ناسین دا، له بیروڕای ئەرستوو نەترازاون ... بەکورتی تێگەیشتنی هەستی بە بێوانەی دروست داد ەنێن ئەوەی کە لەسەر ئەو بناخەیە، لە تێگەیشتنەکان دادەمەزرێ ئەویش دروستە...

ئیپی کوریش وەك دیموکریتوس پێی وایە، بناخەی هەستی گەردیلەکانە کە بەزاتی خۆیان لە جموجۆڵ دان و هۆی جموجۆڵیان لە خۆیان دایە. ئەو هۆیە سەنگینی وانە لە سەرەوە بۆ خوارێ. لەبەر ئەو سەنگینییە، جموجۆڵ دەکاو هێندێك بەملا وەولادا دەچێ، دادەکەون، لێك دەدەن و شتی تێکەلاو دروست دەکەن. تەواوی ژیان لەم تێکەلاو بوونە دروست بووە بە شێوەی نەنەکاو...

هێندێك لە فیلسوفەکان، لە هێزی هەستەکان، هۆش و هۆشمەندی لە مەیدانی ناسین دا، گوماتیان کردەوە بێیان وابۆ کە تەنیا ڕواڵەتی شتەکان شیاوی ناسینەو ناتوانین بچینە ناخی شتەکانەوە... (١).

ئەفلاتوونی یەکان؛ دوو شتیان کۆکرد وەتەوە؛ هۆش و " وحی " (٢) کە تێکەلاوێکە لە ئاینی ئەفلاتوونی و نەسرانی و فیلونی ئەسکەندەری دەست پێشخەری ئەم باسەیە. پاشان ئەفلوتین و فیلون. ئەمەیان ٢٠ سال بێش لە دایك بوونی مەسیح لە ئەسکەندەریە لەدایك بۆ لە ٥٤ی زایینی دا مرد وە. شی کردنەوەیەکی بەرفراوانی لەسەر بیروڕای ئەفلاتوون نووسیوە. ئەفلوتین لەنێوان سالەکانی ٢٠٤ ــ ٢٧٠ " ئاینی ئەفلاتوونی نوێ " ی داناوە. ئەم ڕێبازە پێی وایە، ڕواڵەتەکانی ئەم جیهانە زۆرن و هەمیشە لە حالی گۆڕان و وەرچەرخان دان، ناکرێ بۆخۆی پەیدا بووبێ. پێویستە خولقێنەرێکی هەبێ. ئەویش خودایە. ناقە لەسە، بێ هاوتایە، بێ سەرەتایە، بێ سنوورو خەتا هەتایە لەسەر پێی خۆی راوەستاوە، لە سەرەوەی مادەو روحە، تەنیا بە پەسنە سەلبیەکان دەتواند ڕێسیفەتەکانی باس بکرێ. مادە نیەو جموجۆڵیشی نیە، نە بێ جوولانەوە نە لە کات و

---

(١) ــ قصة الایمان، ندیم الجسر، پێشوو، لاپەڕی ٥٠ ــ ٤٤.

(٢) ــ جۆرە پێوەندی گرتنێکە لەلایەن خواوە لەگەڵ مرۆڤ، مێروولە، زەوی کە نیازی بە کەرەسەی ناسراو نیە. قورئان لەو بارەوە جولگیە.

مویّن دایه ، نه پەسن پالّی پێوه دەدا ، بیّ‌پایانه ، تەواوە ، نیازی بە هیچ یە ،هیچ شتێکی لیّ‌نازانین ، جگە لەوە کە هەموو شتێکی خولّقاندوە . لە سەرەوەی هەموو شتێکەو هۆش‌بە ناوەرۆکی ناگا . بیرکردنەوەی خودا لە خوّی " فەیز "ی لیّ‌پەیدا بوّە . ئەویش بریتی‌یە لە جیهان . یەکەم شتێك لە خوداوە هەلّقولّیوە " هوّش = عقل " بوّە . ئەم هوّشە خاوەنی دوو ئەرکە : بیرکردنەوە لە خوداو بیرکردنەوە لە خوّی . لە هوّشەوە " نەفسی جیهان " پەیدا بوّەو لەوپێشەوە نەفسە بەشەری‌یەکان بەوجوود هاتوون . نەفسێکی تریش دروست بوّە کە بریتی‌یە لە " سروشت " . ئەم نەفسەی جیهان لە جیهانی روحانیە ئەومندە هەیە ، ناوەندەکەی نەپەراویّزی ئەو جیهانە دایەونزیکە بە جیهانی هەست پیّ‌کراوە ، لە نیّوان جیهانی هۆش و جیهانی هەست پێکراودایە . (١)

---

(١) ـ فصقالایمان ، پێشوو ، بەرگی ٢ ، ٥٢ ـ ٥٠

وەك ئاگادارین لە دەورانی دەسەلاتی عەباسی یەکان لە بەغدای ئیسلامی دا ، وەرگێرانی ڕێبازو بابەتە جۆراوجۆرە فەلسەفی یەکان بۆسەر زمانی عەرەبی ، دەستی پێ کرد وە · لەو پێوەندیەدا زانایانی ئیسلامی ، قۆڵیان لێ هەڵ ماڵی و بۆ فێربوونی ئەو فەلسەفەیە ، تێکۆشان · هەرچەند وەرگێڕانەکە بۆسەر زمانی عەرەبی ، بێ خەوش نەبوو ، زۆر پیاوانە هاتنە مەیدان و سەرەڕای فێربوونی ئەو فەلسەفە ، خۆشیان پەرمیان پـێ داو شوێنەواری بەنرخیان بۆ بەرەکانی دا هاتوو بەجێ هێشت ·

هەرچەند لێرەدا ئێمە ناتوانین بچینە ناو ئەو دەریا بەرفرەوانەوە ، بەڵام لە چوارچێوەی ناسین دا ، هێنانی بیروڕای چەند کەس لەوانە ، بەجێ دەبێ ·

لە دەستانی فەلسەفەو فیلسوفانی بەناوبانگی ئەم بەشە دەتوانین بە کورتی ناوی : الکندی فیلسوف عەرەب ـ فارابی ـ ابن سینا ـ فخر رازی ـ غزالی ـ ابن رشد ، سهروردی ( سورە بەردی ) کورد ـ ابن مسکویە ـ ابن طفیل ، بەرین ·

الکندی ـ سەرەتای سەدەی نۆهەمی زایینی وکۆتایی سەدەی دووەمی کۆچی لە کوفە لەدایك بۆەو ٢٥٢ ی کۆچی ، کۆچی دوایی کرد وە · زانا بە زانستەکانی ئەستێرەپەرستی سائیبی یەکان بوو · لەبەسرە سەرەتای گەنجی و لاوی تێپەڕ کرد وە (١) · بابی لە باشووری دووڕگەی عەرەب دەژیا و فەرهەنگێکی بەرەوپێش چوویان هەبوو · بە زمانی یونانی و سوریانی تارادەیەك ئاشنا بوو · لە بەسرەو بەغدادا خوێند ویەتی · بە پشتیوانی عەباسی یەکان ، دەستی دایە وەرگێڕان و شی کردنەوەی کتێبە یونانی یەکان و خەریکی کاری ئەستێرەناسین و پزیشکیش دەبوو · دەکرێ بڵێین لە گشت زانستەکانی دەورانی خۆی دا بەهرەی هەبوو · لە

---

(١) ـ رسالەکانی الکندی الفلسفیة ، محمد عبد الهادی ابو ریدە ، مصر ، ١٩٥٠ ز ، ل ٧ ـ ٥

جوغرافیا ، مێژووی شارستانییەت ، پزیشکی ، فەلسەفەو کـــــــەلام دا ، نووسراوەی بەجێ هێشت • ئەو پێی وایە فەلسەفە بریتییە لە تێگەیشتن لـــە راستەقینەکانی شتە گشتییەکان (١) • ئەو دژ بە هیندێ یەکان بوو کــە دەیانگوت ، تەنیا هۆش سەرچاوەی ناسینە و پێی وابوو هەست و هـــۆش پێکەوە دەتوانن ئەم گیروگرفتە جێ بەجێ بکەن • ئەو دوای خوێندنـــەوەی بیروڕای گشت ڕێبازو ئایینەکان ، بەو قەناعەتە گەیشت کە تـــــــەواوی ئایینەکان ، جیهان بە خوڵقاوی هۆی یەکەم دەزانن • ئەویش ، تاقانـــە و بێپایان و عەرمانە • رادەگەیەنی ، هۆشی ئێمە لەوە زیاتر ناتوانێ خـــوا بناسێ و لەسەر هەر خاوەن هۆشێك پێویستە ، بڕوا بەم یەکەم هۆیـــــــە ( خودا ) بکا • (١)

فەلسەفەی بە دوو بەشی نەزەری و کردەوەیی ، دابەش کرد وە • هەروەها پێی وایە زانست دوو جۆرە ، ئاگادار بوون بە کاروباری خوداشناســــی و تێگەیشتن لە شتە دەسکرد و خوڵقێندراوەکان ، کە لەگەڵ دابەش کردنـــی نەرەستوو لە واتادا ، جیاوازییان نیە (٢) ئەو هێندێك لە چەمکـــــــە فەلسەفییەکانی ناساندوە ، هۆش = گەوهەرێکی ساکارە لە کاری تێگەیشتن لە راستەقینەی شتەکانە •

سروشت = سەرەتای جموجۆڵ لە جموجۆڵ و راوەستان و بەنەم حێـــری نەفســە •

نەفس = تەواوی بارستایی سروشتی ، خاوەن ئامرازێکە ، کە شیـــاوی ژیانە • پێەی بەرەوپێش چوونە بۆ جیسمی سروشتی ،خاوەنی ژیانە لـــــــە تواناداا ( بالقوە ) ، گەوهەری خۆتی خاوەن جموجۆڵ لەلایەن زاتەوەیـــەو مێزی جۆراوجۆری هەیە •

بارستایی = شتێکە ، لە خاوەنی سێ لایەن بێ ، درێژایی ، پانایـــی و قووڵایی •

نوێ خوڵقاندن ( ابـــداع ) و دروست کردنی شتێکە لـــــــــــە

---

(١) ــ ریسالەکان پێشوو ، لاپەڕی ٥٣ ــ ٥٢ •
(٢) ــ الکندی ، سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕی ٩ •
(٣) ــ ریسالەکان پێشوو ، لاپەڕی ٤٦ ــ ٤٥ •

نەبوون!(١) دەورانی ڕاپەڕینی زانست (ڕێنسانس) بە هۆی ئەم وردبینی‌یەوە، ئەوی وەك یەكێك لە بلیمەت و عەقڵە وتووەكانی جیهان ناساندوە (٢). لای ئەو، هۆش، خاوەنی چوار پلەیە: عقل بالفعل، عقل بالقوه، عقل بالملكه، عقل محض. عقل نظری لای ئەو ٥ جۆرە: عقل هیولانی، عقل بالفعل، عقل بالملكه، عقل فاعل و عقل مستفاد و عقل فعّال (٣).

فارابی: محەممەد كوڕی تەرخان لە ٢٦٠ی كۆچی لەدایك بووە و لە ٣٣٩ كۆچی دوایی كردوە. لە بەغدا دەرسی خوێندوە. لای یوحەنای كوڕی حەیلان شت فێر بوە. فێری ئەژمێر، هەندەسە، مۆسیقا، ئەستێرەناسین بوە. زمانی توركی، فارسی و عەرەبی زانیوە. پێی وابوو زانستی "نحو" تایبەتە بە زمانی گەلێكەوە. ژیرێژی، ئەوجی زمانی هۆشی مرۆڤە لەنێو گەلان دا. پێویستە لە وشەوە دەست پێ بكەین و بە ڕستە و هەڵسەنگاندن بگەین. ژیرێژی لە پێوەندی لەگەڵ شتەكانی دەرەوەی زەین دا ئەبێتە دوو بەش: بەشێك پێوەندی هەیە بە واتاكان و سنووری وێنەگرتنەكان و بەشێكی تری سەر ئەكێشێتە لای ڕستەكان و باوەڕ كردنەكان (تصدیقات)ەوە. دەگونجێ وێنە بچووكەكان لە واتاكانی سروشتی بن، وێ دەچێ هۆشی مرۆڤ بەمانە گەیشتبێ و نەفسی ئاگادار كردبێ. لە پێوەنددان و ڕێك و پێك كردنی ڕستەكان (قضایا) وێنە هەڵگرتنەدا، چەند (قضیه = ڕستە) دەس دەكەوێ كە لەگەڵ شتی وەك خۆیان دا كە لە هۆش دا هەن، پێوەندی‌یان هەیەو لەوەوە، هەڵسەنگاندن و بەڵگەی ڕوون ئەهێنانەوە، دەردێنێ. ئەم "قضیه" یانە لە نووسراوە ئاشكراكان و لە زانستەكان دا، پێویستن. بەڵگەی ڕوون یان (برهان) ژیرێژی ڕاستەقینەیە... گرنگترین ئامانجی "برهان" گەیشتن بە سەرچاوە و بناخەكانی زانستە پێویستەكانە. هەربۆیە وێ دەچێ هەموو ناسینێك بگرێتەوە. ئەو بەم زانستە دەڵێ "فەلسەفە". ئەو

---

(١) ـ ڕیسالەكان، پێشوو، لاپەڕی ١٦٥.

(٢) ـ تاریخ فەلسەفە لە ئیسلام دا، لاپەڕی ١٠٦.

(٣) ـ تاریخ فەلسەفە لە ئیسلام، جی. دی. بور، پێشوو، لاپەڕی ١١٣ ـ ١١١

پێی وایە " برهان " تەنیا باری ڕەوشی ناسینی نیە ، بەڵکوو دەتوانـــێ ڕێگای دروست بۆ گەیشتن بە ناسینی ڕاستەقینە ، نیشان بداو زانسـت بخولقێنێ ۰۰۰ هۆش ، چەمکە گشتی یەکان بەهۆی داڕنردن لەسەر وێنـــە بەش بەشەکان ( جزئی ) دەودەست دێنێ ۰ لە هەمان کات دا پێی وایـــە " گشتی " تایبەتی لە پێش " جزئیات " دا هەیە !

ئاکام : ۱ـ بوونی گشتی لەپێش " جزئیات " دایە ۲ـ وجـــودی گشتی ( کلی ) لەپێش ئەوان دایە ! ۳ـ گشتی پاش " جزئی " یــــە ! وجوود بریتی یە لە پێوەندی ڕێزمانی یان زیریێری ، پەمکێکی ئاوەها نیە کە لەگەڵ شتێکی " بالفعل " دا یەك بگرێتەوە ، بەجۆرێك کە بتوانین بڵێین : ئەوە وجوودە ۰ بوونی شتێك بریتی یە لە خودی شتەکە ۰ وەك فیلسوفەکانی پێش خۆی ، خوا بە هۆی یەکەم و خولقێنەری جیهان و بێ هاوتا ، تاقانــە و لەوپەڕی سنووری بەرزی دا ، دەزانێ ۰۰۰ (۱)

بە بڕوای فارابی هۆی یەکەم کە بریتی یە لە " احد "ی فلوتین و هۆشی خودایی ئەرەستوو ، خولقێنەری جیهانەو خوڵقێنەرو خوڵقاو کۆنن (خولقێنەر بەزات کۆنە ، جیهان بەکات کۆنەو بەزات نوێ نیە ) ۰ مەسەلەی خولقانـدن لای ئەو وەك ڕای ئەفلاتونیە نوێیەکانە ۰۰۰ (۲) لە قوتابخانـــــەی فەلسەفی ئەودا ، ئامرازی ناسین هۆشە ، زانست لای ئەو بریتی یە لـــە : بەدیهیات و ئامادەبوونی وێنەی شت لای هۆش ۰ ئەوەی هۆش ئەی پێکێ ، وێنەکەی بێ دەست تێ وەردانی هەستەکان ، لای هۆش ئامادە دەبـــێ ، وێنەی هەستی کە بەهۆی هەستەکانەوە ڕاگوێزراوەتە لای زەین " معقـــول اول " یان هۆش پێکی یەکەمو گشتی یە رووت کراوەکان ( کلیات مجـــرد ) هۆش پێکی دووەمن ئەفس بەهۆی هەستەکانەوە ، هەست پێ کراوەکـــان دەپێکی و وێنەی هۆش پێکەکان ، بەهۆی وێنەی هەست پێکەکانـــــەوە ، دەردێنێ ۰۰۰ هۆی بەهۆش پێکان لە مرۆڤ دا ، دەروونـــەو دەروون یان " نەفس " گەوهەرێکی رووت و جیا لە مادەیە ، چەند هێـــــزی

---

(۱) ـ جی دی بور ، تاریخ فلسفه اسلام ، پێشوو ، بەرگی ۱۲۲ ـ ۱۱۱ ۰

(۲) ـ دانەر ، تجلی افکار فارابی در سیر حکمت اسلامی ، نشریـــە دانشکده ادبیات تبریز ۱۳۵٤ ی هەتاوی ، بەرگی ۱٤۳ ـ ۱۳٦ ۰

جۆرا وجۆری هەیە کە هەرکامەیان ، ئەرکی تایبەتی خۆیان بە ئەنجام ئەگەیەن . سەرهەڵدانی هێندێك لەم هێزانە ، بە هۆی ئامرازی جەستەیی و جەستەیی ، جێبەجێ دەبێ و هێندێکیان نیازیان بەوە نیە .

عقل نظری : شتێکە کە گەوهەری دەروونی لەوەوە ، زانیاری وەردەگرێ و ئەگاتە پلەی بەرزو گەشەکردن . وەك وتمان : خاوەنی چەند پلەیە :

١ ــ عقل هیولانی یان بالقوە : تەنیا توانایە ، تا دەستی بە ئەزموون خەریك نەبوە ، تەختەیەکی سپی و ساکارە ( بە هۆی کار و کردەوە زانست پەیدا دەکا ) .

٢ ــ عقل بالفعل : لەم بارەدا بەهۆش پێکراوەکانی یەکەم بە هۆی هەستەکانەوە ، بۆلای ئەو رادەگوێزرێن .

٣ ــ عقل بالمستفاد : پاش وەدەست هێنانی بەهۆش پێکراوەکانی دووەم و جێگیربوونیان لەودا ، ئەم ناوە دەگرێ .

٤ ــ عقل فعّال : پێی وایە جبرئیلە ، هەروەك چاو بۆ دیتن بە رووناکی نیازی هەیە ، هۆشیش بۆ تێگەیشتن لە وێنەکان بە گەوهەرێکی دوور لە مادەو جیا لە باری مادە ، کە پێی دەڵێن " عقل فعّال " نیازی هەیە . ئەم پلە جۆراوجۆرانە بەشێکە لە پەسنەکانی دەروونی خاوەن بیر ( نفس ناطقە ) کە لە مادە رووت کراوەتەوە ( ١ ) ابن سینا و الکندی و فارابی لە دابەش کردنی هۆشدا بیروڕایان وەك یەك وایە ( ٢ ) .

فارابی یەکەم زانای ئیسلامی یە کە لە چوارچێوەی ژیان فەرهەنگی ئەم ئایینەدا ، پاش الکندی زانستەکانی ڕێك و پێك کردوە . بناخەی کاری ئەوان ، کاری ئەرستووبوو . کتێبی " احصاء العلوم " ی فارابی لەم بارەیەوە نووسراوە . ابن سینا ، غزالی و ابن رشد ، وەدوای فارابی کەوتوون . بێجگە لە زانستە ئیسلامی یەکان ، زانستەکانی ئەو خولەی تێدا دەژیا ، ڕێك و پێك کرد . دەکرێ بڵێین : بناخەدانەری فلسەفەی سیاسی یە . کتێبی " آراء اهل مدینة الفاضلە " و " تحصیل السعادە " و " السیاسة المدنیە " ی ئەو ، ئەم راستی یە دەردەخا و شوێنیان لەسەر

---

( ١ ) ــ د ــ حسین خلیقی سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕی ١٣٢ ــ ١٣٠

( ٢ ) ــ د ــ خلیقی ، تاریخ فلسفە اسلامی ، پێشوو ، لاپەڕی ٩٨ .

سوفەکانی دوای خۆی وەك ابن رشد ، دانا . کتێبی " الموسیقی بیر "ی ئەو نیشانەی ئۆگری ئەو بە هونەرە . دەڵێن ، خوێندنی فورشان ئاهەنگ کە ئێستا باوە ،لە شوێنەواری هونەرمەندی ئەوە . (١)

ابن سینا ، ئەبوو علی حوسێن کوڕی عبد وللای سینا لە ٣٧٠ کۆچی لە ئەفشەنەی بۆخارا لەدایك بوو . لە تەمەنی ١٧ ساڵی دا ئەمیر ی سامانی دەرمان‌کرد . بێ مامۆستا لەکتێبخانەی پاشایەتی دا، ستی بە خوێندنەوە کرد . سەربەخۆیی بیروراو بۆچوونی قوڵی رامیاری بوو . لە هەمەدان بوو بە وەزیری شەمسود ەولە . لە ئاکام دا کەوتە دیخانەی کورەکەیەوە ... لەتەمەنی ٥٧ ساڵی ( ٤٢٧ )ی کۆچی دا ،مرد.

نرخی زۆری بۆ ئەزموون دادەنا . فەلسەفەی بە سێ بەش دابەش . ، ژیریێری ، سروشت و " الهیات " . مەوجوود سێ باری هەیە ، ـ وجودی رووت لە مادە ، بابەتی پاش سروشت ( ما بعد الطبیه )یە .

١ـ وجودی مادی ، بابەتی زانستی سروشتە ، جموجۆڵ و راوەستانی ـ ەو پەسنی لەم چەشنە کە مادە هەڵیان ئەگرێ ، ئەمنە بابەتی زانستی روشت . (٢)

٢ـ وجودی زەینی ، بابەتی زانستی ژیرێژیەیە . چەندی‌یەك کە لە ـە رووت کراوەتەوە یان شتێك کە خاوەن چەندییە ، بابەتی زانستی ماتیکە ( ریاضیات ) بابەتی ژیریێری لە هێندێك لایەوە وەك بابەتی ماتیك وایە . بابەتی ماتماتیك لە رێگای رووت کردنەوەو داماڵین تجرید و انتزاع ) وە پەیدا دەبێ . بەم واتایە لێکدان ( ترکیب ) و ـەگری بابەتەکەی ، هەمیشە لە مادەوە ،وەرد ەگیرێ . لە هەمان باردا ، بەتی ژیریێری هەمیشە زەینی‌یە . وەك چەمکی ، " هویت ـ وحدت ـ

---

(١) ـ د ـ خلیفی ، تأثیر فارابی در فرهنگ و تمدن اسلامی ، بله دانشکده ادبیات و علوم انسانی ،تبریز ، ١٣٥٤ی هەتاوی ، رگی ٣٠٠ ـ ١٩٦ .

(٢) ـ ئێستا ، پەسنە گشتی‌یەکانی مادە وەك ، سەرما و گەرما و ۆراگری ... بابەتی زانستی فیزیکن . پەسنە تایبەتی‌یەکان وەك تێکەڵاوی کسین وهید رۆژن بۆ دروست بوونی ئاو ... بابەتی زانستی شیمین . جموۆڵی ئەستێرەکان بابەتی زانستی ئەستێرناسیی ... دانەر.

عموم ـ وجوب " پێویستە حەست تێبکۆشێ و بۆ زیادکردنی هێـــزی خەیاڵ کردن ( تخیل ) تا بە پلەی ناسینی هۆشی بگا . تا بەم هۆیـــەوە بە " یقین مطلق " بگەین . لە چەمکە گشتی یەکان و ژیریێتی دا وەك فارابی وایە . شتەکان لەباری مادی دا زۆر دەبن لە جیهانی هۆش دا ، زۆرنین . چەمکە گشتی یەکان لە هۆش دان و بەش بەشەکان ( جزئیات ) لە دەرەوەی زەمین دان .

جیهان خوڵقاوە . مادە راستەوخۆ لە خوا وە بەوجود نەهاتوە . جیهانی هۆشەکان ( عقول ) لە نێوان جیهانی مادەو خودا دایە . تەنیـــــا بیرکردنەوە لە وجودی پێویست ( واجب ) و ناپێویست ( ممکن ) ئێمـــە بەو پلەیە ئەگەیەنێ کە وجودێکی پێویست هەیە . . . خودا و هۆشەکـــان تەنیا ئاگایان لە شتە گشتی یەکانە . لەبەرئەوە دەروونەکانی ئاسمانەکان لـــە شتە بەش بەشەکان تێ دەگەن و هۆنیش بە هۆی ئەم هۆشانەوە . شوێن لەسەر لەش دادەنێ ، دەتوانین ئاکام وەربگرین کە خودا ئاگای لە " جزئیـات " و داتەدانەی مرۆڤە . ئەم بۆچوونە ، دەتوانێ بۆ راست بوونی " وحـــی " بەڵگە بێنێتەوە .

خوڵقاندن لە هیچ دەگونجێ . . . جەستە بە کاریگەر دانانـــــێ . کارگەر ( فاعل ) هەمیشە بریتی یە لە هێز ، وێنە یان دەروون یان هۆش بە هۆی دەروونەوە . هێزەکان لە سروشت دا زۆرن ، گرنگترین پلەکانیان لـــە بێ نرخ ترین و پەست ترینەوە بۆ بڵند ترین هێزەکانی سروشت ، هێـــزی گیایی ، گیانداری و دەروونەکانی مرۆڤ و دەروونە گشتی یەکانەوە دەســـت پێ دەکا . تەگەرەی فەلسەفەی بریتی یە لە دەروون ناسی . مرۆڤ تێکەلاً وێکـــە لە جەستەو دەروون . پێوەندی گەوهەری یان نیە . لەشی مـــــرۆڤ وەك لەشەکانی تر ، لەژێر کاریگی ئەستێرەکان و بەهۆی تێکەلاً بوونی توخمەکانەوە ، پێك دێ و لەنێو دەچێ . بەوحاڵەش گەشەکردنی ، خاوەنی باشتریـــــن تێکەلاً وی یە . بەوجود هاتنی دەروون وانیە . هەرجەستەیەك خـــاوەن دەروونێکە کە لەلایەن " عقل فعّال "ەوە پێی دراوە . هەر دەروونێك لـــە سەرەتاوە گەوهەرێکی ناگشتی یەو بەزاتی خۆی سەربەخۆیە . . .

هەستە رواڵەتی و دەروونی یەکان هێندێك زانیاری لەم جیهانـــــە ، ئەدەن بە " نفس ناطقه " جێگای هەستەکانی دەروون ، وان لە هێلەکانـــی

مێشك دا :

١ــ كۆبوونەوەی دەرك كراوی بەش بەشەكانی هەستی لە وێنەی گشتی دا وا لە پێشەوەی مێشك ، لە بەمە دەڵێن " هەستی هاوبەش " ٠

٢ــ دەست تێ وەردانی ئەم وێنانەدا بە كەڵك وەرگرتن و پشتیوانی وێنەكانی پێشوو بۆ گەیشتن بە تید راكی راستەقینە ، جێگاكەی وا لە هێلی ناوەراستی مێشك یان دەماغدا ٠

٣ــ راگرتنی وێنە دەرك كراوەكان لە پارێزگاریكەردا ، جێگاكەی ، پشتەوەی یان كۆتایی مێشكە ٠ پێش دیتن هێزێك هەیە كە دیتن بۆلای ئەو رادەگوێزێ ٠ وەك چاو پێكەوتن كەلەلای ئەو گشت هەست پێ كراوەكان كۆدەبنەوەو ئەویش دەركیان دەكا ٠ هەروەها هێزێك لەودایە كە باش دووركەوتنەوەی ئەو هەست پێ كراوەكان وێنەكانیان رادەگرێ ٠ بە كەڵك وەرگرتن لەم دوو هێزەیەكە مرۆڤ بریار دەدا كە ئەو رەنگە ئەوی تر نیەو خاوەنی ئەو رەنگە فلانە تام و چێژی هەیە ٠ گشت گیاندارەكان لە هەست پێ كراوە ( جزئی ) یەكان دا واتای " جزئی " هەست پێ نەكراو دەرك نەكەن ، كە لە ریگای هەستەكانەوە راگوێزراوە ٠ وەك ئەوە كە مەر ئەو واتا تایبەتی یەی كە لە گورگ دایە ،دەركی دەكا ولێی حاڵی دەبێ ٠ بێجگە لە ٥ هەستی روالەتی : بینایی ( بینین ) بیستن ، چێژتن ، بۆن كردن و دەست پێ كردن ، ٥ هەستی دەروونیش هەیە : هەستی هاوبەش ، وێنەگر ( صورە ) خاوەن بیر ، خاوەن گومان ، جێگای پارێزگاری ( حافظە ) ( الاشارات والتنبیهات ، بەرگی ٩٤ــ ٩٢ ) (١) ٠

هۆش دووبەشە : هۆشی كردەوەیی و هۆشی " نظری " ٠ هۆش بەرزترین پلەی هێزەكانی " نظری "یە ٠ یەك بوونی هۆش راستەوخۆ بە هۆی نەفس و دەروونی مرۆڤ یان تێگەیشتن لەزاتی خۆی لە " شعور " ی ئێمەدا ، خۆی دەنوێنێ و پلەكانی خوارەوەی دەروون لە ریگای رووت كردنەوەی هەست كردن لە پێستی مادی وپچڕاندنی وێنە گشتی یەكان لە وێنەكانی خەزێنەی خەیاڵ ( متخیلە ) ، دەپێتە سەرەوە ٠

هۆش لە سەرەتاوە خاوەنی هێزە ٠ پاشان لە ئاكامی كەڵك وەرگرتن و

---

(١) ــ د ــ خلیفی ،تاریخ فلسفە اسلامی ،بەرگی ١١٥ ــ ١١٠

بەکارهێنان ،خۆی دەگەیەنێتە " فعل " وکردەوە . بەهۆی دڕێژدانـی ڕێگای تێگەیشتن لە هەستە ڕواڵەتییەکانەوە ،بەرەو دەروون و لێ دانی نـوور لەلایەن " عقل فعّال " ەوە کە وێنەکان نیشانی هۆشی مرۆڤ دەدا ، هۆش دێتە مەیدانی کردەوە ( ١ ) . بەمجۆرە فەلسەفەی ڕێك و پێك کردەوە :

١ــ ژیربێژی ٢ــ زانستی سروشتی ٣ــ خوداناسین ٤ــ زانستی گشتی ٥ــ زانستی ئەخلاق ٦ــ ڕێك و پێك کردنی ماڵ و منداڵ ( تدبیر منزل ) ٧ــ ڕێك و پێك کردنی شار . ژیربێژی کەرەسەیە بۆ ڕاست بیر کردنەوە . زانستی سروشتی لە کاروباری تێکەڵاو لەگەڵ ماددەدا ، باس دەکا . ئەم کارانە لەسەر ماددەیەك دا نین . لەو ماددانەدا ئەو کاروبارە هەیە کە بۆ قبووڵ کردنیان ئامادە بێ .

زانستی ماتماتیك لە کاروباری تێکەڵاو لەگەڵ ماددەدا ، باس دەکا ، بەم جیاوازییە کە تایبەت بە ماددەیەکەوە نیە ( ٢ ) . بەهمەنیاری کوری مەرزبان ( ٤٥٦ ) کۆچی ،قوتابی ابن سینا . دەکرێ بڵێین لەگەڵ مامۆستاکەی ڕایان یەك دەگرێتەوە . ( ١٢٧ــ ١٢٤ ی تاریخ فلسفه اسلام ــ دانەر ) .

ابن مسکویه ، ٤٢١ ی کۆچی دا لەدایك بوە . هێزەکانی جەستەو جیسم ، زانستەکان تەنیا لە هەستەکانەوە وەردەگرن . هەستەکان تەنیا ، هەست پێ کراوەکان ، هەست پێ دەکەن . دەروون ، هۆیە یەکگرتوە دژبە یەکەکان لە هەست پێ کراوەکان دا ، دەرك دەکا . ئەویش ئەو شتەیە کە هۆش دەی پێکێ ( معقول ) کە بە جەستە ناناسێندرێ . . . دەروون خۆی لە خۆی دا هۆشمەندە ، بۆ حاڵی بوون لە خۆی جگە لەزاتی خۆی نیازی بە شتی لاوەکی نیە ( ٢ ) . ئەو پێی وایە ، جیهان خوڵقاوەو خوا لە هیچەوە خوڵقاندوویەتی . . . وەك باس کرا تا ڕیزا و سەبارەت بە بەرەوپێش چوونی ماددەی بێ گیان و گیاندارو جانەوەران ، ئەوەی کە ئەوڕۆ پێی دەڵێن گەشەکردن ( تکامل ) یان بیروڕای داروین لەو بارەوە ، باسێکی وردی

---

( ١ ) ــ ابن سینا ،النجاة، چاپی دووەم، مصر، ١٢٥٧ کوچی ، بەرگی ١٩٣ــ ١٩٢ . ( ٢ ) ــ د ــ حنین خلیفی، تاریخ فلسفه اسلامی، پێشوو بەرگی ١٢٠ــ ١٢٩ . ( ٣ ) ــ قصة الایمان، پێشوو،بەرگی ٦٣ــ ٦٢ .

کرد وەو دەتوانێ سەربەرزی ئەو دۆزینەوە بکەینە خەڵاتی ئەو، چونکە نزیکەی هەزار ساڵ پێش داروین، بەو ئاکامە گەیشتوە. (١)

ابن طفیل: لە چوارچێوەی ناسین دا، پێی وایە، مرۆڤ پێویستە لە هەست پێ کراوەکانەوە ڕێگا بپێوێ تا دەگاتە بیروڕای گشتی. هۆشی مرۆڤ بێ فێربوون و ڕێنوێنی، دەتوانێ بە بوونی خودا، پەی بەرێ و بەو وجودە بگا. ئەم تێگەیشتنەش بەهۆی تێڕوانین لە شوێنەوارەکانی خولقاوەکان بەدی دێ و مرۆڤ دەتوانێ بەڵگەی ڕاستەقینە لەسەر بوونی پەروەردگار نیشان بدا. ئەم هۆشە جاری وایە لە بەڵگە هێنانەوەدا، تووشی لاوازی دەبێ. ئەویش ئەو کاتەیە کە بیەوێ لە بێ کات بوونی بەرباڵاو (الازلیة المطلقة) یان لە نەبوونی بەرباڵاو (عدم المطلق) هەروەها لە بێ سنوور و بێ پایان، کات، شوێن، کۆن و تازە وەك ئەمانە، بیر بکاتەوە. چ کۆن و چ تازەبوونی جیهان لای هۆش هەسند بێ، لە باوەڕی بە بوونی خودادا، شتێك ناگۆڕێ. مرۆڤ بە هۆشی خۆی دەتوانێ بناخەکانی گەورەیی و سەربەرزی بناسێ و نە بناخەکانی ئەخلاقی کردەوەیی و کۆمەڵایەتی، تێ بگا و خۆی لە خراپە دوور بخاتەوە، بێ ئەوەی پێداویستییەکانی جەستە وەلا بنێ... (٢)

امام محمد غزالی: لە ٤٥٠ ی کۆچی دا لە تووس (مشهەدی ئێستا) لە دایك بوو. لە ٤٨٣ دا لە نیزامیەی بەغدا، مامۆستا بوو. لەم کاتەدا بوو لە کەوتە نێو دەریای گومانەوە. دوو کتێبی "مقاصد الفلاسفه" و "تهافة الفلاسفه"ی لە چوارچێوەی ناسین دا و ڕەخنەگرتن لە فیلسوفان، نووسی. تێکوشا بیروباوەڕی ئایینی لە کراسی هۆش دا، نیشان بدا. لە هەست پێ کراوەکان دا گومانی کرد. هۆش، ناسینی لە جیهانی هەست پێ کراوەکان، هەڵوەشاندەوە و وتی: دەکرێ لە سەروەی هۆشیش، دادگەرێك هەبێ، هێزی زانیاری و تێگەیشتنی ئەویش هەڵوەشێنێتەوە. لەگەڵ ئەمەش دا کاتێك هێرش ئەباتە سەر فیلسوفەکان، ڕادەگەیەنێ: ماتماتیك و ئەستێرناسین بەڵگەی ڕوونیان هەیە و بوو

---

(١) ــ قصة الایمان، پێشوو، بەرگی ٦٤.

(٢) ــ قصة الایمان، پێشوو، بەرگی ٧٢.

نکوولی لێ کردن نابێ • له مسەلە سروشتی یەکانیش نکوولی نەکردوە • ئەو له بەرەبەرەکانی ئەگەڵ فیلسوفەکان ، سێ مسەلەی هەڵوەشاوە راگەیاندوە :
١ـ کۆن بوونی جیهان ٢ـ ئەوەی کە فیلسوفەکان پێیان وایە خوا تەنیا لە تەنە گشتی یەکان ئاگادارەو ئاگای لە ورد و ( جزئی ) یەکان نیە •
٣ـ نکوولی کردن لە زیندووبوونەوەی جەستەو ئەو بڕوایە کە دەڵێ تەنیا رۆحەکان دەمێن و ناچن • بە هەرحاڵ ئەو بەڵگە ، ئەو بۆچوونانە رەت دەکاتەوە ( ١ ) • پێی وایە رێبوارەکانی رێگای راستەقینە چوار جۆرن :
١ـ متکلمان = کە خۆیان بە خاوەن بیروڕا دەزانن و پێیان وایە کە تەنیا بە پاڵپشت دان بە دەقە ئاینی یەکانەوە ، راستی یەکان دەدۆزرێنەوە •
٢ـ باطنیە = کە پێیان وایە لە یارەکانی فێربوون و تیدەدیەبا دەکەن کە لە ئیمامە پێ گیاچەکان ( معصومین )ەوە زانست وەردەگرن •
٣ـ صوفیە = پێیان وایە لە مرۆڤە تایبەتی یەکانی دەرگای بەرەوەرد گارن و خاوەنی دیتن و دۆزینەوەی دەروونین و بەدڵ بە زانیاری ئەگەن !
٤ـ فیلسوفان = لە خۆیان بە خاوەنی زیرێتی و بەڵگەی روون هێنانەوە دادەنێن و پێیان وایە راستی یەکان لە ژێر سێبەری بەڵگە هێنانەوەدا ، پەیدا دەکەن • ( ٢ )
غەزالی لە گشت زانستەکانی ئەوکاتدا زانیاری هەبوو • هەربۆیە بەداخەوە بیدانێکی توندی لە فەلسەفەدا و تا ماوەیەکی زۆر خۆی نەگرتەوە ! لای ئەو فیلسوفەکان سێ جۆرن :
١ـ دەهری یەکان = بەشێک لە زانایانی کۆنن کە لە بوونی خوڵقێنەری جیهان نکوولی دەکەن و پێیان وایە جیهان هەمیشەو بێ خوڵقێنەر بوە • هەمیشە گیاندار لە " نطفە " و ئەویش لە گیاندار بەوجوود هاتوەو هەرواش دەمێ و هەرواش بوە • لای غەزالی ئەمانە له

---

( ١ ) ـ مقایسه میان سان علمی غزالی و دکارت ، د ـ خنیفی ، تاران ١٣٤٧ ی هەتاوی ، بەرگی ٨ ـ ٥ •
( ٢ ) ـ دانەر ، تاریخ فلسفه اسلامی ، پێشوو ، بەرگی ١٢٣ •

ئایین بە دوورو " زندیق "ن .

٢ ــ سروشتی یەکان = ئەو حەکیم و زانایانەن لە لێکۆڵینەوەیان سەبارەت بە سروشت ( گیا ، گیاندارو جەماد ) سەیە . چونکە لە ئەنجامی سەرسوڕهێنەرەکانی سروشتیان دیوە ، چارەیان ئەوە بوە کە دان بە بوونی خودا دابنێن . بەڵام پێیان وایە هێزی خاوەن مۆشتی مرۆڤ ، پەیڕەوی مەزاجە و لەگەڵ نەمانی مەزاج دا نامێنێ . دەروون دەمرێ و ناگەڕێتەوە . ئەمانە لە بوونی رۆژی دوایی ( قیامت ) نکوولیان کرد وە . ئەمانیش بێ ئایین و " زندیق "ن .

٣ ــ خوداپەرستان = ئەمانە حەکیمەکانی ئەم دواییانەن . وەک سوقرات ، ئەفلاتوون و ئەرەستوو ، ئەرەستوو بیروباوەڕی ئەو دووکەسەو گشت حەکیمە خواناسەکانی ، هەڵوەشاندەوە ، بەڵام خۆی لە سەرچاوەی کوفریان نێری خواردەوە . لەوایە ، بەکافرناسینی ئەرەستوو و پەیڕەوانی ، لە جیهانی ئیسلام دا خەریکی فەلسەفە بوون ، وەک فارابی ، ابن سینا و وەک ئەوان ، پێویستە ! زانستەکان بەسەر مەتماتیک ، ژیریێژی ، سروشتی ، خوداناسین ، رامیاری و ئەخلاق دا دابەش دەکا . پێی وایە ئەخلاق و رامیاری لە کتێبە ئاسمانی یەکان و ئامۆژگاری پەرهێزکارانەوە گەیشتوە . لە " تهافة الفلاسفه " دا بیست مسەلەی لە باسەکانی فیلسوفان هێناوەو رەتی کردوونەتەوە . لە ٣ مسەلەدا حەکیمەکانی بە کافر داناوە :

١ ــ بێ سەرەتا بوونی جیهان ( ازلیّت عالم ) ٢ ــ نکوولی کردن لە پەسند کردنی باس و خواسی لەش و پرسیار لە لەش لە رۆژی دوایی دا . ٣ ــ نکوولی کردن لەوە کە خوا بەسەر بەش بەشەکان دا زانیاری نییە . (١)

بەسەر ئەم سێ مەسەلە بە درێژی باسی کرد وەو بە وردبینی و هۆشیاری یەکی بێ وێنەوە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕە بەرپەرەکانی کرد وە . (٢)

ناسینی خودا زگماکی یەو لە رێگای تەماشاکردنی شوێنەوارەکانی یەوە ، دەکرێ ، دان بە وجودی دا بنێن . ئەوبەم حالەش بۆ سەلماندنی خوداپەرستی بەپێی یاسای هۆگەری ( قانون سببیت ) برد وەو رای گەیاند وە :

---

(١) ــ تاریخ فلسفه اسلامی ، دانەر : بەرگی ١٣٦ ــ ١٣٣ .

(٢) ــ تهافة الفلاسفه ، بەرگی ٢٧١ ــ ٢٧٠ .

ئەو شتەی نەبوەو پاشان هاتۆتە جیهانی بوونەوە ( حادث ) بیبازی بە حۆ هەیە ٠ جیهان وایە ، لەبەرئەوە بەر بەسەکانی جیهان لە ئاڵ و گۆڕ دان ٠ زاتی خودا کەوە ئەگەر وا حەبێ ، بە خولقێنەر بیاز پەیدا دەکا و هەروەها ئەو بە یەکێکی تر ٠ ٠ ٠ بێ سەرەتایە ، سەرەتاو دوایە ، روانەـ و دەروونە ٠ گەوهەر ، خاوەن شوێن ، جەستەی تێکەڵاو ٠ ٠ ٠ نیە ٠ ( ١ )

بەهەرحاڵ ئەویش وەک کانت ، سەرئەنجام بای دایەوە سەر خـوێش و بڕیارەکانی پەسند کرد ٠ ( ١ )

سەبارەت بە جیهان و خولقێنەر رای یەکەم وەک فارابی و ابن سینا بیر دەکاتەوە ٠ دەڵێ : ئەو یەکەم خولقێنەر راوە ، حۆنە : کە خوا بە فەرمانی خۆی خڕنقاند وویەتی ٠ حۆش لەپێش مادە دایەو کاتیش پاش فەرمانە ٠ پاتر حۆش ، دەروون هاتۆتە بەزاتی ئەک بە کات و شوێن و مادە ، لە پاش هۆنە ٠ ٠ ٠ ئەو وجوودی راستەقینەی ئەم جیهانە رەت دەکاتەوە ! چونکە پێی وایە بێجگە لە خودا هیچ شتێک لە ئارادا نیە ٠ هەموو شتێک لە حاڵی نەبوون دایە ، مەگەر زاتی خودا ٠ بێجگە ئەو هەموو شتێک لە بێ سەرەتاوە تا حەتا هەتاو هەرمان ( ابد ) لە حاڵی نەبوون و تێک چوون دایە ٠

هەرشتێک بێ لەبەرچاو گرتنی خودا ، زاتی خۆی لەبەرچاو بگـرێ ، هیچە ٠ ئەوکات کە خۆی لەگەڵ زاتی خودا ، تەماشا بکا ، ئەوجار هەیە ٠ بەڵام بوونەکەی بەزاتی خۆی نیە ٠ بەڵکو لەبەر ئەوە نیشتی وجوودی ئەو خولقێنەرەیە ، هەیە ٠ ( ٣ )

شێوەی پەیدابوونی جیهان لای ئەو وەک ئەوەیە کە ئەندازیارێک نەخشەی خانوویەک دەکێشی لە پاشان بە پێی ئەو نەخشەیە جێی هەستی لەبەر دەکا ٠ خولقێنەر نەخشەی سەرەتاو دوایی جیهانی کێشا و بەو پێیە جێی هەستی لەبەر کرد ٠ لای ئەو مرۆڤ تێکەڵاوێکە لە دەروون و جەستە کە ئەمیان دەبێ و دەڕوا ، دەروون گەوهەرێکی ساکار ، روونا ، نێنەیشتوو ، دارکەر ، دندەرو ئەوا وکەری ئامرازەکانی جەستەیە ٠ ٠ ٠ مرۆڤ نموونـەی

---

( ١ ) ــ تاریخ فلسفه الاسلامی ، دانەر ، لاپەڕی ١٤١

( ٢ ) ــ فصة الایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ٧٩ ــ ٧٢

( ٣ ) ــ غزالی ، مشکاة الانوار ، بەرگی ١٢٢ ــ ١٢١

کورت و پوختی جیهانه • هەر مرۆڤێک ــ یەن مرۆڤێکی دیکەوە خوڵقاوە تا بە باوە گەورە ( آدم ) دەگاو ئەم زنجیرە رادەوەستێ ••• ( ١ )

ابن رشد ، ابوالولید محمد ، لە ٥٢٠ ی کۆچی ( ١١٢٦ز ) لە قورتوبە ئەندەلوسی ئیسپانیا لەدایک بوو • لە بنەماڵەی زانست و زانیاریدا گەشەی کرد • پروفیسور رینان دەڵێ : فیلسوفەکانی فەرانسەو ئالمان، ماوەیەکی زۆر لە سەرکردنەوەو تێکۆشانەکانی خۆیان دا ، لە رەوتی ئەو پەیرەوییان دەکرد و لە هێندێک لە مەسەلە زانستییەکان دا خۆیان بەوەوە ، پێوەندی دەدا • ( ١ ) پاش هێرشی غەزالی بۆسەر ئەلسەفە ، بە تێکوشانی ئەم ، فەلسەفە گەیشتە ئەو پلە کە خەریک بوو پیرەوپرواى مەزهەبی، بە فراوانی ، بلەرزێنێ • هەربۆیە رێبەرانی ئایینی ، خوێندنی " زیرێستی و فەلسەفە "یان ، حەرام کرد ! بەو جۆرە گێرەگرفتێکی فراوانیان لە رێگای تێکۆلینەوەی ابن رشد دا ، ساز کرد !

ماوەیەک ئاوری چۆڵی پزیشکی دایەوەو دوو کتێبی لەو زانست و هونەرەدا نووسی : " الکلیات " و " التیسیر " ئەم دوو کتێبەدا ، ئەندامەکانی لەشی ، شی کردەوەو رێگای دەرمانی هەرکامێیان دەستیشان کرد • لەو حالەشدا ، لە بزوکردنەوەی فەلسەفەو بیروباوەری خۆی بە رانستی ، دەستی هەڵنەگرت ، لە تاکامی تێکۆشانی ملا کەمپەرستەکانەوە " المنصور" خەلیفەی عەباسی فەرمانی دەرکرد یەک هەزار جلد کتێبی فەلسەفەیان سووتاند ! ( ٣ )

یەک کتێبی ئەفلاتون ، ١٨ کتێبی ئەرەستوو ، ٣ کتێبی ئەسکەندەری ئەفرودیسی ، یەک کتێبی بەتلەمیوس ٦ی جالینوس ، ٢ی فارابی ، ٣ ی ابن سینا ، ١ی غەزالی و ١ی ابن باجەی ، شی کردەوە • بێجگە لەو بەسەی کە ون بۆەیان لەوتوونا کراوە ٤٦ کتێبی لە : فقەو کلام ، فتاوی، منطق و جدل فسفی ، دەروونناسی ، لەشساغی و پزیشکی ، نووسیوە • زۆربەی کتێبەکانی بە زمانی لاتین وەرگێردراونەوە • سەبارەت بە ناسینی

---

( ١ ) ــ دانەر ، تاریخ فلسفة اسلامی ، لاپەری ١٤٤ ــ ١٤٣

( ٢ ) ــ عباس محمود العقاد ،ابن رشد ، چاپی مصر، بەرگی ٥

( ٣ ) ــ ابن رشد ،الکلیات : بەاهتمام فرید بستانی ، بیروت ، ل ٨

جیهان پێی وایە : جیهان بێ سەرەتایە · باوەتادەم بەو شێوە نە کتێبە ئاینی یەکان دا هاتوە راست نیە · تەواوی مرۆف یەك هۆشیان هەیە ، لەدواڕۆژدا جەستەکان لێیان ناپرسنەوە · خودا ئاگای لە " جزئیات " نیەو تەنیا لە " کلیات " ئاگادارە · ( ١ )

جیهان شێوازی خڕەو جموجۆلی بە دەوری خۆی دا هەیە · بارستایی یە ئاسمانی یەکان ، ئەم جموجۆلەیان هەیە · ئەمانە هۆی پێك هاتنی شێوازی خڕن · جیهان یەکێکەو خاوەنی سیزامێکی گشتی یە · جموجۆلی دەورەیی ، نە سەرەتای ، هەیەو نە کۆتایی و ئەو جەستانەی کە جموجۆلی وایان هەیە ، خراپ نابن · جیهان تێکەلاوێکە لە پێنج جەستە : ١ــ نە سووکە و نە قورس ( ئاسمانی ) ٢ــ لە بەرت دا قورسە ( زەوی کە پێکەی جیسمی خڕە ) ٣ ــ ئاگرکە سووکە ( وا لە رووی ئاسمانی خڕ ) دا ٤ــ پاش زەوی ( ئاو نە بەرامبەر هەوادا قورسەو لە بەرامبەر زەوی دا سووکە ) ٥ــ هەوا ( پاش ئاو لە بەرامبەری ئاودا سووکەو لە بەرامبەری ئاگردا قورسە ) · زەوی بۆیە قورسە چونکە لە جموجۆلی دەورانی زۆر دوورە : هەر بۆیە ناوەندی سابێتە · ئاگر بۆیە سووکە چونکە ئەو جموجۆلەوە زۆر نزیکە · ئەگەر جیسم خڕ نەبایە سووک و قورس و سەرو خواری نەدەبوو ، جیهان بەباری خڕ بوونی دا ، کۆتایی پێ دێ · چونکە رووبەرێکی خڕ زاڵە بەسەری دا · ئەو جیسمانەی راست راکێشراون بەزاتی خۆیان ، کۆتاییان پێ دێ : چونکە لەوان دا کەمبوون و زیاد بوون دەگونجێ · ئەو بارستایی یەی کە بەسەر جیهان دا زاڵەو جیهانی داگرتوە ، شێوازی وەك تۆپ وایە : بەهۆی جموجۆلی جۆراوجۆری ئەمانەوە ، ئەم شتانەی ناتەبای جیهان ، دروست دەبن · ئەو چوار لەنەی باسمان کرد : لەبەر ئەوە خاوەنی ئەو جموجۆلەن ، دەبن و نەمێنەوە دەچن · ئەگەر بێتێت لەم جموجۆلە راوەستێ ، ئەم سیزامە بەگشتی خراپ دەبێ ، چونکە سیستەمێکی ئاوەها ، پێویستە پەیڕەوی لە ژمارەیەکی دیاری کراو لەم جموجۆلە بێ · ئەگەر تۆخمەکان بە تێکەلاوی یەکی حەلسەنگێند راو و باش و رێك و پێك تر لە تێکەلاوی کانگا ژێرزەوی یەکان " معادن " خۆیان بنوێنن " گیا " و ئەگەر

---

( ١ ) ــ د ــ خلیقی ، تاریخ فلسفة اسلامی ، لاپەری ١٩٨ ــ ١٩٣

زیاتر بوو، " گیاندار " وئەگەر بەکەمەکردنی تەواو بکا ، " مــروّف " دروست دەبێ ۰۰۰ بیروڕای سەبارەت بە خولقێنەرو مادە بارستایی یەکان لە ئاسمان دا وەك ئەرەستوو وایە ۰ خولقێنەر بریتی یە لە جموجوڵ پیــــان دەنەدەر ۰ ( ۱ )

سەبارەت بە فێربوون و فێرکردن دەڵێ : پێویستە تێبکۆشین تا گشت ئەفرادی کۆمەڵ فێری فەرهەنگ و ئەدەب بن و لە زانستەکان ئاگادار بــن ۰ هەروەها پێویستە لە گشت ئامرازی فێرکردن و پەروەردەکردن کەڵــــك وەربگرین ، تا بەم هۆیە : بەختەوەری خەڵك دەستەبەر بکرێ ۰ سروشتی یــە خەڵکی پەروەردەکراو و خاوەن فەرهەنگ و هونەر ۰ بە کەڵك وەرگرتن لــــە دەستکەوتەکانی خۆیان ، باشتر دەتوانن لە خزمەتکردن و دروســـت کردن و یاریدەدان بە ئەندامەکانی کۆمەڵی خۆیان چالاك بن و کەڵکــــی تەواویان هەبێ و شوێنی باش دابنێن و لەم خەباتەدا ئەرکی گرنــــگ وەئەستۆ بگرن ۰ ئەو ، کەسێك بە بەختەوەر دەزانێ کە ئەندامانی زانــــا و خاوەن ئەزموون ، فراوانــی هەبێ ۰ ئەو پێی وایە ، دەبێ بۆ ئایین و ڕێبازە جۆراوجۆرەکان ، ڕێز دابندرێ ۰ پێویستە حورمەت بۆ بیروباوەڕی هــــەر ئایین و هەر خاوەن ئایینێك ، دابندرێ ۰ ( ۲ )

مرۆڤ گیان لەبەرێکی کۆمەڵایەتی یە کە بەختەوەری لە گرەوی هاریکــاری دایە ، پلەی بەرزی لە بەرزبوونەوەی پلەی هۆشی دایە ۰ بۆ شێــــــوەی دەسەڵات نیزامی کۆماری باشترینە ۰ ئەرکی ئایین ئەوەیە ، خەڵك فێـــری خەسلەتی ئەدەوەمی بکا ۰ و ئەرکی فەلسەفە ئەوەیە خەڵك فێری خەسڵەتــــە بەرزە بیروبۆچوونەکان ، بکا ۰ ( ۳ ) پێی وایە ژن و پیاو دەبێ مافــــــی وەك یەکیان هەبێ ، چونکە لەباری سروشت و هێزەوە وەك یەکن ، جیاوازی

---

( ۱ ) ـ د ـ خلیقی ،آفرینش و نظر فیلسوفان اسلامی در رسالهٔ آن ، تبریز ١٣٥٤ ی هەتاوی بەشی ٥ فصلی ۳ ۰

( ۲ ) ـ دانەر ، تاریخ فلسفهٔ اسلامی ، پێشوو ، لاپـــەڕی ٢٢٥ ۰ هەروەها بۆ ئاگاداربوون لە بیروڕای ئەو بڕوانە : قصة الایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ۹۷ ـ ۹۲ ۰

( ۳ ) ـ دانەر ،تاریخ فلسفهٔ اسلامی ،پێشوو ، لاپەڕی ٢٢٤ ۰

لە توندی و لاوازی دایە. کۆمەڵگای ئیسلامی کاتێك بەرەو پێش ئەچێ کە زنجیر لە باڵەکانی تن بکاتەوە و ئەو گرێ و گۆڵانەی کە بەمپەری ئازادین، هەڵیان گرێ. بارودۆخی کۆمەڵایەتی، رێگا نادا لە هەموو بارێکەوە ستێسك بلێین. بەروانامەت ژن بۆ منداڵ بوون خوڵقاوە! ئەو بارودۆخەی کە ئێمە بۆ ژنان دروستمان کردوە؛ ئێمەی لە زۆر چاکەو خێر بێبەش کردوەو پێشی بە گەشەکردنی هۆشی ژنانیش گرتوە. هەربۆیە لەنێو ژنان دا مرۆڤی زاناو بلیمەت کەمە! ژنانیان وەك ژیانی گیا، کۆتایی بێدێ، هەمیشە باری سەرشانی پیاوانن. ئەمەش هۆی رۆژرەشی و بەماتی ئەوانە. دروشمی بەرامبەری و وەك یەك بوون هەیە؛ بەڵام چونکە پیاو خەرجی ژنانیان دابین دەکا؛ دیلن.

ابن رشد لە ئیسپانیا دەژیا و شۆڕشی دەروونی ئەوکات بۆ مافی ژن و یەکسانی ئەوان لەگەڵ پیاو، دەستی پێکرد بوو، و ئەویش وەك رێبەری ئەم جموجۆڵە بوو. (١)

ئەو کێشەی لە نێوان غەزالی و ابن رشد دا پێك هات، تا ئێستا مێژووی فەلسەفە لەو شێوە دا رشتەی باسە زانستی یەکان و شی-کردنەوەیانی؛ وەبیرنایە. دەتوانین بڵێین ئەم باسە بوو بە بەردی بناغەی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی نهێنی یەکانی سروشت و گەشەکردنی زانست.

ئیمام فخر رازی؛ پێی وایە هۆش لە هێندێك لە جیهانە زیندووەکان دا هەیە. بوونی هۆش لەوانەدا و هێز لەسەر چەسپاندنی خوڵقاندن، بەڵگەیە لەسەر بوونی پەروەردگار کە هەموو شتێکی بە باشی خوڵقاندوە. (٢) ناوبراو لە دابەش کردنی بەشەکانی یەك بابەت دا و رێك و پێك کردنی نووسراوەکانی و لابردنی شێوازی کۆن، لەم وێنەیە "تفسیر کبیر" و "مباحث المشرقیه" ی، نموونەن.

سهروردی؛ شەهابەددین یەحیا کوڕی حەبەش، کوڕی ئەمیرەك لە ٥٤٩ لە گوندی "سوورەبەرد"ی دەوروبەری بیجاری کوردستانی ئێران

---

(١) ـ دانەر، تاریخ فلسفة اسلام، پێشوو، لاپەڕی ٢٢٥.

(٢) ـ قصة الایمان، پێشوو، لاپەڕی ٥٨.

ئێستا بەشێکە لە بەشەکانی شاری زەنجانی ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات، لە
ایك بوو • لە مەراغەو ئەسفەهان خوێند بێەتی و لەگەڵ ئیمام فەخری رازی
اوقوتابی بوە • لە "حەلەب" ی سوریە لای زاهیرشای کـــــــوڕی
ملا حەد دین ئەیوبی کورد • گیرسایەوەو بەهۆی ئەوەوە کە شتی نوێی باس
ەکرد ، کەوتە بەر ڕق و تووڕەیی مەلا کۆنەپەرستەکانەوە ، سەلا حەد دینیان
ر کوشتنی دنەدا • ئەویش فتوای کوشتنی داو لە تەمەنی ٣٨ ساڵی دا ،
، شێوەیەکی نادیاری کوژرا • لەو کەسانەیە کە هێزێکی برد وەتە ســــەر
لسەفەی یونان و بە کەڵك وەرگرتن لە فەلسەفەی کۆنی ئێرانی وخوێند نەوەی
تێبی " مشکوة الانوار " ی غەزالی و بەرهەمەکانی زکریا رازی ، ڕێبازێکــی
نێی بەناوی " فەلسەفەی ئیشراق " د روست کرد • هێرشی برد ە ســــەر
منطق صوری " ئەرەستوو • باسی " جنس و فصل "ی ئەرەستووی بـــۆ
ساندنی شتەکان رەت کردەوەو وتی لە ناساندن دا ، پێویستە گشـت
ەسنە زاتی یەکانی ئەو شتەی دەکەوێتە بەرباس ، بێنە کایەوە • ئەو پێی وایـە
ەو کەسانەی فەلسەفەکەی دەخوێننەوە ، پێویستە لە پێش دا لە فەلسـەفـەو
ڕێبازی ئەرەستوویی و مەنطیق و عیرفان ، ئاگادار بن و پەرهێزگاریش بن ،
ا بتوانن بەسەر " ذوق " یان هەستی دەروونی دا زاڵ بن و بینـــە
دا وەنیان • زەوق بریتی یە لە تێگەیشتنێکی نائاشناو نهێنی ( مرموز ) کــە
دەتوانێ بچێتە ناخی شتەکانەوەو بیان ناسێ و بە ڕوحی ئەحەواوە ، دیتن و
بوانی و ڕێك و پێکی پێشکەش دەکا و بەسەر " چاوشرکی " دا زاڵ ئەبێ •
بناخەی فەلسەفەی ئیشراقی لەسەر دوو کۆڵەکەیە • بەڵگە هێنانـــەوە و
" ذوق " • دەی هەوێ لە نێوان جیهانی بەڵگەهێنانەوەو ئیشـــــراق
( تیشك دانەوە ) یان بیرکردنەوەی خۆش و پێگەیشتنی دەروونـــــی دا
پێوەندی د روست بکا • لەراستی دا ، بنکەیەکە لەنێوان ، سۆفیگـــــەری
ێ خەوش و فەلسەفەو ئەلامی فارسی دا • لە چوارچێوەی بیروبـــاوەڕی دا
ەفلاتوون ، زەردەشت ، زانایان و حەکیمە ئێرانی یەکان و ئەوانەی پێـش
سوقرات ، دەبینەرێن " مُثُل " ی ئەفلاتوونی ، فریشتە مەزدایەکان ، بـە
شێوەی راستەقینەیەکی تاقانە ، خۆیان نواندوەو یەکبوونی " ڕووناکی " کــە
ای ئەو " وجود "ە ، بەسەر فراوانی موسولەکانی ئەفلاتوونی ود ووپەرستـی
روانەتی مەزدایی ( اهریمن و یزدان ) دا فەرمانڕەوایی دەکا •

ئەخشەی فەلسەفەکەی بریتی یە لە بەرێکردنی جیهانی ناموّی مادە ، بەرەو رۆژهەلاتی ولاتی " وجود " ، کە خۆی پێی دەلێ ؛ " جیهانی ئیشراقی یان مشرق " ، لەودا پەیامێکی نهێنی هەیە لە بۆلێ حالی بوونی پێویستە سەرلەنوێ لەدایك بین ، تا مرۆڤ نەتوانێ بۆ دەروونی خۆی بچێ و تا نەبێتە رێبواری ئەو رێگایە ،ناتوانی لە واتای پەیامی رۆژهەلاتی جیهانی وجود ( حكمت اشراق ) ئاگادار بێ ، خۆناسین کلیلی دەرگای ئەم فەلسەفەیە ، زانستی دەروونی ئەو ، بریتی یە لە تەماشاکردنی دەروون و دەستەمۆکردنی دێوی دەروون ، پەیرەوی لە کۆنەکانی ئەخلاق ، یەکێك لەو رێگایانەی گەیشتن بە زانستی دەروونە ، دەروونناسی یەکەی پێوەندی تەواوی هەیە بە ناسینی روحی مرۆڤ و گرنگی جیهانی فریشتە بوون لە جیهانی خوارەوە ، داین نان بە بیروڕای ئەفلاتوون سەبارەت بە جیهانی " مُثُل " و پێوەندی لەگەل فریشتە ناسینی ئایینی مەزدایی دا ، هەروەها شیکردنەوەی لە روانگەی "کلمه"ی فیلونیەوە ، یەکێك لە کۆنەکانی فەلسەفەی ئیشراقە ... (١) ٤٦ کتێبی لە زانستەکانی ئیسلامی و فەلسەفەدا بە زمانی عەرەبی و فارسی نووسیوە ، بناخەکانی ئەم فەلسەفەیە لە سێ لق دا کورت کراوەتەوە ؛ ١ـ بوون ناسین ٢ـ جیهان ناسین ٣ـ دەروونناسی .

لە لقی یەکەم دا پێی وایە بناخەی وجود بریتی یە لە " نور قاهر " هیچ شتێك دیتی تر لە نوور نیە ، نوور سەرڕێژ دەکا ، لەسەر پێی خۆی راوەستاوە ، خۆی هۆی خۆیەتی و بێجگە لەو ، وانیەو لە راوەستان دا و دەرێژەدان بەوەدا ، نیازی بە بێجگە خۆی هەیە (٢) لێرەدا دژبە پەیرەوانی ئایینی "مانی" لە پێیان وایە " نور و ظلمت = روناکی ، تاریکی " دوو بوونی راستەقینەو جیاوازو خولقاوی دوو هۆشمەندن : راوەستاوەو دەلێ ؛ تاریکی شتێك نیە تا سەرچاوەی هەبێ ، بە بڕوای زەردەشت لە " یەك " هەر یەك شت دەخولقێ ،هەربۆیە بۆ روناکی تاریکی دوو سەرچاوەی خولقێنەریان داناوە ، بوونی یەك لە یەك

---

( ١ ) ـ دانەر، سهروردی وحکمت اشراق، تبریز، ١٣٥٥ ،ل ٦ ـ ١

( ٢ ) ـ سهروردی، حکمة الاشراق، چاپی تاران ،بەرگی ١٠٧ ـ ١٠٦

وپووی فیلسوفەکانی ئیسلامیشە . ( ١ )
زاتی نوور ئەویندا ری تیشک دانەوەیەو ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوە کە بە
هەموو شتێك عەشقی ژیان ببەخشێ . نوور خاوەن چەند پلەیە ، لە سەرەوە
ۆ خوار . هۆشە دەدانیەکانی ڕێبازی " مثأ " ی ڕەت کردەوەو وتی
یهان بە هەموو ڕوالەتەکانییەوە ، تیشک دانەوەیەکی بچووك لە زاتی خوای
ێ هەرمانە . مرۆڤ تەنیا توانای ناسینی دوو نووری هەیە :
١ ــ ڕوناکییەك لە هۆشی گشتی و ڕووت لە مادەو هۆشی بەش بەش ،
ەگرێتە بەرو ناوی " نور مجرد " ەو خولقێندراو نیە . ڕوناکییەکانی تر
ەوژێر ، خولقێندراوی ئەون . دەروون بۆخۆی تیشك دانەوەیەکە لە " نور
عر " ڕوناکی ڕووت بۆ ناسینی خۆی ، تەنیا پەنا بە خۆی دەباو لە بێجگە
خۆی ، بێ نیازە . لەوابوو خۆی لە خۆی دا خودی زانینە .
٢ ــ ڕووناکی " عرضی " ئەمەیان وێنەی هەیەو دەتوانێ بە کەسێکی ترەوە
ەندی هەبێ . ڕوناکی ئەم جیهانە لەم بابەتەن . ئەمیش تیشکی
نور قاهر " ە . . . . ( ٢ )
لە جیهان ناسینی دا ، پێی وایە تاریکی چەندییان مادەیە . مادە
ێکە لە سەلماندنی ڕوناکی . مادەی یەریلاو کە لەباری بێ خەوشییەوە ،
ەند پلەی هەیە ، خۆی دەبێتە هۆی پەیدابوونی مەیدانە جوراوجورەکانی
ستی . زەمیەی بنەرەتی هەموو شتەکان لە دوو بەشەوە ، دروست
وە :
١ ــ ئەوەی لە بێ ئەملا و ئەولا لە شوێن دایە ، وەك تام و بۆن کە
دەڵێن " تاریکی " .
٢ ــ ئەوەی دەگونجێ هەبێ ، وەك ئەو بەشەی لە دابەش ناکری
جزء لا یتجزی ) یان ناوەرۆکە لێڵەکان . ئەشعەرییەکان پێیان وایە ،
هۆی بە یەك گەیشتنی ئەم دووانە " مادە مطلق " لە جیهان دا ، خۆی
نوێنێ . تێدەلاوەکانی گەوهەرو وێنەکانی تاریکی کە بە هۆی نووری
ێتەوە شیاوی دیتنن ، بە شێوازی جەستەکان خۆیان دەنوێنن . ڕوناکی

---

( ١ ) ــ الاشارات والتنبیهات ، ابن سینا ، چاپی تاران ، ل ١١٦
( ٢ ) ــ دانەر ، سهروردی وحکمت اشراق ، پێشوو ، بەرگی ١١ ــ ١٠

رووت ( نور مجرد ) به تیشك دانەوەكانی هەمیشەیی خۆی ، شتە زۆرەكانی مەیدانی هەستی بە وجوود دێنێ . جیاوازی وێنەكانی جیسمەكان هۆی جیاوازی ئەوانە لە یەكتر ... تەواوی رووناكی و جیسمەكان و سەرانسەری هەستی ، پێوەندییان بە " نور قاهر " ەوە هەیە . (١)

رووناكی یە نیزیكەكان بەو نوورەوە ، راستەوخۆ لەو ، رووناكی وەردەگرن ، ناوچی یەكان ، بەسەر گۆڕانەكانی هەستیدا زاڵن . ئەمانە یان بەتەنێ یان بە پشتیوانی رووناكی زانا ، هەستی بە مەوجووداتی جۆراوجۆر دەبەخشن . توخمەكان بێ پشتیوانی رووناكی زانا ، بەهۆی رووناكی یە ناوچی یەكانەوە لەدایك دەبن . گیاندار ، گیا و مرۆڤ ، بە هۆی ناوچی یەكان بەڵام بە پشتیوانی رووناكی زانا ، بەوجوود دێن . سەرەنجام تەواوی جیهان ، سێبەری " نور قاهر " ە . پلەكان بەمجۆرەن :

١ـ گۆڕانی " نور قاهر " ٢ـ ناوچەی زێڕد سەلاتی هۆشەكان ٣ـ ناوچەی دەروونەكان ٤ـ ناوچەی شێوازو وێنەكان ، كە ئەمیان دوو بەشە : ١ـ ناوچەی شێوازە میسالی یەكان ( ناوچەی ئاسمانەكان ) ٢ـ ناوچەی شێوازە مادی یەكان ( ناوچەی توخمەكان ) توخمەكانیش دوو بەشن :

١ـ توخمە ساكارەكان كە بریتین لە جیهانە ویشكەكان ( جماد ) گیاكان و گیانداران .

٢ـ توخمە تێكەڵاوەكان كە بریتی یە لەم جیهانە . نوورەكانیش دوو بەشن : ١ـ ئەوانەی كۆن . وەك هۆش وروحەكان ، ئاسمانەكان ، توخمە ساكارەكان ،كات و شوێن ٢ـ ئەمانەی كە پاش ئەوە نین ، دەبن . وەك ئەو شتانەی كە تێكەڵاوێن لە توخمەكان ... توخمە سەرەتایی یەكانی هەستی بریتین لە : ئاو ، باو خاك ، ئاو ، لێرەدا سەربەخۆنیە . (٢)

جیهان خوڵقێندراوی " نور قاهر " ە . تیشكی ئەوە . چونكە سەرانسەری سنوور و سەراوەردی هەستی ، تیشكی ، ئەم سەرچاوەن ،

---

(١)ـ سهروردی ، حكمة الاشراق، تاران ،لاپەڕی ١٢٢ـ ١٢١

(٢)ـ د ـ حسین خلیفی ، سهروردی و حكمت اشراق ، پیشوو ، بەرگی ١٤ـ ١٣

ئەوابوو جیهانی کۆنە ۰ ( ۱ )

دەروون یان " نفس " ی مرۆڤ بریتی یە لە هەڵمێکی گەرم و روونـــاك و بێ خەوش کە لە کونی لای چەپی دڵدایە ۰ بەڵام لە گشت بەشەکانی لەشدا دەگەڕێ ۰ ( ۲ )

هەستە رواڵەتی و دەروونی یەکان خوڵقێنەرای روناکین و هێزەکانـــی تاریکیش بەش بەحاڵی خۆیان چەند هێزێك وەك هێزی وردکردنـــــــی خواردەمەنی ( هضم ) و هێزی بەرەوپێش چوون و هەڵچوون ، بە وجـــود دێنن ۰ یەك هێز دەتوانێ هۆی چەند کردەوە بێ و لە هێشك دا ، تاقـــە هێزێك هەیە ۰ لەبەرئەوە سەرچاوەی چەند شوێنەوار و کارێکی جۆراوجـۆرە ، ناوە جۆراوجۆرەکان ، پێوەندی یان بە شوێنەوارەکانەوە هەیە ۰

زەمین لای ئەو یەك شتە ۰ هێزی دەروونی تیشك لەو روناکی یـــــــــە روتەی کە ناوەرۆکی مرۆڤە ، جیاوازە ۰ گشت هێزەکانی زەمین بە شێوەیەکـــی نهێنی و رەمزی ، لەگەڵ دەروون ، پێوەندی یان هەیە ۰

سەبارەت بە دیتن پێی وایە ، ئەوکاتە کە چاوی ئێمە دیاردەیـــــــەك ئەبینێ ، نوور یا تیشکێك لە چاوەوە هەڵناستێ ۰۰۰ روناکی و تیشـــــك ـــ دانەوەیەك پەیدا دەبێ و بە زەمین یاریدە دەدا تا شتەکە ببینـــــــێ ۰ پەیرەوانی فەلسەفەی "مشا" یی یان وایە وێنەی شتەکان لە چاودا ، نەقـــش دەبەستێ ۰ سهروردی چوار مەرجی بۆ دیتن داناوە ، ۱ ــ سلامەتی چـــاو ۲ ــ نەبوونی پەردە لەنێوان چاو و شتە دیتراوەکەدا ۳ ــ بەرەورووبوونی چـــاو لەگەڵ شتەکەدا ٤ ــ ئامادەبوونی زەمین بۆ تێگەیشتن ۰۰۰ پێی وایـــــــــە جیهانی خەیاڵیش بۆ وێنەگرتن و راگرتنی وێنەکانی جیهانی دەرەوەی زەمین ، نیازی بە تیشك دانەوە هەیە ۰ ( ۳ ) ۱۳ ریسالەی بە زمانی فارســـی و ۵ کتێبی بە عەرەبی نووسیوە کە دانەری ئەم کتێبە یەکێك لەوانی بە نـــــاوی " اعتقاد الحکما " لە زمانی عەرەبی یەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارســـی و چاپ کراوە ۰

---

( ۱ ) ــ شهروردی ، حکمة الاشراق ، لاپەڕی ۱۷۲

( ۲ ) ــ حکمة الاشراق ، لاپەڕی ۲۰٦

( ۳ ) ــ دانەر ، سهروردی و حکمت اشراق ، پێشوو ، لاپەڕی ۱۹ ــ ۱۸

ئێستا بۆئەوەی ( هەرچەند بەکورتی و نە بەگشتی ) بتوانیـن وەد وای پێ وشوێنی تێگۆشەرانی مەیدانی زانست و خاوەن بیروڕاکان ، سەبارەت بە جیهان و دیاردەکانی و پێوەندی یە دەروونی یەکانی دیاردەکانی جیهان ، بکەوین ، پێویستە پەنجە بۆلای بیروبۆچوونی چەند فیلسۆفی رۆژئـــاواش رابکێشین • پاش ئەوە دەچینە سەر سفرەی ئامادەو رازاوەی ، ئاخرو ئۆخری خولی نۆزدەهەم و نزیك بە تەواوی خولی بیستەم • سەیری خواردەمەنی یـە بە تام وچێژەکانیان دەکەین و بە کەیبانووەکان ئافەریم دەڵێین و بـــۆ شی کردنەوەی ناوەرۆکی ئەم خواردەمەنی یە رووحی یانە لەگەڵیان دەچینـــە پێش و لە هەمان کاتدا کە لە بیروڕا جوانەکانیان سەرمان سوڕ دەمێنـێ ، یادی بەخێریشر لە پێنینیان دەکەین •

## بیـــروڕای هێندێك لە فیلسوفەکانی رۆژئاوا :

فەرانسیس بیکن : ناوبراو هێندێك بناخەی ژیربێژی یەکانـــــــــــی ئەرستووی هەڵوەشاندەوەو بایەخی زۆری بە ئەزموون داو رای گەیانـــــد : ئەزموون لەو بوارەدا تاقە بەڵگەی ناسینە • رەوشتی تازەی زانستـــــــی • لەجیاتی ئەوە لە شتە گشتی یەکان و چەمکەکانەوە دەست پێ بکا ، لە بـــەش بەشەکان " جزئی " یەکانەوە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد • واتا پەنای بردە بەردێگەری ( استقرا ) و بەم شێوە لە هەڵسەنگاندنی بەش بەشەکانەوە بـــە شتە گشتی ( کلی ) یەکان، گەیشت • ئەم شێوەش لای ئەرستوو هەبـــوو • بەڵام ئەم بۆناسینی پێوەندی یەکانی سروشت بایەخی بەم بەشـــــــەدا ، ئەزموون ( تجربە )ی بە یەکەم دەرس لە مەیدانی ناسینا دانا • بەکورتـــی ئەزموونی رێك و پێك کرد و پلە بە پلە چوە پێش و چوار فوڕمی ( جدول )ی بۆ دانا و رێگای بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی خۆش کرد •

لای ئەو یەکەم وانە ، لە لێکۆڵینەوەی سروشتەوە دەست پێ دەکاو پـــا تێگەیشتن لە رواڵەتەکانی و گەیشتن بە یاسا تایبەتی یەکانی ، ئەوجار رەوایە بەرەو ناسینی یاسا گشتی یەکان ، ئەوانەی کە یاسا تایبەتی یەکان ئەگرنەبەر بچینە پێش و بەو جۆرە تا نەگەین بە یاسای گشتی گەورە کە هەموو یاساکـــا

ئەگرێتە بەرونەگەین بە شتە روونەکان ( بدیهات ) ئەوانەی لە لە هەر زانستێك دا روونن ، بە تێکۆشان د رێژە د ەدەمین . ئەوجار بە یارمەتی وەرگرتن لەم شتە روونانە ، لە هۆیە گەورەکان لە گەرد وون لەوانەوە سەرچاوە ئەگرێ ، د ەلۆڵینەوەو لە ئاکام د ا د ەگەین بە میتافیزیکی بەرز ( سامیە ) . ( ١ ) روجرزبیکن ، ئەو پالەوانەش لەم مەیدانەدا ، حەماسەی خولقاند وەو د ەوری تایبەتی هەبوە .

بیکن باوکی ماتریالیسمی ئینگلستان و زانستە ئەزموونی یە تازەکانە . بە بروای ئەو زانستی راستەقینە بریتی یە لە زانستی فیزیك و زانستە سروشتی یەکان و بە تەنیا فیزیك بەشی بنەڕەتی یە . ناوبراو لە لێکۆلینەوەی زانست د ا وەك بناخەد انەری رێبازی ئەزموون ، ناسراوە . پێی وایە کتێبی گەورەی سروشت ، پێویستە بکەوێتە بەر لێکۆلینەوە . سەرئەنجام " لاك " سەلماندی کە چۆن بیرورا لە ئەزموون ، د ەرد ەکەوێ . هەموو بیرێك ئاکامی ئەزموونەو هەر ئەزموونە کە فیکر پێك د ێنی . ( ٢ )

د یکارت ، وەك غەزالی لە کێش و هێزی هەستەکان د ا ، گومانی لێ پەیدا بوو . ئەو پێی وابوو هەستە بنچینەیی یەکان ، لەگەڵ د ەرەوە پێوەندی د ەگرن و لەگەڵ د یارد ەکان و شتە بەش بەشەکان د ا بەرەورو د ەبن و بە هۆشیش بە شتە گشتی یەکان د ەگەین . هەستەکان فریومان د ەد ەن و بەری وایش هەیە ، هۆش هەڵە د ەکا تا ئەو جێگایە ئەوەی لە خەون د ا د ەیبینین ، وەك لە بیداری د ا د ەیبینین وایە . ئەگەر وا بێ ئامرازی جێی متمانەمان نامێنێ . ئەویش وەك غەزالی لە ئاکام د ا بە متمانەو یەقین گەیشتوە . وتی : ئەگەر لە هەستەکان و هۆشت د ا گومان بکەی ، لە گەرد وون د ا ، گومانت لێ پەیدا د ەبێ . یەك شت جێی گومان نیە ئەویش ئەوەیە : " من گومان ئەکەم " ئەویش بەو واتایە کە بیر د ەکەمەوە ، چونکە گومان کرد ن ، بیرکرد نەوەیەو بیرکرد نەوەش لەزاتی خاوەن بیرەوە سەرچاوە د ەگرێ . ئەو زاتە خاوەن بیرەش " منم " . تەنانەت ئەگەر تێ بکۆشم لەوە گومان بکەم کە بیر د ەکەمەوە ، ئەمە بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە

---

( ١ ) ــ قصة الایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ١٢٦ ــ ١٢١

( ٢ ) ــ اصول مقدماتی فلسفه ، ژورژپولیستر ، لاپەڕی ٨٦ ــ ٨٥

کە بیر دەکەمەوە ... ئەمە قسەی مەشووری دیکارتە ؛ " بیر دەکەمەوە کەوابوو هەم " . ئەمیش لەم ریگایەوە ، بەوجودی خودا بڕوای کرد . باش وابوو بڵێ ؛ " من هەم کەوابوو بیرد ەکەمەوە " . بیرورای " زکماکی " بە باری سلامەتی هۆش دادەنێ و پێی وایە لە هەڵە بەدوورە ، چونکە بەشێکی بنەرەتی لە دانانی هۆش ولەو بیرورایەوە ، بڕیارە جێی متمانەکانمان وەردەگرین و لەسەربوونی خودا بەڵگەیان پێ دێنینەوە . پاشان بەرەو سەلماندنی وجودی خودا دەچێ و دەڵێ ؛ " من هەم کەوابوو کێ بە وجودی هێناوم و کێ خوڵقاندوومی ؟ " . خۆ خۆم خۆم نەخوڵقاندوە . کەوابوو پێویستە خوڵقێنەرێکم هەبێ . ئەم خوڵقێنەرەش دەبێ وجوودی پێویست ( واجب الوجود ) بێ . نیازی بە کەسێك نەبێ کە بە وجوودی بێنێ یان وجودی رابگرێ و پێویستە هەموو پەسنێکی تەواوکردنی هەبێ . ئەم خوڵقێنەرەش، خوڵقێنەری هەموو شتێکە ... ( ١ )

پاسکاڵ و مالبرانشیش کە قوتابی دیکارت بوون لە مەیدانی خوناسین دا لە مامۆستاکەیان کەمتر نەبوون .

پاسکاڵ ؛ ئەویش لە ناسین دا پێی وایە ، هەستەکان مرۆڤ فریو دەدەن و هۆشیش تووشی هەڵە دەبێ ، بەڵام بە تەنیا دڵ ، راستی دەناسێنێ . بە دڵ سەرچاوە سەرەتایی یەکان و واتا بێ کات و شوێن و جموجۆڵ دەناسین . هۆش ناسینی خۆی لەسەر ئەم زانیارییانە ( قضایا آولیه ) دادەنێ . ئەگەر بمانەوێ بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەوان نیشان بدەین ، پێویستە وا دابنێین کە چەند مەسەلەی تر پێش ئەوان هەبوو . ئەگەر بەوە باوەڕمان هەبێ ، تووشی زنجیرە ئەبین وناگەین بە سەرەتایەکان . کەوابوو بە دڵ لەم راستی یانەو لە وجودی خودا ئاگادار دەبین . پاسکاڵ پێی وایە هۆش بە ئاکامەکانی کات و شوێن دەگا ... ( ٢ )

اسپی نوزا ؛ ئەو پلەی بیکن بە ئەزموونی دا ، ئەو پێی نەدا . بەو جۆرە ئەو پاڵی بە ئەزموونەوە دا ، ئەو وا نەبوو . بەڵکوو بە پێچەوانەی گوندگەران ( استقرا ) ئەو لە چەمکە گشتی یەکانەوە بای دایەوە سەر

---

( ١ ) ــ قصة الایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ١٢٨ ــ ١٢٦

( ٢ ) ــ قصة الایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ١٣٢ ــ ١٣٠

بەش بەشەکان . لە گشتی بۆ تایبەت . لە " عام بۆ خاص " . لای ئــــەو مەوجود سێ جۆرە : ١ـ گەوهەرێك کە بە زاتی خۆیەوە راوەستـــــاوە ٢ـ پەسنەکان یان تایبەتمەندی یەکان ٣ـ " عرض " ەکان و شتـــــە نابنەڕەتی یەکان . لای ئەو گەوهەر بەزاتی خۆی بۆەو لەسەر پێی خــــۆی راوەستاوە ، وجودی بەزاتی خۆی پێویستە . ئەویش خودایە . پەسنەکان لە گەوهەردان و بەوانەوە راوەستاون و " عرض " ەکان ئەوانەن کە بە شێـوازی شتەکان بۆ ئێمە روون دەبنەوەو بەهۆی ئەوانەوە لە بوونی گەوهەریـــــان " واجب الوجود " ئاگادار دەبین . هۆش بەشێوەی پێویست لەسەر ئــەم شتە بڕیار دەدا . لای ئەو خوڵقاندن لە نەبوون ، پەسند نیە . پێی وایــە مەوجودی بنەڕەتی خودایەو جیهان " عرض " ەکانی ئەوە . . . ( ١ ) ئەو پێی وایە مرۆڤ کەسێکە کە دەڵێ " نە " .

جان لاك : لە ناسین دا بیروڕای " فطری " رەت دەکاتـــــەوە . پێی وایە هەموو شتێك لە ئەزموونەوە هاتوە . بەڵام هێندێك مسئلە هــەن ، ئاشکرا خۆیان دەنوێنن ، چونکە هۆش تێیان دەفکرێ و پێیان دەگــا و ئێمە پێمان وایە ئەوانە بیروڕای " فطری " ین . بەڵام مرۆڤی ترسنـــۆك و منداڵ شتی وایان نیە . ئەمەش بەو مانایەیە کە هۆشی ئێمە وەك تەتڵمیەکی سپی یە کە هیچی بەسەرەوە نەنووسراوەو ناسینەکانمان لە ژیان دا ، لـــە ئەزموونەوە سەر هەڵدەدەن . ئەمەش بە بەرەوروو بوون لەگەڵ شتەکانـــــی دەرەوەی زەین بەهۆی هەستەکانەوەیەو " تجربی " یە . هەروەهـــــا دەروونی یە ، ئەویش بەهۆی بیرکردنەوەو تێ رامانەوەیە . هەستەکان بـــاڵ و پەڕو سیخوڕی هۆشن . هۆش بە راگرتنی مانای هەست پێ کراوەکـــــان و کوکردنەوەیان و سووك و قورس کردن و تاووتووکردنیان و گەیشتن بــــە پێوەندی یەکانی نێوانیان ، رادەپەڕێ و هەنگاو هەڵدەگرێ . لـــــەم تێ روانینە دەروونی یەوە ، هۆش بە تێگەیشتن لە شتە سەرەتایی یەکان کـــە پێیان وایە " فطری " ین و لە راستی دا بیروڕایەکن کە هۆش خوڵقاندوونی ، دەگا . لەپاشان لاك دانی بە بیروڕای " فطری " دا ناە . . . لای ئــەو ناسین سێ جۆرە : ١ـ ناسینی روون ، کە بە تێگەیشتنی هۆش بە شێوەی

---

( ١ ) ـ قصةالایمان ، پێشوو ، بەرگی ١٣٨ ـ ١٣٢

دەس بەجێ ، کۆتایی پێ دێ . واتا بێ بەڵگەهێنانەوەو هەڵسەنگاندن .
٢ـ ناسینی بە بەڵگەهێنانەوە . کە بە ، بەرامبەرکردنی نموونە واتای
شتەکەو بیر لە شتەکە تەواو دەبێ ٣ـ ناسینی دژوار و پێچ و پلوچ دارکە
بەڵگەی ناوێ . ئەویش بریتی یە لە ناسینی ئێمە سەبارەت بە جیهانی مادە
ئێمە ئەمانە بە هەست دەناسین و لە جۆری رونیش نیە . بە بەڵگەش نیە .
ئێمە واڵەتەکانیان دەناسین و بە راستی یەکانیان ناگەین . کەوابوو ناسینی
جیهانی مادی ، دژوارە . ( ١ )

لایپ نیتس : لە سەرەتادا بیروڕای دیکارتی سەبارەت بە بوونی
بیروڕای " فطری " پەسند کرد و لەگەڵ جان لاك دا ، کە پێی وایە هۆشمان
تەختەیەکی سپی یە ، ئەگەر ئەزموون نەبێ هیچی تێدا نیە ، دژایەتی کرد .
وتی ئەگەر تەنیا پاڵ بە ئەزموونەوە بدەین ناتوانین ناسین شی بکەینەوە .
وەك لاك دەڵێ ئەزموون هەموو شتێکی ناسین نیە . بەڵکوو چەند راستی
پێویست و گشتی کە بەرزتر لە تەجروبەو ئەزموون ئەیدۆزێتەوە ، هەیە . بەم
ئەزموون نەی خولقاندوون و ئەگەر ئەزموون نەبێ بۆمان نادۆزرێتەوە . لە
ئاکامدا ئەمیش بەوە گەیشت . لایپ نیتس دەڵێ : بێجگە لە خودی هۆش ،
لە هۆش دا شتێك نیە کە لە هەستەکانەوە نەهاتبێ . ئەو پێی وایە هەر
راستەقینەیەك کە هۆش بیسەلمێنێ و بڕیاری لەسەر بدا چ بە باری
سەلماندن و چ بە باری نەسەلماندن ( اثبات و سلب ) پاڵ بەدوو
سەرچاوەی هۆشی پێویستەوە دەدا ، ئەویش ناتەبایی و هۆی تەواوە ...
ئیمانی بە خولقاندن لە هیچ هەبوە . ( ٢ )

هیوم : ئەو لە هەموو شتێك لە هۆش و خودای خۆی نکوولی کرد .
ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە کانت دیفاعێکی پیاوانە لە هۆش بکا . هیوم
وەك جان لاك لە بیروڕای " فطری " نکوولی کرد و پاڵی دا بە ئەزموونەوە .
ئەوەی کە بە پێوەندی هۆی و خاوەن هۆی دادەنێین ( علت و معلول )
بریتی یە لە بەدوای یەك داهاتن و زەین پێی راهاتوە ، دەنا هیچ
پێوەندی یەك نیەو هەر لە هۆشمان دایە . کەوابوو لە یاسای " سبب و

---

( ١ ) ـ قصةالایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ١٤٥ ـ ١٢٨
( ٢ ) ـ قصةالایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ١٥٢ ـ ١٤٧

مسبب" و هەروەها لەدەروون و هۆشی خۆیشی و لە جیهانیش، نکوولـــی کرد ... دەلێ جاری وایە تاقە سەرچاوەی ناسینمان ، شوێنەوارەکانـــی هەستە ، لە هەست پێکراوەکان دا شتێك نابینین کە پێی بلێین " هـــۆش یان زات " . کەوابوو هۆش وجودی نیە . هەروەها ئەو زاتەش نیە کـــە ئێمە ئیددیعای بوونی دەکەین . ئەوەی کە من دەلێم : زات و وجـــودم هەن ، لە دەروونی زنجیرە هەستەکان و بیروڕای بەدوای یەك دا هاتوودا ، هەن ، بەرزترین ئەم کومەڵە " زاتی هوشمەندە " وشەی زات و هـــوش ، بریتی یە لە گومان لە گومان دا ... شتەکانیش بێجگە لە بیری ئێمە شتێکی تر نیە ، بیرمان بریتی یە لە شوێنەوار و کارلێکەکانی هەستەکان بـــــــە شتەکان ... (۱)

کانت : ئـــەو سەرچاوەی ناسین بە هەست و هۆش دەزانی . ئـــەم پرسیارە گەلالە دەکا کە ئایا لە سروشتی هۆش و خوڵقاندنیا ، هێزێکـــی تایبەتی وا هەیە کە بتوانێ بێ پاڵدان بە هەستەکان و ئەزموونـــــەوە بڕیاراتی دانان ( انشائی ) لەلایەن خۆیەوە بخوڵقێنێ ؟ ئەندازەی ئـــەم هێزە چەندە ؟ وەلام : سەرچاوەی ناسین هەست و هۆشەو ناسینمان لـە یەکێك لەوانەوە نیە .

هۆش خاوەن بیروڕایەکی " فطری "یە . جێگرو چەسپاو لە خۆی دایـە کە ناوی ناوە " یاسا رێك و پێك کردنەکانی هۆش " . هۆش بە هێزی ئـەم یاسا رێك و پێك کراوانە دەتوانێ لەلایەن خۆیەوە ، بریارە ئینشائی یەکـان، بخولقێنی . بریاربدا و هیچ پالێك بە هەست کردن و ئەزموونەوە : نـەدا . بەلام ئەم هێزەی هۆش، دیاری کراوەو پێوەندی بە روالەتە هەســــــت پێکراوەکانەوە هەیە . ئەگەر تێبکۆشێ لە مەیدانی روالەتەکان وەدەرکـەوێ و بۆخۆی بچێتە ناخی شتەکانەوە ، تووشی هەلە دەبێ . ئەرکی میتافیزیـــك ئەوەیە کە تێکۆشانی هۆش لە بۆچوونە نێو ئەوەری هەست و جێگای ئەم هەلەیە دیاریبکا ، چونکە جیهانێکی نادیارە . کانت دەلێ : هەست کراوەکان لـــە کونەکانی خۆیانەوە ، دەگەرێنەوە بۆلای هۆش . ئەو کون و قوژبنانـــە زۆرن و لەسەریەکن ،جۆراوجۆرو تێکەڵ و کون کون . هۆش پێیان دەگـــــــاو

---

(۱) ــ قصقالایمان ، پێشوو ، بەرگی ۱۵۹ ــ ۱۵۲

ڕێك وپێكیان دەكاو لێكیان جیادەكاتەوە ، لەنێوان هێندێكیان دا پێوەندی دروست دەكاو هێندێكیان لێك جیا دەكاتەوە . هێندێكیان وەپێش دەخا و هێندێكیان وەپاش . سەرنجی هێندێكیان دەدا و هێندێكیان وەلا دەنێ و بە هێندێ ناگرێ و وازی لێ دێنێ . لە هێندێكیان ئیدراكی هەستی دروست دەكاو پاشان لەو ئیدراك پێكراوە هەستی یانە ؛ ئیدراك پێكراوی هۆش دروست دەكا یان بڕیاری دانانی تازە پێك دێنێ و ئەی خاتە بەر باس كە لەسەر ئەزموون و هەست كردن ، دانەراون . كەوابوو هۆش بە چ هێزێك ئەم كارە دەكا ؟ هەستەكان تەنیا وێنەی شتەكان ئەدەن بە هۆش . بەڵام پێوەندی یەكانی نێوان شتەكان چ لە ڕێك و پێكی شوێنی و چ لە ڕێك و پێكی كاتی یان هۆگری هێندێكیان بۆئەوی تریان كە بریتین لە پێوەندی یە هۆشی یەكان لە وێنەی شتە هەست پێكراوەكان دا ، لە ئارادا نین ، كەوابوو هۆش ئەمانە لە كوێ دێنێ ؟ ئەم بڕیارانە لەسەر ئەم شتە تازە دروست كراوانە لە كوێ دەدا ؟ ( ١ ) دیارە باسە فەلسەفی یەكانی كانت زۆر دوورودرێژن .

برگسون ، لە ئیمان و بڕوا بە بوونی خوادا ، پاڵی بە دوو بیروڕاوە داوە ،

یەكەم ـ تێگەیشتن لە ڕاستی هەستی ، بە تێ ڕوانین لەودا و لە جەم و جۆڵی دا ، وەدەس دەكەوێ ( وەك شتێكی گشتی كە بەشەكانی پێكەوە پێوەندی یان هەیە ) .

دووهەم ـ هۆیەكانی مەبەست و بڕیار لە خوڵقاندن دا ، بیروڕای دروست كردن ئەمبات بۆلای لەمەكاو بەپێدابوون لە بڕیاری نەگونجاوی هۆش دا . ناوبراو بە ڕێبازی مادی گاڵتە دەكا . كە هەموو شتێك لە جیهان دا لە كارلێك كردنی مادی دا كورت دەكاتەوە . هەروەها بەوە گاڵتە دەكا كە هۆش بریتی یە لە " دماغ " ی مادی و بێجگە لەو شتێك لە ئارادا نیە . بە بڕوای ئەو هۆش تەنیا بریتی نیە لەو دەماغە مادی یەی كە كاسە سەر دەوری گرتووە و لەودایە ، بەڵكوو هۆش شتێكەو دەماغ شتێكی ترە . هۆش هێزەو دەماغیش مادەیە . ئەگەر ئێمە وا ئەبینین كە تێگەیشتنی هۆش

---

( ١ ) ـ قصة الایمان ، پێشوو ، لاپەڕە ١٦٤ ـ ١٦٠

بە د ەماغەوە بەستراوەتەوە و بە نەخۆشی و هێز و لاوازی ئەوەوە پالـــــی داوەتەوە ، لەبەر ئەوەیە کە د ەماغ، کاسەی هۆشەو بەڵگەی ئەوەو ئامرازێکە لە لەرچەی ئەوەوە ، بە ڕێگای خۆی د ڕێژە د ەدا ؛ هەرکات بەشێك لە د ەماغ لە کار بکەوێ ، جەرمیانی هۆش تێك ئەچێ و تووشی سەرلێ شێواوی ئەبێ٠ وەك ئاو کە لە کاسەیەك د ایەو کاسەکە د ەشکێ ، ئاوەکە وەك خۆی نامێنێتەوە٠ نە ئاو کاسەیەو نە کاسە ئاو٠ ئەوە کە ئێمە هەر شتێك لە ڕوانگەی ماد ی‌یـــەوە شی د ەکەینەوە ، د وو هۆی هەیە ؛

یەکەم_ بەشێك لە هۆشی ئێمە پەید ا بۆ تا لە جیسمە ماد ی‌یەکـــان، تێ بگاو لەم جێگا ماد ی‌یەد ا ، زۆر لە بۆچوون و یاساکانی خـۆی ، وەد ەس هێناوە٠

د ووهەم_ ئەمەیان گرنگترە٠ هەتا ئێستا تێ نەگەیشتووین ، چـــۆن تەماشای ڕاستەقینەکانی شتەکان د ەکەین و نازانین چۆن زینـــــد ووی د ەکەینەوە تا بی‌بینین٠ چونکە ئێمە ڕاستی‌یەکان بەش بەش د ەکەین تـــا بتوانین لێ‌یان حالی بین٠٠٠ واتا وەك گشت ( کل ) نای بینین، لەگەڵ ئەوەش‌د ا لەڕاستی‌د ا بێجگە لەم شێوە بۆچوونە لەبەرگرە ، حالــــی نابین ٠٠٠ (١) وەك د ەبینـــن ، تێ د ەکۆشی، بە شی کرد نەوەو نموونـــە هێنانەوە ، هێزو ماد ە لێك جیا بـکاتەوە ! لە هەمان کات‌د ا کە کاسە بـــە جێگای هۆش‌د اد ەنێ ، د ەی‌هەوێ لە ماد ی بوونی هۆش ، خـــــۆی بپارێزێ !

لەراستی‌د ا هەرچەند تێ کۆشاوە ، بیروڕای ماد ی لەم باسەد ا ، پەسنـد نەکا ، بێ ئەوەی خۆی‌بزانێ ، بە قازانجی ماتریالیستەکان ، ئەد وێ ! بـــا بچینە سەر بەشە جۆراوجۆرەکانی فەلسەفە ؛

## بــەشــی یــەکــەم_نــاسیــن

مرۆڤ بەشێکە لە هەستی بێ‌سنوور٠ بێ ئەملا و ئەولا بە بەشەکانی د یکەی هەستی‌یەوە پێوەند ی هەیە٠ ئەگەر بکرێ بە هەستی بێ مرۆڤ بڵێیـــــن ،

---

(١) _ قصةالایمان ، پێشوو ، لاپەڕی ١٧٥_ ١٧٤

" سروشت " د ەتوانین بلّێین ، مرۆڤ و سروشت ها وئا هەنگیان پێکــــەوە هەیە • هەمیشە کا ریگیان پێکەوە هەموو لەسەر یەکتر شوێن دا دەنێن • لــە هەڵس وکەوتی ژیانی هەر مرۆڤێك دا ، پێوەندی فراوانی گرێ و گۆڵدار لـــە نێوان ئەو و جێگای ژیانی ( سروشت و مرۆڤەکانی تر) دا داد ەمەزرێ • ئــەم پێوەندی یانە کە مرۆڤ بە سروشت و مرۆڤەکانی ترەوە ، پێوەندی دەدەن کاتێك لە چوارچێوەی لەش ( ئورگانیسم ) دا ، رەنگ بدەنەوە ، پێ یان دەڵێـــن زەین ( Mind ) • چوارچێوەی لەشی مرۆڤ لە سەرەتاوە ؛ تەنیا دەتوانێ چەند کرد ەوەی ساکاری هەبێ • ئەم کرد ەوە ساکارانە کە بریتین لـــــە دزێ کرد ەوەی " زگماکی " ( Inborn reflexes ) یان بــــە چاوپۆشی یەوە دەکرێ بلێین • کرد ەوە غەریزی یەکان ، بە نیسبەتی ئـــاڵ و گۆڕەکانی ژیانی تاقە مرۆڤ ، خۆیان بێ جم وجۆڵ و بێ ئاڵ وگۆڕ نیشـــــان دەدەن • لەگەڵ گشت ئەمانەدا لەماوەی ژیانی خاوەن کات و دڕێژدا ، بــە پێی داخوازی جێگای ژیان ، کەم یان زۆر ، ئاڵ وگۆڕ قبوڵ دەکـــــەن • بەرەورووبوونی چوارچێوەی لەش لەگەڵ جێگای ژیان و کارلێکیان لەســـەر یەکتر ، ئەبێتە هۆی گۆڕانی هەرد ووك لا یەن • جێگای ژیان بە هـــۆی کارکردنی مرۆڤەوە ، ئاڵ وگۆڕی بەسەر دادێ و مرۆڤ بە هان دانی جێگـــای ژیان ، بەرەوپێش دەچێ ، وەپێش دەکەوێ و دەتوانێ رەنگ دانـــــەوە سروشتی یەکان بە شێوەی رەنگ دانەوەی شەرتی ( Reflexes Conditioned ) یان کرد ەوەی جیا لە غەریزە ، خۆیان بنوێنن و زانیــــــــاری ( Consciousness ) یان ناسین ( Congnition ) ئاگامی ئەم کرد ەوەیە •

پلــەکانــی ناسیـــن :

زانست یان تێگەیشتن لە دوو پلەوە تێپەڕ دەبێ : یەکەم ـ ناسیـــن بەهۆی هەستەکانەوە ( ناسینی هەستی ) دووهەم ـ ناسینی ژیریێـــــری ( منطقی ) (١) لەلایەکی ترەوە دەڵێن : ( ناسینی رووەیی ( سطحی ) و

---

(١) دەامیرحسین آریانپور، زمینەجا معەشناسی ، تالیف آگبرن ونیم کـوف ، تاران ١٣٤٦ ل ٢ـ١

ناسینی زانستی ) . له پلەی ناسینی هەستی دا ، دنەدانەکانی مڵبەندی ژیان له رێگای هەستەکانەوە ،لەسەر چوارچێوەی لەش، شوێن دادەنێن .ئەم دنەدانە له سەرەتاوە به شێوەیەکی ون و نەزانراو و نادیاری لەمێشک دا ، رەنگ دەداتەوەو ئەوکات پێی دەڵێن ، هەستکردن ( احساس Sensation ) پاشان بەشێوەیەکی دیاریکراو خۆی دەنوێنێ و پێی دەڵێن تێگەیشتن ( ادراك Perception ) .

ادراك ، وێنەی ئاشکرای هەستی شتەکان و روانەتەکانی دەرەوەی زەمینە،کە لەکاتی شوێن دانانی راستەوخۆی شتەکان لەسەر هەستەکان ، خۆ دەنوێنێ . هەستپێکردن کە بریتی یە له رەنگ دانەوەی چەند لایەنی تاقانەی شتەکان لەگەڵ " ادراك " جیاوازە ، چونکە لەودا وێنەکان تەواوترن . . . ( ١ )

مرۆڤ بەهۆی ئیدراکەوە به چەند لایەنی دیاردەکان دەگا . به نەمانی دنەدانی دەرەوەی زەمین ، ئیدراك نامێنێ ،بەڵام شوێنەواری وێنەیەکی زەینی ( تصور ذهنی = Mental image ) دەخولقێنێ . ئەو وێنە زەینی یانە ، ئەگەر به پێی هەلومەرجی دنەدانەکانی دوای مڵبەندی ژیان ، بەشێوەی بنەرەتی ،خۆنیشان بدەن ،پێیان دەڵێن ، وەبیرهێنانەوە ( Recollection ) ئەگەر به شێوەیەکی بەراوەژوو، خۆیان بنوێنن ،پێیان دەڵێن ، " تخیل = Imagination ) بیرکردنەوە ( ٢ ) .

خیال ، بریتی یە له تێکۆشانێکی دەروونی لای مرۆڤ کە له گەرماگەرمی پێوەندی گرتن لەگەڵ ئەو شتانەی که به هۆی ئەزموونەوە دەس کەوتوون ، لەدایك دەبێ . بریتی یە له وێنە هەستی یە تازەکان . به پشتیوانی خەیاڵ نه تەنیا مرۆڤ ناتوانێ ئەوەی هەیە وێنەی لێ بگرێ ، بەڵکوو ئەوەی کە لە زەمینەی راستەقینەش دا نەگونجە ، وێنەی لێ ناگرێ ، بەڵام مرۆڤ مادەی خەیاڵ له مڵبەندی ژیانی وەردەگرێ . خەیاڵ خۆی دەنوێنێ و له جەرەیانی هەڵس و کەوتی کۆمەڵایەتی دا ، گەشە دەکا . . . ( ٣ )

---

( ١ ) ـ المعجم الفلسفی المختصر، مسکو، دار التقدم ١٩٨٦ ل ١٨ ( ٢ ) ـ آریانپوور، زمینۀ جامعەشناسی، پێشوو،ل ٢ ( ٣ ) ـ المعجم الفلسفی المختصر، پێشوو،ل ٢١٠ .

ئەداماتی لەش یان چوارچێوەی لەش هەمیشە لە بەرامبەر تێگەیشتنەکان ( ادراکات ) یان لە بەرامبەر وێنە زەمینییەکانەوە ، دژکردەوە ، نیشان دەدەن و ئەوبار ( حالەت )ە بەخۆیانەوە دەگرن کە لە زاراوەی دەروونناسی دا پێی دەڵێن : " عاطفە = Emotion ) . لە پلەی زانینی ژیریێژی دا ، تێگەیشتنەکان یان وێنە زەمینییەکان ، کە نوێنەری راستەوخۆی شتە بەش بەشەکانی جیهانی دەروونن ، هەڵدەسەنگێندرێن ، لێك دەدرێن و دابەش دەکرێن و هەر بەشە لە جێگای تایبەتی خۆی دادەندرێ و رێك و پێك دەکرێ . پاش ئەوە توخمە تایبەتی و بەدەگمەنەکانی ئید راك یان وێنە لەلایەك دادەندرێن و توخمە بنەڕەتی و گرنگەکانی ئەوان ،لە جێگایەك کۆدەبێتەوە ،لە ئاکام دا ئیدراك یان وێنەی بەش بەش ( جزئی ) وکەمڕەنگ و رووماڵی ( سطحی ) کە بەدیاردەیان شتێکی دیاری کراوە پێوەندی هەیەو باسی روانەتەکانی ئەو شتە دەکا ، بە یارمەتی وەرگرتن لە وێنەکان یان ئیدراکە پێشووەکان ،باری گشتی پەیدا دەکا و لەژێرناوێکی گشتیدا خۆدەنوێنێ و ئەوکات زات یان ناوەرۆکی ئەوشتەو شتی وەك ئەو ،نیشان دەدا . پاش تێپەڕکردنی ئەم پلەیە ، پێی دەڵێن چەمك " مفهوم= Concept " و لە پلەی دووهەم دا، ئاکام وەرگرتن " استنتاج = Reasoning " پێك دێ . بڕیاریان " حکم" بریتییە لە پێوەندی فوڵ و دووری راستییەکانی دەروونی زەین . ئاکام وەرگرتن لە ئاکامی کۆکردنەوەی چەند بڕیارو وەدەرهێنانی بڕیارێکی بەرفراوانتر، پێك دێ کە ئەویش بریتییە لە دێگەڕی ( استقرأ ) . ( ١ )

استقرأ : یەکێك لە رەوشە بنەڕەتییەکانی بەڵگەهێنانەوەیە ؛ بریتییە لە گواستنەوەی ناسین لە رستە بەش بەشەکان بۆلای بابەتە گشتییەکان . بە تەواو و ناتەواو دابەش دەکرێ . تەواو بڕیارە لەسەر گرۆیەك لە شتەکان لەسەر بناخەی لێکۆڵینەوە لە گشت ئەوشتانەی کە لە دەروونی ئەو گرۆیەدان . ناتەواو بریتییە لە لێکۆڵینەوەی هێندێك لەو شتانە . تەواوەکەیان لە کردەوەی زانستیدا زۆر کەڵکی لێ وەردەگیردرێ . بڕەوی زۆرە . ( ٢ )

---

( ١ ) ـ آریانپوور ، پێشوو ، لاپەڕی ٢

( ٢ ) ـ المعجم الفلسفی المختصر ، پێشوو ، لاپەڕی ٢٦ .

استنتاج : یەکێك لە شێوازە بەرەتی یەکانی ژیریێژی یە • بریتی یە لـــە کرد ەوەی ژیریێژی کە لە برپارێك یان چەند برپارەوە کە پێ یان د ەڵێـــــــن سەرەتاکان ( مقدمات ) بەرەو برپارێکی تازە د ەرپێن کە پێی د ەڵێـــــن ئاکام • • • ئەگەر سەرەتاکان جێی متمانە بن ،ئاکامی تازەش د ەبێتە جێـــی متمانە • ( ۱ )

بەهەرحاڵ گەیشتن بە " استقرأ " واتا برپاری بەرفراوان بەو هۆیـــەوە کە لە هێندێك لە برپارە پەشووەکانی زەمین د ەچێ و وەك ئەوان وایـــــە د ەکەوێتە ژێر پەیـــــی ئەو برپارانەوە ( چی لەسەر ئەوان بێ لەسەر ئەمیشە ) و بەم هۆیەوە ورد ی و روناکی و راشکاوی زۆرتریێك وەد ەس دێنی و پێـــــــی د ەگوترێ " قیاس " •

قیاس : بریتی یە لە د یاری کرد نی پێوەند ی چەند ی لەنێوان ئـــــەم شتەو ئەوی تردا لە پەسنەکانی شت یان لەنێوان چەند ی خاوەن سنووردا کە وەك پێوانەی " یەك بوونی قیاس = پێوانە " لەبەرچاو د ەگیرد رێ • • • بـە هۆی قیاسەوە گەیشتن بە پەسنی ورد ی ئەم شت یان ئەو شت لە پەسنەکانی شتەکان ، تەواو د ەبێ و ئەوکاـ ئەو د ەرفەتە وەد ی د ێ لە بارود ۆخێکی تردا چەند ی یەکی مەبەست لەم پەسنانە وەك ئاکام ، وەد ەس د ەکەوێ ( ۲ ) ئەوابـوو بە وتەیەکی تر ، استقرأ بریتی یە لە : " گەیشتن بە چەمکی گشتی ، بەهـــۆی لێکۆلینەوە لە د یارد ە بەش بەشەکان و پەل و پۆیەکان " و پێوانە بریتی یە لـە ئاژین کرد ن و وەبەر برپارد انی چەمکی گشتی بەسەر ئەو شتانەدا کـە وەك ەون یان " مصداق "ی ئەون و لە هەر ئاکام وەرگرسێك د ا ، کارلێکیـــان یاـ شوێنیان هەمەولێك جیا نابنەوە •

پاش ئاکام وەرگرتن ،ئەند امەکانی لەش ( ئورگانیسم ) لایەنێکـــــــی د یاری کرا و بەخۆ د ەگرێ و وەك د ەگوترێ " ئێراد ە " د ەکا و بەهۆی ئەوەوە ، .. مست بە تێکۆشان ئەکا • لەم حالەتەد ا د ەکرێ بگوترێ کە کرد ەوەو رفتـــار ، سەرەتاو کۆتایی ، ئاسینەو ژیانی زەمینی لە نێوەراستی ئەم د ووە د ایە • ( ۳ )

---

( ۱ ) ــ المعجم الفلسفی المختصر • بەرگی ۲۸

( ۲ ) ــ ئەم سەرچاوە ، لاپەری ۲۸۱

( ۳ ) ــ د ــ آریانپوور ، پێشوو ، بەرگی ۲ــ

ناسین لەم بوارانەوە تێپەر دەبێ .

١ــ بەرەورووبوونی ئەندامانی لەش لەگەڵ شتەکانی دەرەوەی زەمین .

٢ــ شوێن دانانی ئەو شتانە لەسەر زەمین ، بەشێوەی وێنەهەڵگرتن .

٣ــ بە هۆی کردەوەی زەمین لەسەر ئەو وێنەو هەست پێکردن و ئید راك ـ کردن و چەمك دروست کردن و ئاکام وەرگرتن و بریاردان و لە دواپین پلە دا ئاڵ وگۆڕ پێك هێنان لە شتەکانی دەرەوەی زەمین دا ، ناسینی زانستی ، بەدی دێ و بەم جۆرە ئەو قسە راست دەبێ کە دەڵێ . کردەوە سەرەتــــاو کۆتایی ، ناسینە .

## ناسینــی پلە بە پلە و ناسینی لەنەکــاو .

دەکری بڵێین . پەی یەکەمی ناسین ( ناسینی هەستی ) ســـــەر ئەکێشێتە لای پلەی دووەم ( ناسینی ژیریژی ) ی ناسینەوە . بەلام لە ژیانی رۆژانەدا هێندێك جار لەنێوان ئەم دوو پلەی ناسینەدا ، ماوەوکـــــات ، خۆ دەنوێنێ یان لە بنەرەت دا ناسین لە پلەی یەکەم تێ ناپەرێ . جیا لەوە رێپێوانی هەرکامە لەو پلەی ناسینانە ، بە توند رۆینێکی یەك جۆر ، تــــێ ـ ناپەرێ . جاری وایە ئید راك بە هێدی و وردەوردەو جاری وایشە بەچالاکی و بە پەلە وەدەس دێ . جاری وایە سۆزو عاتیفە توند دەبێ و جاری وایشــــە ئید راك وەپێشی ئەو دەکەوێ . جاری وایە ئەو رێگایە کە دەبێ ناسیـــــــن بی پێوێ ، رێك و پێك و یەك بەدوای یەك دا ، دەپێود رێ . جاری وایە لــە یەکێك لەوان دا ، راوەستان یان بە ئەنقەست راوەستان ، پێـــــش دێ . دەگونجێ کە کەسێك پاش تێگەیشتن و گەیشتن بە شتێك ، توانای ئــاکام ـ وەرگرتنی نەبێ و نەتوانێ درێژە بە رێگاکە بدا ، پاش ماوەیەك لەنەکاو لە خەو یان وەخەبەرهاتن و بێداریدا ، ئاکام وەربگرێ بەم شێوە ، وێ دەچـــێ کەسێك سەبارەت بە شتێك بەپەلەو بەتوندی لە پلە جۆراوجۆرەکانی ناسینــی مەبەستێکی دژوارو پرپێچ و پلوچ بتێپەرێ و بە رێگای چارەسەرکردنی بگــــاو لە هەمان کات دا لە چەند مەبەست و بابەتی تردا ، زۆری بەم شتە نەشکێ . مێژووی زانست و هونەر لەم بارەدا نموونەی زۆری نیشان داوە . تارتینــی ( Tartini . ) ئاهەنگ خوڵقێنەری ئیتالیایی خولی هـــــەژدە ،

. واشێوەی شـاهەنگی ناسراوی خۆی " سونات شمیتان " ی لە خـەون دا
پێت و پێك کرد و ئـەارخی مەدس ( Archimedes ) ی زانـــــای
یۆنانی سەدەی سێیەمی پێش زایین لەمەکا و لە گەرماودا ، یاسایەکـــــی
گەورەی زانستی دۆزیەوە .

ناسینی لەمەکا و چ بەهۆی دەست وردی بەدەگمەن بێ و چ لە ئاکامی
. وایی ( غایی ) بیرکردنەوەکانی پێشوو بێ ) ، بە بڕوای ئەو کەسانە کـــــە
خۆوخەدمیەکی مەزنی خوازانەو " معجزە " ویستیان هەیە ، کارێکی بـــــە
پێچەوانەی عادەت و باوە . ئەم جۆرە خەڵکە پێیان وایە ناسین دوو جۆرە :
یەکەم ـ ناسینی هۆشی ( عقلی ) و دووهەم ـ ناسینی تیشك دانـــــەوە
( اشراقی ) یان بەرەورووبوون ( شهودی ) . بە گومانی ئەمانە ناسینـــی
هۆشی لە ئاکامی هەست پێکردن و تێگەیشتن و ئاکام وەرگرتـــــــــــــن
" استنتاج "ەوە ، بەدی دێ و ناسینی تیشك دانەوە یان بەرەورووبـــــوون
( شهودی ) ، ناسینێکی دەست بەجێیەو هیچ پێوەندییەکی بەهەستەوە
یەو تەنیا بەهۆی بەندەگی یان راهێنانەوە ، دەس دەکەوێ . بەلام ئـــــەم
کەسانە لەوەی خافلن کە ناسینی دەس بەجێ ، لایەنێکە لە ناسینی پلە بـــە
لە ، بەم جیاوازییە کە ، یان پلە سەرەتایی یەکان بەپەلە تێدەپەڕن ، یان
نێوان ، برگەو پلە سەرەتایی یەکانی ( مقدمات ) و ئاکامی دوایـــــی دا ،
کات هاتۆتە پێش .

## ناسینی ئیدراکی و ناسینی عاتیفی

خالێك کە لە دەوروبەری ئەم باسەی ئێمەدا گرنگی هەیە ، ئەوەیە کـــــە :
هەر ناسینێك دوو توخمی ( عنصر ) ی ئیـــدراکی و عاتیفی هەیە . لەبەرئەوە
ناسین بەهۆی بەرەورووبوونی چوارچێوەی لەش و مەڵبەندی ژیان ، بە ناچار و
بێ ئەملا و ئەولا ، لە هەردووکیان شـوێن هەڵدەگرێ و کاری لەسەر دەکەن ؛
هەم لەو شتانە کە لە دەرووبی زەمین دان و هەم لەوانەی کە نوێنەری بـــارە
دەروونی یەکانن ، هەوال بلاو دەکاتەوە . ئیدراك بریتی لە رەنگ دانەوەی
راستی یەکانی دەرەوەی زەمین و عاتیفە ، بەهۆی دژکردەوەی مرۆڤ لــــــە
بەرامبەری ئیدراکەوە ، دەخولقێت و نیشانەی زیندووبوون و زۆر لـــــــــە

تێکۆشان دا بوونی چوارچێوەی لەشی مرۆڤە • عاتیفەکان نیشان دەدەن زەین وانیە کە دەزی کردەوەی نەبێ ( هەر شوێن هەڵبگرێ و شوێن دانەنێ ) و پێوەندی یەکانی مرۆڤ لە وێنە مردووەکانی ماشینی و دەسکرد، پێک دێن • چوارچێوەی لەش لە بەرامبەر هەر ئیدراکێکەوە، دەزی کردەوە نیشان دەدا و بەم دەزی کردەوە تووشی عاتیفە دەبێ • عاتیفە پێوەندی تازەی نێوان چوارچێوەی لەش و مەبەستی ژیان، رادەگەیەنێ و پێوەندی بە ئیدراکەوە هەیە •

ئیدراک کە بریتی یە لە رەنگ دانەوەی دەنەدانی ئەو شتانەی لە دەرەوەی زەین دان، هەمیشە لەگەڵ عاتیفە واتا دەزی کردەوەی ئۆرگانیسم ( چوارچێوەی لەش ) لە بەرامبەر دەنەدانی دەرەوەی زەین دایە • ئەوەی لە پێی دەزاندرێ و ئیدراک دەکرێ، بەناچار لە چوارچێوەی ئەندامانی لەش ناڵ و گۆڕ، پێک دێنێ و سەر ئەکێشێتە لای عاتیفەوە • ئەو عاتیفەیە کە شوێن لەسەر ئیمە دادەنێ، بێ ئەملا وئەولا لەگەڵ تێگەیشتن یان ئیدراکێک دایە • کەوابوو هەرجۆرە ناسینێک هەم ئیدراکی و هەم عاتیفی یە • ئیدراکی عاتیفی تەنیا بەنیسبەتی ئەم دووە لە بابەتی جۆراوجۆردا، جیاوازی هەیە • جاری وایە، عاتیفە بەسەر ئیدراک دا، زاڵ دەبێ و جاری وایە بە پێچەوانەیە • عاتیفەی سەدلەسەد " قوول " لە ئارادانیە، چونکە ئەو عاتیفەیە کە لە لاوەوەی خۆی ئیدراکی بێ، ناناسێندرێ • ئیدراکی بە تەواوی پوختەو بێ خەوش یان دەرەوەیی ( خارجی ) هیچکات پێک نایە چونکە ئیدراک ئەو کاتە دێتە کایەوە کە دەنەدەرێکی دەرەوەیی لەگەڵ چوارچێوەی لەش، لێک بدەن و شوێن لەسەری دابنێ و شوێنی لێ هەڵ گرێ و کارلێکیان پێکەوە هەبێ •

بەگشتی ناسینی هەستی پتر لە ناسینی ژیریی تێکەڵاوی عاتیفەیە، چونکە مرۆڤ لەنێو شتە هەست پێکراوە جوزئی یەکان دا، گەمارۆ دراوە و لەگەڵیان دا پێوەندی هەمیشەیی هەیە • لەم بارەوە، ئەم ئیدراکاتەی کە لە شتە هەست پێکراوە جوزئی یەکانەوە، دەس دەکەوێ و پێک دێ، بۆ مرۆڤ پڕە لە ماناو واتاو نرخی هەیەو هاورێ لەگەڵ عاتیفەن، لە حاڵێک دا چەمکە داماڵراو ( انتزاعی ) یە گشتی یەکان، بە دژواری دەتوانن ببنە بابەتی عاتیفەکانی مرۆڤ •

لەبەرئەوە ناسین بەخۆی بەرەورووبوونی مرۆڤ لەگەڵ پەیوەندی ژیـان ، پێك دێ ، چۆنیەتی ناسینی هەرکەس لە هەر شتێك و هەر بابەتێك دا ، بـە بەرەورووبوونی ئەوەوە ، پەیوەندی هەیە • کەوابوو هەرکەس بە پێـــــــی ئەزموونەکانی ژیانی خۆی واتا بە پێی بەرەورووبوونەکانی لەگەڵ دەوروبـــەری خۆی دا ، بە پلەیەك لە ناسین دەگا • ناسینی یەکێك بە پلەیەك دەگا ، کـە بە پێی عورف و باوبەو ناسینە دەڵێن : " دروست" و ناسینی کەسێکی تر بە پلەیەك دەگا کە پەسن ( صفت ) ی " نادروست " یان نـــــــــزیك وەردەگرێ • جاری وا هەیە کە ناسینی کەسێك بە نیسبەتی شتێکەوە ، لـــە ناسینی کەسێکی تر بە نیسبەتی هەمان شتەوە " دروست تر " دەبێ •

لە وشەکانی دروست ، نادروست و دروست تر ، دەردەکەوێ کە دەکرێ ناسین ئەندازەی بگیردرێ • دەمێکە بۆ ئەندازەگرتنی ناسیـــــــــن ، تەرازوویەکیان بەکار هێناوە • ئەم تەرازوویە کە ناوی نراوەتە راستـــــــــی ( حقیقت = Truth ) بریتی یە لە رێك هاتنەوە ( تطابق ) ی ناسیـن لەگەڵ هەستی یان راستەقینە( واقعیت = Reality ) دا• ناسینێـك لەگەڵ چوارچێوەی هەستی یەك بگرێتەوە ، بۆیەوە دەبێ کە پەسن (صفت) ی راستی ( حقیقی ) پێبدرێ و ناسینێك کە لە راستی واتا شتەکانی دەرەوەی زەمین ، باسرنەکا ، ناسینی ناراست و نەزۆك و نەخۆش یان دوور لـــــــە راستی یە • هەربۆیە راستی یەکێکە لە پەسنەکان یان چۆنی یەکانی ناسین ( ١ )

حقیقت : ناسینێکە ناوەرۆکەکەی پـاڵ بە مرۆڤ یان بـــــــــە بەشەری یەتەوە نادا و لەسەری رانەوەستاوە • لەوکاتەدا کە مرۆڤ لە پەسنەکانـی شتەکان دەکۆڵێتەوە ، لەکەمینی ناسینی گەوهەرەکەی دایە • واتا جیهـان و شتەکان و پەسنەکانیان بەشێوەیەك کە پەردە لەسەر وجود یان لـە دەرەوەی زەمین دا ، هەڵبداتەوە ، لە زەمین دا رەنگ دەدەنەوە ••• ( ٢ ) لـــــەوە ئاگادارین کە گشت هەستی هەمیشە لە ئاڵوگۆڕو تێکۆشان و جموجـــــــۆڵ

---

( ١ ) ــ ئاریانپوور ، پێشوو ، بەرگی ٥ ــ ٣

( ٢ ) ــ المعجم الفلسفي المختصر ، پێشوو ، بەرگی ٢٠٣ ــ ٢٠٢

دایە . مرۆڤ کە ناسێنەری ڕاستی یە ، خۆیشی هەمیشە لە حاڵی ئاڵوگۆڕ دایە . هەروەها مەڵبەندی ژیان و شتەکانی دەوروبەری کە بۆخۆیان بابەتی ناسینن و مرۆڤ تێدەکۆشێ بیان ناسێ و دەیان ناسێ ، لە هەرکات دا ئاڵوگۆڕیان بەسەردادێ . لەبەر ئەوە ناسێنەر ( مرۆڤ ) و بابەتی ناسین ( مەڵبەندی ژیان ) هەردووکیان لە ئاڵوگۆڕدان ، پێوەندی ئەودووە کە بریتی یە لە " ناسین " لەسەر یەک بارو ڕێ نامێنێتەوەو لە ئاکام دا ڕاستی ( حقیقت ) کە بەستی ناسینە ، بۆخۆی ناتوانێ چلۆنایەتی یەکی بەردەوام و دیاری کراوی هەبێ . هەروەک هەستی هەمیشەو بۆ هەتاهەتایە ، خەریکی ئاڵوگۆڕە ، ڕاستی یەکانیش ، ئاڵوگۆڕیان بەسەردادێ . سەبارەت بە هەر شتێکی تاک و تەنیا یان یەک دیاردە ، ئەوەی کە دوێنێ ڕاستی بوو ، ئەمڕۆ جێگای خۆی بە ڕاستی یەکی تر دەدا و ئەوەی ئەمڕۆ ڕاستی یە ، سبەی دەبێتە ڕاستی یەکی گەورەتر . کەوابوو ڕاستی لەگەڵ جم وجۆڵ و ئاڵوگۆڕیان " دینامیسم "ی بێ ڕاوەستانی شتەکانی دەرەوەی زەین ( واقعیت ) هەمیشە وا لە کاری خولقاندن و دروست کردن داو ئەم خولقاندنە بێ گومان لە کات دا ، خۆ دەنوێنێ . کات خۆی دوو لایەنی هەیە ، ڕابردوو و داهاتوو و ئێمە کە هەمیشە لەنێوان ئەم دوو لایەنە داین ، خاڵی جیاکەرەوەی ڕابردوو و داهاتوومان ناو ناوەتە " ئێستا " و تێدەکۆشین تا هەر ئێستا بە کەڵک وەرگرتن لە یارید مدانی ڕاستی یەکانی ڕابردوو ، ڕاستی یەکانی داهاتوو پێش بینی بکەین یان لەپێش دا بیان بینین و بەرلە هەنگاو هەڵگرتن ، ڕێگای خۆمان ببینین و کەند و کۆسپی لابەرین . لەم بارەدا ڕاستی ئەبێتە خاوەن کات . ڕاستی بێ کات هیچ و بێ بناخەیە . کەوابوو ، ڕاستی بریتی یە لە ڕەنگ دانەوەی ئەو هەستی یەی کە لە حاڵی ئاڵوگۆڕ دایەو بریتی یە لە جەرەیانی بەرەوپێش چوون .

## ناسینی جۆراوجۆر

ناسینی خاوەن نەزم و چوارچێوە ، لە مێژووی ژیانی مرۆڤ دا ، بە دوو شێوەی بنەڕەتی خۆی نواندوە : ١ــ ناسینی زانستی ٢ــ ناسینی هونەری .

ئەم د َوو ناسینە سەر ئەکێشنە لای ناسینی فەلسەفی یەوە (١) هونـــەر تێکۆشانێکی خولقێنەرە کە سەر ئەکێشێتە لای خولقاندنی وێنە هونەری یەکانەوە، شتەکانی دەرەوەی زەمین ، بەشێوەی رەنگ دانەوە نیشان دەدا و بیـــروڕای جوانی پەسندی مرۆڤ بۆلای ئەو راستی یانە راد ەکێشێ ٠٠٠ (٢)

زانست یان " علم " گۆڕەپانێکەلە تێکۆشانی مرۆڤ کە مەبەستی بریتی یە لە لێکۆڵینەوەلە شتەکان وکارکردن لە سروشت وکۆمەڵ و بیرکردنەوەو کارکردن لە پەسنەکان و پێوەندی یەکان یا ساکانیان ،شێوازێکە لە وەخمەرهاتنـــی کۆمەلایەتی ٠هەرناسینێك ناتوانێ زانست بێ ٠٠٠ (٣) زانست بریتی یە لـە ناسینی وردی نەزمە جۆرا وجۆرەکانی هەستی و بوونەوەرەکان ٠ناسینی زانستی کامیە؟ هەرکەس لە ژیانی خۆیدا بە یارمەتی وەرگرتن لە هەستەکان ، لەگەڵ دەوروبەرو مەڵبەندی ژیانی خۆی، بەرەورووی مێ و بەهۆی ئەو ئید راکاتە پـــڕژ و بلاوەیەوە کە لە شتە بەرچاوەکانی دەوروبەری خۆی وەری دەگرێ ، پلەی یەکەمی ناسینی دەمێوی (واتا لەو پلەیە تێپەڕ دەبێ) و تائەندازەیەك بە ناسینـــی هەستی دەگا (٤) ئەم جۆرە ناسینە کە ئامرازی پێویستی ژیانی کردەوەیـــە ، ساکار وسەرەکی و جوزئی یەو خاوەنی لایەنی عاتیفی بەهێزە ٠بەلام مرۆڤ بـــە تێپەڕکردنی پلەی دووهەمی ناسین،دەتوانێ ئید راکاتی خۆی ، بکا بە قاپـــۆری چەمك ( مفهوم ) (٥) واتا بە چەمك بگا و ناسینی خۆی قووڵ و بەرین بکا و

---

(١) ــ ئاریانپوور ،پێشوو ،بەرگی ٦ (٢) ــ المعجم الفلسفی المختصر ، پێشوو بەرگی ٣٦٢ (٣) ــ هەر ئەم سەرچاوە بەرگی ٣٠٩ (٤) ــ بـــە پاپێ کەوتن لەرەنگی شت بە گوێ دەنگی و بە چێژتن تامی ٠٠٠ تێ دەگـا٠ (٥) ــ مفهوم یەکێك لە شتە بنەڕەتی یەکانی تێکۆشانی فیکری یەو شێوازێکـی پربێژی یە کە بەهۆی ئەوەوە شێوازەکانی تری بیرکردنەوە ( بڕیـــاردان و هەڵسەنگاندن ) بناخەیان دادەنرێ ٠ پترو قووڵتر لە هەست و ئید راك و پێنەگرتن لە ناسینی راستی دا ، شوێنی هەیە ٠٠٠ چەمکەکان بە هـــۆی ووت کردنەوە لە مادەوە کە بەهۆی ورد بینی و لێکۆڵینەوە لە راستی یەکانـــی دەرەوەی زەمین و بەرەو دەروون چوون ، تەواو و دروست دەبن ٠٠٠ چەمـك بردە لەسەر کۆمەڵێکی تەواو لە شتەکان هەڵدەداتەوەو بە یەك نـــاو ، کۆمجیان بۆراد ەکێشێ ٠ وەك چەمکی سێو ٠ المعجم الفلسفی المختصر ،پێشوو ٤٧ــ ٤٧٠

له راستی نزیکتر ببێته‌وه ٠ناسینێکی ئاوه‌ها ، که زۆر له راستی یه‌وه نزیکـــه پێی د ه‌گوترێ زانست ( علم= Science ) مه‌به‌ستی زانـــــت وه‌ك مه‌به‌ست و ئامانجی هه‌موو تێکۆشانێکی مرۆڤ ، بریتی یه له زاڵبوون به‌ســـه‌ر راستی دا و هاسان کردنی باری ژیانی مرۆڤ ٠

زانست واتا ناسینی یاساکانی راستی ، ئه‌و هێزو توانایه به مـــرۆڤ ده‌دا که بتوانێ به‌رنامه‌و نه‌خشه دابنێ و له‌پێش‌دا بی‌بینێ و به‌ســــــ راستی‌دا زاڵی‌بکا ٠ له‌به‌رئه‌وه ناسینی راستی ته‌نیا به هۆی ئه‌زموون واته خۆتێ هه‌ڵقورتان له راستی ( شته‌کانی ده‌ره‌وه‌ی زه‌مین ) ده‌گونجـــــ وه‌ده‌ست ده‌که‌وێ ، گشت زانسته‌کان ( زانستی بیرکاری ، فیزیك و ژیـــن ناسین و کۆمه‌ڵایه‌تی ) له‌سه‌ر ئه‌زموونی ورد بناخه‌یان دانراوه ٠ له‌م باره‌دا ده‌کرێ بگوترێ که زانست بریتی یه له ناسینی راستی له رێگای ئه‌زموونه‌وه ٠

له‌مه‌دا گومان نیه که ئه‌زموونی زانستی سیازی به لێکۆڵینه‌وه ( تبییـــن = Explanation ) هه‌یه‌و به‌م‌هۆیه‌وه شێوه‌ی بیرکردنه‌وه یان فه‌لسه‌فه‌ی زانایان ، له ئه‌زموونی ئه‌وان دا ، شوێنه‌واری هه‌یه ٠ هه‌ربۆیه ئه‌بێ بلێیــن که زانست بریتی یه له ناسینی راستی له رێگای ئه‌زموونه‌وه به پاڵپشت دانی‌به فه‌لسه‌فه‌یه‌که‌وه ٠

ئه‌وه‌ی ده‌زانین که ناسین له هه‌رپله‌و بارێك دا و سه‌باره‌ت به هـــه‌ر شتێك ، دوو لایه‌نی لێك جیانه‌کراوی هه‌یه ، یه‌که‌م ـ لایه‌نی ئید راکـــی ٠ دووهه‌م ـ لایه‌نی عاتیفی ٠ لایه‌نی ئید راکی هه‌واڵی مه‌ڵبه‌ندی ژیـــــان راده‌گه‌یه‌نێ و لایه‌نی عاتیفی باره ده‌روونی یه‌کانی چوارچێوه‌ی لـــــه‌ش ، نیشان ده‌دا ٠

به ناچار بمانه‌وێ و نه‌مانه‌وێ ، ناسینی زانستی هه‌رد ووك لایه‌نه‌کـــه ده‌گرێته‌وه ، ئید راکی ته‌واو نیه ، به‌ڵکوو لایه‌نی عاتیفیشی تێدایه ٠ بـــه‌م حاڵه‌ش چونکه ناسینی زانستی له ناسینی هه‌ستی ( حـــسی ) دووره و له‌سه‌ر چه‌مکه داماڵراوه‌کان بناخه‌ی دانراوه ، لایه‌نی عاتیفی له‌ودا به‌هێـــز نیه ٠

زانا تێ‌ده‌کۆشێ تا ئه‌و راده میه که ده‌توانێ ، دوور له چلۆنایه‌تـــــی ده‌روونی چوارچێوه‌ی له‌ش ، مه‌ڵبه‌ندی ژیان و ده‌وروبه‌ری خـــــــۆی هه‌ڵسه‌نگێنێ و بیناسێ ٠ به واتایه‌کی‌تر ، زانست پێ له‌سه‌ر لایه‌نی چه‌ندی

راستی د اد ەگرێ • کەوابوو دەتوانین لە ناسەندنی زانست دا بلێیـــن ، ناسینی راستی لە رێگای ئەزموون و بە پاڵپشت دان بە فەلسەفەیەکەوەو بـــە بێ داگرتن لەسەر چەند ی بەد ی د ێ • ( ١ )

لەنێوان لایەنی ئیـ رکی و لایەنی عاتیفی ناسین د ا ، پێوەنــــدی و نیسبەتێك هەیەو ئەمەش سەبارەت بە گشت زانستەکان یەك نیە ، هەرچـــە لایەنی ئید راکی زانستەکانی بیرکاری ، لە زانستەکانی تر زۆرترە • بەڵام هیچ زانستێك نیە کە لایەنی عاتیفی تێدا نەبێ • واتا لە حاڵەتەکانی چوارچێوەی لەش، وانین لە سەربەخۆبن • تەنانەت زانستەکانی بیرکاری کە لە گشـــــت زانستەکان ، ئید راکی تر یان د اماڵراوترن ،بریتین لە تێکۆشانەکانی مرۆڤ و پێوەندییان بە ژیانی د ەروونی یان عاتیفی ئێمەوە هەیە •

زانست وەك هەر ناسینێکی تر لە د رێژایی وتێپەربوونی کات د ا ، بـــە پێی نیازەکانی مرۆڤ ، ئاڵ وگۆڕی بەسەرد اد ێ و بەهۆی زیاد بوونــــــــی ئەزموونی بەرەکان ، هەمیشەو بێ پسانەوە ، ورد ی و بەرفراوانی زیاتریـــــك بەخـــۆوە د ەگرێ • کەوابوو زانست جۆرێك ناسینی نیسبی یە یان لە ئاڵ وگـــۆڕ د ایە • بەڵام ناسینی زانستی ، لە کرد ەوەد ا لەگەڵ راستی ، یـــــــــەك د ەگرێتەوە • کەوابوو لە هەمان کات د ا کە نیسبی یە ،راستی جێگای متمانـــەو بەنرخ و بەرێڵاو ( مطلق )ە • بە واتایەکی تر : زانست ئەو پلەیە کە لـــــــــە کرد ەوەد ا لەگەڵ راستی، یەك د ەگرێتەوەو بەرێڵاو و بێ سنوورە •

زانست و کرد ەوە پێکەوە بەستراونەتەوە • بارود ۆخی کرد ەوەیی ژیان کـــە لە حاڵی ئاڵ وگۆڕد ایە ، هەمیشە د نەی مرۆڤ د ەد ا تا زانستی تازە وەد ەست بێنێ و شتی زۆرتر فێربێ • ناسینە تازەکان ئەبنە هۆی ئاڵ وگۆڕ لە بارود ۆخی

---

( ١ ) ـ پاش بەرەورووبوون لەگەڵ شتەکانی د ەوروبەر ، پاش رەنــــگ د انەوەیان لە زەین د ا وکارکرد نی زەین لەسەر ئەو وێنانەو د انەوەیان بــــە جیهانی د ەرەوەی زەین و تێپەرکرد نی پلەکانی تێگەیشتن ( احساس، تصور ادراك ) و گەیشتن بە چەمك و کەڵك وەرگرتن لە زانستی ژیرێتی لە رێگـــای ئەزموونەوە ، بە لەبەرچاوگرتنی فەلسەفەیەك پێوەندییە د ڕێژخایەن و پابەر ـ جاکانی د ەروونی ماد ە ، د ەزاند رێ و ئەگەر ئەم زانستە ورد و قووڵ بـــوو ، پێی د ەڵێن • ( علم = Science ) د انەر •

کرد ەوەیی دا (واتا ناسینە تازەکان ، بارودۆخی ژیان دەگۆڕن) ٠

ناسینی هونەری :

هەروەك لە باسی زانست دا گوترا ، ئەگەر بۆ گەیشتن بە راستی پێ بنێینە پلەی ناسینی ژیریێژی و بە وتەیەکی تر پێ لەسەر لایەنی ئید راکی ناسین دابگرین ، ناسینی زانستیمان دەست دەکەوێ و لەگەڵ چەندیدا بەرەورووە مبین و لەگەڵ ئەودا سەروکارمان دەبێ ٠ ئێستا ئەگەر لە پلەی یەکەمی ناسین دا واتا ناسینی هەستی ( احساسی ) هێندێك راوەستین و پێ لەسەر لایەنی عاتیفی و دەروونی دابگرین ، بە ناسینی هونەری ، دەگەین ٠ هەروەك زانا بە پاڵپشت دان بە چەمکە گشتی و داماڵراوەکانەوە، راستی دەرەوەی زەین بە پێی ئیمکان و گونجاوی لەبارەکان ( حالات )ی چوارچێوەی لەش داد ەماڵێ و جیای دەکاتەوەو بە زمانی چەند ایەتی دەی ڵێتەوە ، هونەرمەند و خاوەن هونەریش بە پاڵپشت دان بە وێنە جوزئی یە زەینی یەکانەوە ، تا ئەندازەیەك ، راستی دەروونی لە راستی دەرەوەیی هەڵدەماڵێ و جیای دەکاتەوەو بە زمانی چلۆنی رای دەگەیەنێ٠ هەربۆیە لە کاروباری هونەری دا ،چوارچێوەی راستی دەروونی ، پتر لە یاساکانی راستی دەرەوەیی ، سەرنجی دەدرێتێ و بە پێچەوانەی ئەو لە کاروباری زانستی دا ، راستی دەرەوەیی ، پێی لەسەر دادەگیردرێ ٠ لەم حاڵەش خاوەن هونەر وەك زانا ،بۆ ناسینی یەك گرتوو لەگەڵ راستی ، تێ دەکۆشێ ٠ هەروەها بێجگە لە زاڵ بوون بەسەر راستی دا ئامانجێکی نیە ٠ ناسینی هونەری وەك ناسینی زانستی پێویستی بە ئەزموون (تجربە) هەیە ٠ هەروەها ئەزموونەکانی خاوەن هونەر ، لە ماکەو زەمینەی فەلسەفی ئەو ، رەنگ دەگرن ٠ لە ئاکام دا دەکرێ ئاوەها هونەر بناسێندرێ : هونەر بریتی یە لە جۆرێك لە ناسینی راستی لە رێگای ئەزموونەوە ، بە پاڵپشت دان بە فەلسەفەیەك و بە پێ داگرتن لەسەر چلۆنی ٠

نیسبەتی عاتیفە سەبارەت بە ئید راك لە تەواوی هونەرەکان دا ، وەك یەکە ، هەروەك لایەنی عاتیفی مۆسیقا لە هونەرەکانی تر زۆرترە ٠ بەلام گومانی تێدانیە ، هونەری وا لە ئارادانیە کە بە تەواوی لە راستی

دەروەمی ،نامێ بێ · هەروەها هیچ زانستێکیش نیە کە لە راستی دەروەمی ، هیچ هەوانێك بلاو نەکاتەوە · تەنانەت موسیقا کە لە گشت هونەرەکـــان عاتیفی ترە ، خۆی نیسبەت بە چوارچێوەی لەش، هۆیەکی دەروەمیەو بێ ئەملا و ئەولا پێوەندی بە راستی دەرومیەوە هەیە · هونەری سەد لە سەدا فوول و دەروونی (Subjective) (ئەگەر هەبێ) فرمۆنێکە لە تێکۆشانـی لەشی ، لە دەرەوەی چوارچێوەی لەش دا ، بەدی دێ و خۆی دەنوێنـێ و هیچ کات بۆیە دیاری نابێ و ناناسێندرێ ·

ناسینی سەد لەسەدا بێ‌خەوش یان دەروەمی (Objective) (ئەگەر بگونجێ) برینی یە لە هاوتایی لە هاتووچو و جموجۆلێکـــی بێ سەرەوبەرە کە بە هیچ جۆرێك سەرنجی ئێمە بۆلای خۆی راناکێشـــێ · هونەریش وەك زانست، بە پێی بارودۆخی ژیانی مرۆڤ، ئاڵ وگۆڕی بەســەر دادێ و لەهەرکاتێك دا ،ناسینێکی تازە بەدەستەوە دەدا · ئـــــەم ناسینەش بەنۆرەی خۆی ، دەبێتە هۆی پێك هاتنی بارودۆخێکی کردەومیــی تازەو لە ئاکام دا سەرئەکێشێتە لای گۆڕانی ژیانی کۆمەلایەتی‌یەوە · زانـا و زانیار لەژێر تیشکی راستیێ دەروونی دا ، بەراستی دەرەوەی زەمین دەگــا · خاوەن هونەر لەژێر سێبەری راستی دەرەوەی زەمین دا ، راستی دەروونـــی دەناسێ ، هەردووکیان پەردە لەسەر راستی هەڵدەدەنەوە ، یەکیان بـــە دوای راستی کردەومی‌دا دەگەڕێ و ئەوی‌تریان ، خوازیاری راستــــی هونەری یان جوانیە · مرۆڤ لە کردەوەدا بە گۆڕینی مەلبەندی ژیان ، بـــە ناسینی دەگات و بەهۆی ناسینی ، خۆیشی ئاڵ وگۆڕی بەسەرداد دێ · ئـــەو کات کە خۆی گۆڕا ، بە بۆچوونێکی تازە ، ئەچێتە بەرەوپیری مەلبەنـــدی ژیانەوەو لە ئاکام دا لەودا چەند ئاڵ وگۆڕی تازە پێك دێنێ و بە چەنـــد ناسینی تازە دەگاو جارێکی تر خۆی ئاڵ وگۆڕی بەسەرداد دێ ·

زانا بۆ ناسینی چلۆنایەتی ئەو ئاڵ وگۆڕە تازانەی کە بەهۆی کـــردەوەی مرۆڤەوە لە راستی‌یەکان دا خۆیان نواندوە ، هەنگاو هەڵدەگرێ و خـاوەن هونەریش بۆ ناسینی هومێد و ئارەزووەکان یان ئەو وێچوونە تازانەی کـــە ئەبنە هۆی چەند ئاڵ وگۆڕی تازە لە مرۆڤ دا ،دێتە گۆڕەپانی تێکۆشـــان · زانا بەهۆی ئەو راستی‌یەی کە هەیەو لەبەردەستی دایە، مرۆڤ بـــۆ بەرەوڕووبوون لەگەڵ رووداوەکانی داوڕۆژدا ، ئامادە دەکا · خاوەن هونـەر

بەهۆی ناسینی بەتوانا ( بالقوە-ئەوەی کە دەتوانێ ببێ ) ڕێگا دەس نیشان دەکا و لەپێش دا داڕۆژدەبینێ . مرۆڤ بە پێچەوانەی گیان لەبەرەکانی تر ، لەماوەی ژیانی کردەوەیی دا ، ڕاستی دەگۆڕێ ،بەهۆی گۆڕینی ڕاستی یان شتەکانی دەوروبەری ، کە لە دەرەوەی زەینی دان ، شتەکان دەناسێ و بە ناسینی یاساکانی ، ڕێگای زاڵ بوون بەسەریان دا ، دەدۆزێتەوەو خۆی لە ستەمی بێ بەزەیی سروشت ، ڕزگار دەکا . کەوابوو کاری مرۆڤ کە ماکەی ناسینە ، خۆی خۆی بەدەست هێنانی ئازادی یە . کاری زانستی دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ بەسەر زۆرو فشاری دەرەوەیی دا زاڵ بێ و کاری هونەری دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ لەگەڵ پێداویستی دەروونی ، هاوئاهەنگ بکا و لە ئاکام دا بەسەری دا زاڵی دەکا . لەم بارەوە زانست بریتی یە لە ڕاگەیاندن و شی کردنەوەی ئازادی مرۆڤ لە جیهانی ئیدراکەکان دا و هونەر بریتی یە لە گۆزانی ئازادی مرۆڤ لە جیهانی عاتیفەکان دا . هونەر لەباری بیروبۆچوون دا ، کەسایەتی ئەنجامدەری ناسین ( مرۆڤ ) لە پابەرجایی و ڕاوەستانی تێکۆشەرانە لە چوارچێوەیەکی ( پتەو )دا ،ئەکاتە خاوەن بەش و لە جیهانی کردەوەدا ، بابەتی ناسین ( ڕاستی دەرەوەی زەین ) ، ڕێك و پێك دەکا ، زانست لە جیهانی بیروبۆچوون دا ، کەسایەتی ئەنجامدەری کار (مرۆڤ ) ئەباتە ژێر چوارچێوەیەکی تێگەیشتن و ئیدراکی و لە جیهانی کردەوە دا ، چوارچێوەیەکی ئیدراکی بەسەر بابەتی کردەوەدا ( ڕاستی دەرەوەی زەین ) دادەسەپێنێ . هاوئاهەنگی یان پێکەوە ژیانی زانست و هونەر لێرەدا یە کە ئەنجامدەری کار ،هەر ئەو ناسینەرەیەو بابەتی کردەوە هەر ئەو بابەتی ناسینە . ئەم هاوئاهەنگی یان هاوژیانی یەی زانست و هونەرە کە دەرەتانی خوێندن بە فەلسەفە دەدا .

## ناسینی فەلسەفی :

گشت ئێمە لەماوەی تێپەڕکردنی ژیانمان دا بەهۆی کۆگایەکی تێگەیشتن و ئیدراك و عاتیفەوە کە وەدەستی دێنین ، ئەبینە خاوەنی بۆچوونێکی گشتی کە هەموو ناسینەکانی ئێمە دەگرێتەوە .بەم بۆچوونە گشتی یان جیهان بینینە ( Weltanschauung) دەکرێ بڵێین " فەلسەفە " . وشەی

فەلسەفە ، پێچەوانمیەکە لە وشەی یونانی فیلوسوفیا (Philosiophia) بە واتای " دۆستی زانست " . بەلام لە مێژووی زانست دا ، ئەم وشەیان لە واتای کۆنی زانستەکانی تاقە کەسێك یان گروپەك یان کۆمەڵێك یـــــان دەورەیەك ، بەکارهێناوە . هەر مرۆڤێك چ بیەوێ و چ نەیەوێ ،بۆخۆی شێوەی جیهان بینی یان فەلسەفەیەکی هەیەو چۆنیەتی فەلسەفەی ئەو ، بـــــە ناسینەکانی ئەوەوە ، پێوەندی هەیە یان بە گشتی پێوەندی بە بـــارودۆخ و داخوازەکانی ژیانی ئەوەوە هەیە . لەبەرئەوە هەر شێوە ناسینێك کەم یـــان زیاد ، لەراستی ، هەواڵ بلاودەکاتەوە ،فەلسەفەی هەرکەسێك تارادەیەك راست و دروستە . لەگەڵ گشت ئەمانەش دا ،بەپێی باو ( بەکــــردەوە ) دروست ترین فەلسەفەکان ، هی فیلسۆفەکانە . لە مێژووی ژیانی مـرۆڤ دا، ئەو کەسانەی کە زانیاریەکانی خۆیان بەوردی هەڵسەنگاند وەو جیهـــان ــ بینی خۆیان ، لەسەر بناخەی چەند ناسینی زۆر دروست بنیات نـاوە ، ناویان نراوەتە " فیلسوف " . کردەوەی فیلسوفەکان هەمیشە بریتی یە لــــە ریك و پێك کردن و گشتی کردنی زانیاریە زانستی و هونەریەکانی خولی خۆیان ( ئەوەی لە ژیانی ئەوان دا هەبوە ) . بەم جیاوازییە کە لـــــە رۆژەکانی پێشوودا ،فەلسەفە تەنیا بەگشتی کردنی دەسکەوتەکانی زانستـی و هونەری ، وازی نەدەهێنا ،بەڵکوو بەکردەوە ئەرکی زانست و هونەری ئەخستە ئەستۆی خۆی .

فیلسوف هەم لە زانستە جۆرا وجۆرەکانی زانست و هونەردا کاری دەکردو هەم ئاکامەکانی لێکۆڵینەوەی خۆی بەشێوەی گشتی رادەگەیاند و فەلسەفـــەی دروست دەکرد . بەلام پاش خولی لەدایك بوونی زانست ( رێنسانس ) لە ئووروپادا کە دەرمتانی ناسین بەرفراوان بوو و پسپۆری زانستی هاتـــــە کایەوە ،وردەورد ە ، زانستەکان سەربەخۆبوون . پاش ئەوە تەنیا ئەرکێك بـــۆ فیلسۆف بەجێما ، ئەویش بـریتی بوو لە پەرەپێدان و گشتی کردنـــــی زانستەکان و هونەر . هەروەك ئەورۆ بەپێچەوانەی رابردوو ، فەلسەفە نـــــە کۆکەرەوەی زانستەکانەو نە لە سەرەوەیانە . ئێستا ناسینی فەلسەفی،ناسینێکە کە لە تێکەڵ کردن و گشتی کردنی زانیاریەکانی زانستی و هونەری ئـــەم چەرخ و کاتەی ئێمە وەدەست دێ و بۆ تێگەیشتن لە سروشت و پلەو رێگـــا ( پڕ لە کەند ولەندی ) مرۆڤایەتی ، پێویستە . بە جۆرێك کە دەزانین هیــچ

تاسە کەسێک نیە کە خاوەنی فەلسەفەیەک نەبێ. کەوابوو بە پێچەوانەی گومانی
زۆربەی زۆری خەڵک، مەسەلەکە وا نیە کە ئایا فەلسەفەمان هەبێ یان نا؟ بەڵکوو
مەسەلەکە ئاوەهایە کە تا چ ڕادەیەک دەتوانین فەلسەفەی خۆمان بە دروست
بزانین و بایەخی پێوە بدەین. فەلسەفەی خەبەرزراو، فەلسەفەیەکە، لە دوایین
دۆزینەوەکانی زانستەکان و هونەری هاوچەرخ یان لەم کاتەدا، سەرچاوەی
گرتبێ. کاری فیلسۆفی ئەم چەرخە تەنیا ئەوەیە کە بە یارمەتی زانستەکان و
هونەرە جوراوجورەکان، بۆچوونی گشتی دروستێک پێک بێنێ و خەڵک بۆ
راس و ڕێس کردنی جیهان بینی خۆیان، هان بدا و بەم جۆرە ببێتە هۆی
باش کردن و بەرەوپێش بردنی باری ژیانی کۆمەڵایەتی.

لەبەر ئەوە ناسینی فەلسەفی گشتی یە، هەم راستی دەروونی و هەم
راستی دەرەوەی زەین، دەگرێتەوە. بە وتەیەکی تر، هەم ناسینی زانستی
تێدایەو هەم ناسینی هونەری. لایەنەکانی جوانایەتی و چەندی راستی کە
لە زانست و هونەردا لێک جیا دەبنەوە، لە فەلسەفەدا، یەک دەگرنەوە.
ناسینەکانی شتەکانی دەرەوەی زەین (راستی) (ئافەکەسی، کۆمەڵ،
سروشت) لە بەهۆی هێزی زانست و هونەرەوە بەدی دێن، تێپەڕبوو بە
نیسبەت [illegible] (مطلق) نین. ئەوکات کە ئەم ناسینانە بە باری
"خیال" ژیریی، پێکەوە پێوەندی بدرێن و ڕێک و پێک بکرێن و باری
گشتی بگرنە خۆیان، ناسینی فەلسەفی دێتە کایەوە.

ناسینی فەلسەفی لە ژیانی مرۆڤدا، گرنگی زۆری هەیە، چونکە لە
لایەک رێنوێنی کردنەوەی مرۆڤەو لەلایەکی ترەوە ئەرکی ڕێبەرایەتی زانست و
هونەر وەئەستۆ ئەگرێ. هەرکەسێک بە پێی فەلسەفەی خۆی و ڕێگا و شوێن و
داب و نەریتی ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێ و تێکۆشانی خۆی دەست پێ دەکا.
خاوەن هونەر و زانا بە پێی ناسینی فەلسەفی خۆیان، سەرنجی جیهان
ئەدەن و ئەم هەبوونە بان و بەرینانە شی دەکەنەوە. کەوابوو ناسینی
فەلسەفی وەک ڕێورەسمێکە، کە هەم ڕێگا و شوێنی کەسێکی ئاسایی دیاری
دەکا و هەم بە زانا و خاوەن هونەر یارمەتی دەدا، تا بەدوای شتە
نادیارییەکاندا، بگەڕێن و بۆشاییی زانیارییەکانی خۆیان پڕ بکەنەوە.
هەرئەو حاڵەدا لە فەلسەفە لە ناسینەکانی زانستی و هونەری سەرچاوەی
گرتوە، زانست و هونەر بەرەوپێش دەبا. هەر بەو جۆرە لە زانستەکان،

هونەرەکان بەرەو پێشردەچی و بە دۆزینەوە تازەکان دەدەن و شتە نادیاریەکان دەدۆزنەوە ، ئەمێشە هۆی ئەوە کە بە شێوەی پێویست ، بە چەند سنی شتی بکەن و چەند فەلسەفەی تازە سەرهەڵدەن • ئەو فەلسەفە تازانە ، هەروەک بنچ و بناوانی حۆبان دەبەستن ؛ ئەمە هۆی ئەوە لە زانست و هونەرەکان ، بەرەو ناوچە نەناسراوە تازەکان ، بەرەوپێش بەرن و ببنە هۆی تۆزینەرەو دۆزینەوەی شتی تازە • ئەوا بوو هەر ئەندازەفەلسەفەی تایبەتی زانا ، یان خاوەن هونەرێك ، راستتر بێ ، ناسینی زانستی یان هونەری ئەو ، قوڵتر و قورستر دەبێ •

## پێوەندی یەکانی فەلسەفەو زانست و هونەر :

فەلسەفە بەرهەمی زانست و هونەرە • زانست ناسینێکە ، لە پاڵی بە چەمکە گشتی یەکانەوە • داوەو خاوەنی ئەیەنی ئید راکی یەکی بەهێزە • هونەر بە پێچەوانەی زانست ، زیاتر راستی دەڕوێنی ، نەك راستی دەرەوەی زەین ، وەبەرچاو ئەکرێ • هونەردان بەزانست دادەنێ ( پێی لەسەر دادەگرێ ) ، چونکە زانست ، پەنیوانی هونەرە ، چونکە ناسینی زانستی تازە ، چەند عانیفدی تازە دەخوڵقێنێ • ئەم دووانە بەیەکەوە پێوەندی یان هەیەو پێکەوە بەرەوپێش دەچن ، چونکە هەردووکیان ، بە یەك دوا مەبەست ( مضمور نهایی ) لە تامێزی ئۆمەڵ دا ، پەروەردە دەکرێن •

جاری وایە ناسیەکان پێکەوە کۆدەبنەوە " مثنوی جلال‌الدین بلخی وکمدی الهی دانتە" هەردووکیان چەند توخمی زانستی و فەلسەفییان تێدایەو داستانی جەنگ وئاشتی " تالستوی " و ئتێبی : " خوشەهای خشم " ( ١ ) ئەستین بیك ( STeinbeck ) لە ریزی ئۆمەڵناسی دان •

" ناصرخسرو قوبادیانی " شاعیر ، نووسەر ، مێژووزان و فیلسوفە •

" لئونارد و داوین چی " وێنەگر ، پەیکەرتاش ، میعمار ، ئەندازیار ، لەش‌ناس بۆەو بیرکاری زانیوە • بەگشتی لە خولی ئەودا واتا ( خولی

---

( ١ ) ــ خوشە = کوڵی ئەم ــ خشم بە واتا قینە • دانەر

ئەدا ئیت بوونی ڕاست لە نووروویادا ) هەروەها بڕەی " تخیل "ی ڕاستی .
هەروەها بە خوێنەکانی دوایی دا بارودۆخەکە ئەکەم یان زیاد ، هەر بەو
جۆرەیە .

زانا و خاوەن هونەر هەردووکیان سێبو کۆمەڵدا دەژین و بەپێی
بارودۆخ و خوازیاریەکانی کۆمەڵ ، لایەنگری دەکەن . پیازەکانی خوێنی
خۆیان دەماسن ، پاشان هەرکامەیان لە ناوچەی کاری خۆیان دا ،
تێ دەکۆشن ، ئامرازی بە ئاکامگەیاندنی ئەو نیازانەو جێبەجێ کردنیان
بدۆزنەوە . زانا و خاوەن هونەر هەردووکیان بابیان داوەتەوە بە میراتی
ئەزمەنگی کۆمەڵی خۆیان و کۆمەڵەکانی ترەوە . ئەم میراتە ڕووە ڕاستی،
هونەری ، فەلسەفی و ئایینیەکان و هی تر ، دەگرێتەوە . هەردووکیان
تێ دەکۆشن کە بە پشتیوانی ئەم میراتە ، پێداویست بەرەو ئامانجی خۆیان
بکەنەوە . گەشت توخم و عونسورەکانی داب و نەریتی تەواو ، کەوتوونەتە
ژێر دەسەڵاتی زانا و خاوەن هونەرەوە . هەرکامیان بە دەست دێت لەو
عونسورانە سیاسیان هەیە . بۆ نموونە زانا دەتوانێ بێ ئەمەر عونسورە
ئایینی و داب و نەریتیەکان دابڕێ . هەروەها خاوەن هونەریش بێ
ئەسەر عونسورە ڕاستیەکانی داب و نەریت ، دابڕێ و ناتوانێ پێدا بچێ .
بەکورتی زۆربەی ئەو عونسورانەی کە سەرنجی خاوەن هونەر ڕادەکێشن ،
پەیوەندیان بە ئیانی کەسییەوە هەیە . بەڵام زانا پاڵ بە عونسورە
گشتییەکانەوە ئەدات .

بەهۆی ئەو تێڕوانینەی کە زانا و خاوەن هونەر ، تەماشای میراتی
ئەزمەنگی دەکەن ، دەرەتانێک پێک دێ و ڕێگایەک بۆ گەیشتن بە ئامانجیان
پەیدا دەبێ و بیرێک لە زەینیان دا ، ئیشک دەداتەوە . هەرچەند کاری
زانا بە شێوەیەکی گشتی وەک کاری خاوەن هونەر وایە ، بیری هەرکامەیان لە
ئاڕۆڕێکی تایبەتی دا جێ دەگرێ . زانا لە قاپێکی چەمک دا بیر دەکاتەوە و
خاوەن هونەر بەهۆی وێنە زەینیەکانەوە ، بیر دەکاتەوە و ئەمەش گرنگترین
جیاوازی ئەو دووکەسەیە . ئەم جیاوازییە دەبێتە هۆی جیاوازییەکی تر .

چەمک ( مفهوم ) بریتییە لە بیرێکی پتەو کە لایەنە هاوبەشەکانی
یەک دیاردە ، ئەگرێتەوە و بەم هۆیەوە ، گشتییە . وێنەکان ( ئەوانەی لە
زەیین دان و ساکارن ) بیرێکی ساکارن و تاقەکەسێکی دیاری کراو دەگرنەوە،

( هەرکامە بۆ خاوەنی خۆی ) . هەرچەند بەش بەش و جوزئین . چەمک هەڵماڵراو ( انتزاعی ) و وێنەکەو وێنە ، هەستی و عاتیفی یە . چەمک هەمیشە گشتی یەو ئیفرادی جوزئی ئەگرێتەوە . وێنەی زەینی هەمیشە جوزئی و ماکەو زەمینەی هەمووی چەمکی گشتی یە ... خاوەن هونەرو زانا هەردووکیان بۆ شی کردنەوەی بیری خۆیان ( وێنەی جوزئی و چەمکی گشتی ) لەدوو ڕەوش ئامرازە ڕواڵەتی یانەی کە لە تیۆری دەسەڵاتیان دایە ، کەڵک وەردەگرن . لە مێژوو سێبەرو ئامرازەکانی پێشووی کۆمەڵی خۆیان دا ، بڕیان وایە هێندێکیان بە کەڵکن و بەشێکی مەبەستی خۆیان و هاوئاهەنگ لەگەڵ ئەو مەبەستە ، ئاڵوگۆڕ لەوان دا پێک دێنن و بەم جۆرە چەند شێوەو ئامرازی تازە ، لەسەر میراتی ڕابوردووان و پێشینیان زیاد دەکەن . زانا و خاوەن هونەر تێدەکۆشن تا بەهۆی چەند شێوەو ئامرازێک لە یەکیان دێنن ، بیری خۆیان بە شێوەیەکی ڕوونترو پڕبە پێستیان ، نیشان بدەن .

زانای گەورە ، بەشێوەیەک چەمکی گشتی خۆی تەڵخ دەکا کە هەموو لایەکی ورد و بەش بەش بگرێتەوە . هەروەها خاوەن هونەری گەورە ، وێنەی ورد و جوزئی خۆی وا پەروەردە دەکا ، لە نزیکەی تەواو پڕ بە پێستی وەتەنەوە بێ .

ئامێری زانا ، ئامێرێکی ڕێژەیی یە ، هەروەک شی کردنەوەو ڕاگەیاندن بیتی ، تیۆری یە . هەڵماڵین ( انتزاعی ) و یەکانگرتن و شی کردنەوەی تێدایە . ئامێری خاوەن هونەر ، ئامێرێکی هەستی و حیسی یە ، هەروەها ڕاگەیاندنەکەی هەستی یەو لە ڕاستی دا خەمڵ پەسند و قەڵا نینەوەیە . ( ١ ) وەک باسمان کرد ، فەلسەفەی زانستی دەرنیشانی شوێنی مرۆڤ لەسەر نەخشەی جیهان و لەناو گەردوون . دەکا بەوەی مرۆڤ بەشێکە لە سروشت ، پلەیەکی تایبەتی لە پێنەلانی دروخێکی تایبەتی مادەو لە پلەیەکی سەرکەوتن و پێشکەوتن دایە . واتا جیا لە سروشت و گەردوون ، دروست نەبوە . ئینجا لە مرۆڤ بەشێک بێ لە سروشت ئەبێ یاساکانی سروشتی بە سەریدا بسەپێت یان ئەوە کە مرۆڤیش وەکوو هەموو مادەکانی دیکەی گەردوون لەناو یاسا و بیردۆزەکان دا ، ئەژی و پێش ئەکەوێ . واتا یاسا و

---

( ١ ) ــ امیرحسین آریانپور ، پێشوو بەرگی ١٥ ــ ٩

بیروزە ڕاستی یەکان فەرمانڕەوایی ئەکەن ،نەك بە ویست و ئارەزووی ئێمە .
ئێمە هەرچەند حەزبکەین ، ڕۆژ بە ئەستووی ئەسەرمان ڕاناوەستێ ،زەوی لە
جوولانەوە دایە ، بەدەوری خۆی و بەدەوری خۆریش دا ، حیساب بۆ
ویست و ئارەزووی ئێمە ناکا . ( ١ )

## پێوەندی زانست و فەلسەفە :

هەزاری فیلسوف لە زانیاری و زانست ، ئەو بە هەڵەدا دەبا و وای لێ دەکا نەتوانێ بهێنێ و ڕاستی یەکانی گەردوون بدۆزێتەوە . هەروەها ویست ، گوێ نەدانی فەلسەفە ، لەلایەن زاناوە ، ئەبێتە هۆی ون کردنی ئامانجی دۆزینەوەکان ،لە پێناوی بەرژەوەندی مرۆڤ دا ...

تێگەیشتن لە گەردوون پێمان دەڵێ : ئەو شتە لە ئەنجامی ئەوەوە و لەبەر ئەوە ،فەرما وەو فلان شت بەم شێوەیەو لەبەر ئەوەو ئەمە ڕوو دەدات . ئەو تێگەیشتنەش بریتی یە لە دۆزینەوەو ناسینی بیروزو یاسا زانستی یەکان . ئەوانەی هەموو مادەکانی تێدا ئەجوولێنەوەو پێی دا ئەڕۆن و پێش ئەکەون . ئینجا کە تێگەیشتن لە گەردوون بریتی بێ لە دۆزینەوەی بیروزو یاسا زانستی یەکان و ئەوانیش بریتی لە پێوەندی یە بنەڕەتی یەکانی نێوان مادەکان ؛ ئەوە پێویستە لەپێش دا لە ناوەڕۆکی خودی مادە ، تێ بگەین . لەم تێگەیشتنەو دۆزینەوەی بیروزی و یاساکان ،نەك هەر پێویستی یان بە زانست هەیە ، بەڵکوو خۆیان لە جیهانی زانست دان ، لقەکانی زانست وەك فیزیك و کیمی و بایۆلۆژی و هتد ... لێیان ئەدوێت ، چونکە تەنیا زانستە ناوەکی مەسەلەکانمان پێشان ئەدا و جوولانەوەو پێوەندی یە بنەڕەتی یەکانی مادەش لە جەوهەری مادەدان . ئەمە هێڵی لە یەك دانی فەلسەفەو زانستە . واتا ئەمانە دوو هێڵن و هەریەکتری ئەبڕن ، کە لە یەکتریان دا ،مانای وایە نوقتەی هاوبەشیان هەیە . لەو نوقتەیەوە فەلسەفە هەناسەی خۆی لە زانست وەرئەگرێ و زانست ئەکات بە بناخەی خۆی و خۆی لەسەر زانست دا ئەڕێژێ . زانستیش خۆی لە بەرگی فەلسەفەدا ــ

---

(١) ــ ئاشتی فەلسەفەو زانست ، جەلال دباغ ، پێشەوە ، ل ١٢ ــ ١٤

کێت و خۆی نازانێ نەکات .

هەندێ هایدەر بە زمانی مەمانیک بریتی یە لە بنیات دانی هێمــــــی
سەفەی زانست . بەزمانی ئیزیاک بریتی یە لەو مەجالەی کە فەلسەفەو زانــــست
، جودیت د روستی ئەکەن . واتا مەجالێکی هایدەر لە تەجامی تێیەلا ویوونی
هەر دوو مەجالەکەوە ( مەجالی فەلسەفەو زانست ) بەلام بە زمانی ئیمــــی ،
پێتی یە لەو زەمینەیەی لە فەلسەفەو زانست هەردووکیان ، کارێکی تێــــدا
ئەکەن . ( ١ )

فەلسەفەی زانستی روانینی گشتی و تێگەیشتنی زانستمان پــــێ دەدا
رامبەر بە جیهان لەگەڵ پێرەوی سروشتی دا بەرەو پێشەوە ئەمان بـــات .
سا و بیرو زانستی یەکان ، لە هەموو لایەنەکان دا تۆنەکانـــــــــــەوە و
بیان کات بە وزەیەکی ئاراستەکراو . ( ٢ )

زەت وتمان ، ئاسین ئاکامی تێکۆشانی رەنگ دانەوەو سەرلەنــــوێ ـ
دروست کردنەوەی راستی لە هۆشی مرۆڤ دایە کە بە هۆی یاساکانـــــی
ـسەکردنی کۆمەڵ ئەبینە خاوەن مەرج و بە شێوەیەکی لێک جیانەکراوە لەگەڵ
ردەوەی کۆمەلایەتی دا ، پەیوەندی هەیە . لە دوو پلەدا وەدەســـــت دێ ؛
ـەی ناسینی هەستی ( حسی ) و پلەی ناسینی ژیریێتی . لە پلــــــــەی
ئەمدا . مرۆڤ لە لایەنە جۆراوجۆرە دەرەوەیی یەکانی دیاردەکان ئاگــادار
ەبێ . لە پلەی دووهەمدا ؛ بە ناوەرۆکی دیاردەکان و یاساکانـــــــــی
ەنەکردنی و بەرەوپێش چوونیان ، دەگا . ئەو دوو پلەیە ، یەک گرتــــوون ،
هەردووکیان رەنگ دانەوەی یەک جیهانی مادین و لە تێکۆشانـــــــــــــە
ردەوەیی یەکانی ئینسانەکان ، کەڵک وەردەگرن و لە رێگەی ئەندامناسی یەوە
ەرێگای ئاقە دەزگایەکەوە واتا دەزگای دەماری ( عصبی ) ، پێکـــــــەوە
پەیوەندییان هەیە .

مرۆڤ لە سێبەری ناسین دا ، یاساکان یان پێداویستی یەکانی سروشت و
ئیزەکانی سروشت لە چوارچێوەی باراستنی بەرژەوەندی و ویستی خۆی دا ،
ـمخاتە ژێر دەسەلات . . . کەوابوو ناسین کەرەسەی پێویستی گەیشتن بــە

---

( ١ ) ـ جەلال دەباغ ، سالەی فەلسەفەو زانست . . . پێشوو ، ل ١٩ ـ ١٨
( ٢ ) ـ هەمان سەرچاوە بەرگی ٨٠ .

ئازادییە • بە شێوەی یاساکانی پێش پێداویستییەکانی مێژوویی مــــرۆڤ
دەتوانێ لە ئاو و نۆژی لەمەدگرتنی کۆمەڵ دا سەوێن دابنێ •

## راستی ( حقیقـــت )

ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە لە جەدوەلی ئەمەوکردنی وێنە زەینییەکانـــــی ئێمەدا • هەرچەندە بیرکردنەوە لە دەرەوەی ئەمەیە ، هەروەها راستییە ؛ پێویستا دەبێ • ئێستا لەم پرسیارە بکەین کە " راستییە " چییە ؟ دەڵێن : بریتییە لە یەک گرتنەوەی وێنە زەینییەکان لەگەڵ راستییەکانـــی جیهانی دەرەوەی زەین • ئەمەش زۆر دروستە • سەبارەت بەوە کە بڵێین ، بەڵام ئــــەم یەک گرتنەوە بە رێژەیی " جزئی " و ناتەواوە • چونکە دەکەوێتە کە وێنەیەک ، بە هەموو لایەکەوە لەگەڵ جیهانی دەرەوە یەک ناگرێتەوە ، بەڵکوو تەنیا بـــــە بەشی بەش ( جزئی ) ، لەگەڵی یەک دەگرێتەوە • ئەوەش دەکەوێتە سەر زۆر لــــە جیهانی دەرەوەدا هەیە و لە وێنەکانی دا • سەرلەنوێ دروست نابێتەوە • لەم بوارەدا نابێ بڵێین • وێنەکانمان دروست نین • بەڵکوو بە شێـــــوەی بەربڵاو و تەواو و لە هەموو لایەکەوە دروست نین • هەروەها راستەقینـــــە تەنیا خاوەنی یەک وێنە یان هەواڵ ( Proposition ) نییە کـــــە پەیوەندی پێیەوە هەبێ یان نەبێ ، راستی تا پلەیەکی دیاریکراو ، لـــــە سنوورێکی دیاریکراودا و لە چەند لایەنی دیاریکراودا ، بە وێنە یــــان ( Ideas )" یەک پەیوەندی هەیە • هێندێک لەمانە بۆ ئێمە روونـــــن و دەتوانین بە دڵنیایی بڵێین کە راستن • وەک ئەوە خەڵکی ئێران لە ساڵــــی ١٣٥٧ ی هەتاوی دا ، بە دەسەڵاتی شا کۆتایی یان هێنا و ئەمەش راستی ـــ یەکی بەربڵاوە • گیاندارەکان ، بێ خواردن ناتوانن بە ژیان درێژە بدەن ، ئەمەش لەگەڵ راستی یەک دەگرێتەوە • ئەوەندە هەیە ، زۆربەی ئــــەو بڕیاراتەی کە دەیدەین ، بەربڵاو نین • چونکە بە گشتی ئێمە بڕیاراتی خۆمان لەسەر بناخەی شتە سەرەتایی یەکان و شتە روونە بێ ئەملا و ئەولاکان دادەنێین زۆربەیان چ سەبارەت بە راستی یە تایبەتی یەکان و چ بۆ ئاکام وەرگرتنــــە گشتی یەکان ، دەکەوێتە بۆ چەند مەبەست و ئامانجی دیاریکراو بـــــە ئەندازەی پێویست دروست بن • بەڵام بە شێوەی گشتی بەو جۆرە کـــــە

بریاریت لەگەڵ جیهانی دەرەوە ، یەک بگرێنەوە ، نەبن ، بە پێچەوانـــــە پێویستە راس و رێس بکرێن و بەرێژەیەکی زانستی ئازەدا ، سەرلەنـــــوێ درووست بکرێنەوە ، ناتوانین بەوانە بڵێین ، ناڕاست ، بەڵکوو ئەوانـــــە " جزئی " و ڕێژەیی و نزیک بە ڕاستن .

ئەم تایبەتمەندییەی ڕاستەقینە ، بۆ زانست ئاشکراوە . ئەو یاسایانەی کە زانست دەیان سەلمێنێ ، بێ ئەولا و ئەولا جووڵانەوەی جیهانـــــی دەرەوە ، نیشان دەدەن . ئەم یاسایانە لەگەڵ جموجۆڵی ڕاستەقینەو پێوەندییـــــە دوولایەنەکانی شتەکان لە جیهانی دەرەوەدا ، یەک دەگرنەوە . لەگەڵ هەمووی ئەمانەدا ، زانست ، چـــــەند یاسای زۆرد راوی وەدەست هێناوە کە دەتوانێ رابگەیەنێ ، ڕاستی بەرپلاون . (١)

راستی بەرپلاو و راستی ڕێژەیی .

یەکەم ـ مەبەست لە یەکەمیان ، ناسینی گشت ڕاستییە ، بە شێـــــوەی تەواو ، ئەمەش کارێکی دژوارەو لەباری کردەوەوە ناکرێ . دەمێنێتەوە تەنیـــــا ئامانجی ناسینی کردەوەیی . بەڵام ڕاستی ڕێژەیی ، بە واتای ناتەواوبوونی ناسینمان و پلەی بەکۆتایی نەگەیشتنیانە .

دووەم ـ ئەوە بۆ مرۆڤ دەگونجێ کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لـــــە ڕووداوەکانی سروشت ، ئەوانە کە لە جیهان دا هەستیان پێ دەکرێ ، چەند زانیاری وەدەست بێنێ کە ئەم یان ئەو بەشی ئەو شتانە ، لە زەینـــــی دا ڕەنگ بداتەوە و لە ڕاستی دا بەراوەژوویان بکا و نەگونجێ ڕێگای زانستـــــی داهاتوو خۆش بکا . دەگونجێ بەم جۆرە سەرنجی ئەم عونسورە دروستانە لـــــە ناسینمان ، بدەین کە ئەمانە ، ڕاستی بەرپلاون و جاری وایشە ناویان بـــــە ڕاستەقینەی هەتاسەتایی ، دەبردرێ . وەک بڕەو هەوانا ردنی کە شتـــــی هەوایی لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە لە ساڵی ١٩٥٧ . بەڵام ئـــــەو ناسینانەی کە بە شێوەیەکی ناتەواو ڕاستییەکان بەراوەژوو دەکەن ، ئەوانـــەی

---

(١) [illegible]

لە دەکرێ بە داماتوودا ، وردتر بین و راس و پەس بکرێن ، ئەوانە
راستی یە نیسبی یەکان ... بڕیاری دروست دەرسێنێت ، لە بارودۆخی
تایبەتی ، خۆ دەنوێنێ . جاری وایە ئەگەر بارودۆخەکە بگۆڕدرێ ، هەڵە
دەبێ . ئەوە کە ئاو بە ١٠٠ پلەی گەرما دا . دەکوڵێ ، تەنیا لە حاڵی
فشاری ئاسایی ( ٧٦٠ میلی گرام ) دا راستە و لە نەبوونی ئەم مەرجەدا ،
هەڵەیە ... ( ١ )

کەوابوو دیتمان کە زۆربەی راستی یەکان ، ناتەواو ، بەش بەش و نزیک
بە تەواون و لە راستی دا هەمو بە هەڵەدا ، راستی خۆ دەنوێنێ . کەوابوو
بەگشتی لە هەر بابەتێک دا ئێمە تا رادەیەک : راستی ( نەراستی بەرپلاو )ـ
مان هەیە . رادەی هەر راستی کە سەبارەت بە هەر شتێک هەمانە و لە هەمو
چرکەدا دەتوانین پێی بگەین و هەروەها شێوەی راگەیاندنی ، پێوەندی بە
ئامرازێکەوە هەیە کە لە هەر کاتێک دا بۆ دۆزینەوەی راستی وا لە بەر
دەستی مرۆڤ دا . بە نیسبەتی ئەو ئامرازانەوە ، نیسبی یە . ئێمە تەنیا
دەتوانین راستی لە پێوەندی لەگەڵ شتەکان دا و بە پێی ئەزموونی خۆمان
لەو شتانەو بە پێی ئەو کردەوەی کە لە رێگای ئەوەوە ئەو شتانەمان ناسیون ،
رابگەیەنین و شی بکەینەوە . لە هەمان کات دا ئەم راستی یە بە جیهانی
دەرەوە ، پێوەندی هەیە و رەنگدانەوەی تەواوتری تایبەتمەندی یە
راستەقینەکان و یاساکانی جموجۆڵی شتەکان و تێکۆشانی دەرەوەی ئەوان ،
رێک و پێک دەکا . لە هەر راستەقینەیەک دا ، خوسوورێک لە نیسبی بوون ،
بەرپلاو بوون ( مطلقیت ) ، زەینی بوون و دەرەوەیی بوون ، هەیە .
راستەقینە لەو بارەوە کە بەو رستانە شی دەکرێتەوە کە بە بارودۆخ و ئەزموون و
ئامرازی تایبەتی گەیشتن بە راستی خەڵکێک کە رێک و پێکی دەکەن ،
پێوەندی هەیە ، نیسبی یە . لەبەر ئەوە ئەو شتەی بە هۆی ئەم رستانەوە ،
سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە ، راستەقینەی جیهانی دەرەوەی زەینە و
سەربەخۆ لە مرۆڤ هەیە ، بەرپلاو ( مطلق ) ە . ( ٢ )

---

(١) ـ المعجم الفلسفي المختصر ، پێشوو ، لاپەڕی ٢٠٢ ـ ٢٠١
(٢) ـ [illegible] ، پێشوو ،
لاپەڕە [illegible]

## ڕاستی و هەڵە

ئەگەر ئێمە، لە دەرەوەی زەمەنی زۆر بەرکورتی ئەو بڕیارانە سەبارەت
بە ڕاستەقینە کۆمەڵێ لێکۆڵینەوەکان ئەبەم ئامێنە بکەین کە ڕاستی بریتی یە لە
هەر بڕیارێکی " جوزئی " تەنیا کاتی و ڕێژەیی بە ڕاستە، ئەوکات ئـــەو
ئاکامە وەردەگرین کە ئێمە بۆ ڕاس و ڕەس کردنی بڕیارەکانمان لەژێر تیشکی
ئەزموونی تازەدا، دەبێ هەمیشە ئامادە بین. بەڵام شتێکە لێرەدا کۆتایی
پێ نایە. ئەوکات کە ئەزموونە تازەکان پەیدا دەبن و داوای دروست کردنی
چەند بڕیارێ دیاری کراو دەکەن، ئەوکات پێ دادەگرن لە سەر کردنەوەیان بە
شێوەی کۆن و ڕاس و ڕەسەکراویان، بەو مانایەیە کە ئەم بڕیارانە لـــە
هەلومەرجی ئارەدا، لە ڕاستییەوە، بە درۆ گۆڕاون ... بۆ نموونـــە
یاساکانی ڕاستی میکانیکی کلاسیک، هێشتا وەک ڕابردوو، بۆ زۆربـــەی
ئامانجە ئەندازیارییەکان دروستن و هیچ کەم لەو بایەخەدا نیە کە ئەوانـــە
وەک یاسا نادروستەکان، ڕەت بکرێنەوە. لەگەڵ ئەمانەدا لەبەر ئەوە ئەزموون
نیشانی داوە کە ئەم یاسایانە بێ ئەوەی دروست بکرێن، بۆ گشت جم و جۆڵـــە
ناسراوەکانی ماددە، ناتوانن لەبەرچاو بگیرێن، ئەم ئاکامە وەدەست دێ
کە ئەم ئیدیعایە، کە یاساکانی نیوتن بێ هیچ فرێزۆنێک سەبارەت بە هەر
ماددەیەک کە وا لە جم و جۆڵدا، کەڵکیان لێ وەردەگیرێت، ئیدیعایەکی
نادروستە. کەوابوو ڕاستی یەکی " جزئی " و ڕێژەیی بە تەواوکە لـــە
چوارچێوەیەکی دیاری کراودا بە ئەندازەی پێویست، ڕاستەقینەیە، ئەگـــەر
لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەدا، کەڵکی لێ وەربگیرێ، نادروستە ...

ئەمە نیشان دەدا کە ڕاستەقینەو هەڵە وەک گشت ئەو چەمکانەی کە بـــە
شێوەی دژیەت و دیار دێنە باس کردن، تەنیا لە ناوچەی زۆر تەنگەبەردا
یەت بەرپلاو لە بەرچاو دەگیرێن ... هەر هات و ئێمە ئەو دووەمان، لە
دەرەوەی ئەو ناوچە تەنگەبەرە، لە بەرامبەر یەکتردا دانا، ئەو دووە کـــە
دژی یەکن، بە شێوەی دژی خۆیان دەگۆڕدرێن. ڕاستەقینە دەبێتە هەڵـــەو
هەڵە دەبێتە ڕاستەقینە. هەر بەو جۆرە کە لە زۆربەی کاتەکاندا ڕاستی ـــ
یەکان، نزیک بە ڕاستی، دەگونجێ بـــە ناڕاست بگۆڕدرێن. هەروەهـــا
دەکرێ بەو بنەمایە بڵێین کە زۆربەی هەڵەکان درۆی بێ خەوش و تەواو نیـــن،

بەڵکو بنەمایەتی ڕاستییان تێدایە. (١)

## بەرەوپێشچوونی ڕاستی.

ئایا ڕادەیەکی زۆری مرۆڤ دەتوانێ، بە ڕاستەقینە بگا؟ ڕاستی تەواو، بەرپلاو، کتێب ڕاستی، شتێکە ئێمە هیچکات پێی ناگەین. بەڵام هەمیشە زیاتر حاڵی نزیک بوونەوە بە ڕاستیدا. ئێمە لە ڕێگای زنجیرەیەکی ڕاستییەی تایبەتی کاتی و نزیک بە ڕاست، بەرەو ڕاستەقینەی تەواو وەبەر نزیک ئەڕۆین کە تەنها ڕاستییە تایبەتییەکان، بەڵکو پاساو پێوەندییە گشتییەکانیش ئەگرێتەبەر. ڕاستەقینەیەک لەبەهۆی هەرفەردێک یا جۆرێک بە هەرکاتێک دا پێت و پێت دەبێ، هەمیشە ناتەواو و لەژێر کۆند و چەندی ڕاستکردنەوەدا. بەڵام ئەوڕاد، لە یەکترنە هێزدەبن، هەم لە دەسکەوتەکانیان و هەم لە هەڵەکانیان. ئەمە سەبارەت بە بەرمیەت ـ بەدوای یەکەکانیش دا ئەدروەستە. کەوابوو کۆی ڕاستەقینە ناتەواوە، تایبەتییە کاتییەو نزیک بە ڕاستییەکان، هەمیشە بە ڕاستییەوە نزیک دەبنەوە. بەڵام هیچکات بە ڕاستەقینەی تەواو، وەبەرگر، دوایی و بەرپلاو ناگەن.

جیهانێک کە لە وێنەکان و تێگەیشتنەکانی ئێمەدا سەرلەنوێ دروست دەبێتەوە. لەڕاستیدا هەیە. ئەو وێنەو بیرانە بەو نیسبەتە کە لەگەڵ ئەم جیهانەدا، یەک دەگرنەوەو بە دروستی، سەرلەنوێ دروستیان دەکەنەوە، ڕاستەقینەن. ئێمە لە ڕێگای ئەزموون و کردەوەوە، ئەو ڕاستییە تاقی دەکەینەوە. ئەم یەکگرتنە هیچ کات تەواو، ورد و بەرپلاو نییە. هەرچەند ئەم یەکگرتنە هەمیشە بەرەو پێش دەچێ، لەگەڵ ئەمەدا، هەمیشە بە شێوەیەکی ناتەواو یارینەکراو و لە سنووری بەرپلاو و هەروەها دوور ئەمێنێتەوە، چونکە ڕاستەقینەو زانست هەمیشە بەرەو پێش دەچن، چونکە مرۆڤ ئامرازی بەرهەمهێنانی وەدەست هێنانی زانیاری خۆی، تەواو دەکا. (٢)

ڕاستی شتێکە کە ڕاست و دروست بێ. هەروشەیەک ئەگەر سەبارەت بە

---

(١) ـ م. ك. فورت، پێشوو، لاپەڕی ١٣ـ١٢

(٢) ـ م. ك. فورت، پێشوو، لاپەڕی ٢٢ـ ٢١

ستێت بێ کە لە دەرەوەی رەین دا نەبێ و لە ئیاس راستقیمدا نەبێ ،
دروێیە . بەم جۆرە تا زانستەکانی مرۆڤ نەگەنە دەرەوەی زمین دا بەگونجێن ،
نابنە راستقینە . . . ئایا راستی برینی دەبێ لە سروشت ، هەرلەبەرئەوەی
سروشت بە چەشنێکی مەوزوعی هەیە ؟ وانا سەربەخۆیە لە مرۆڤ ومرۆڤایەتی ؟
بێ گومان نە . . . تێگەیشتن لە راستی مەوزوعی بەمشێوە ، هەڵەیــــــە .
ئەوەی کە هەیە نە دەبێتە راستی و نە دەبێتە درۆ . . . هەر هەیەو بەس .
ئەوەی کە لەوانەیە راستی یان درۆ بێ ، زانست و بیروراو باری سەرنجی ئــەو
خەڵکیە سەبارەت بەو شتانەی کە هەن ، نەک سەبارەت بە خودی راستی .
بە بێ مرۆڤ راستی نابێ . ئەوەندە هەیە ئەوەی ناوەرۆکی پێک دێنــێ ،
لەسەر مرۆڤ نەوەستاوە . ئەوەی لێرەدا بەکورتی و بوختی باسمان کرد لــە
کتێبی : کورتەباسێکی ماتریالیسم و دیالکتیک دا : هاتوە ( ١ ) بە بــڕوای
من ئێستا نۆرەی ئەوە هاتوە کە هێندێک لە چەمکە بناوانگ و گرنگەکانـــی
فەلسەفی بناسێنین . هەرچەند لە باسەکانی پێشوودا ، ئەم چەمکانـــەش
پێویست بوون و هەرچەندە چەمکەکان ئامرازی بیربوونی فەلسەفەن ، بـــەلام
پاش ئەم باسەی کە دێ لەوبارەوە هەنگاو هەڵ دەگرین .

ریوشوێنی ناسین :

زانستەکان بە پێی جۆراوجۆر بوونی دیاردەکانی هەبوون ، بە چەنـــد
دەستەو گروپ دابەشکراون . ئەگەر زانستەکانی مەتماتیک بکەینە بنەمــــاو
زەمینەی زانستەکانی تر ، ریک و پێک کردنی زانستەکان بەم جۆرە دەبێ :
ئا : زانستەکانی فیزیکی ( Physical Sciences ) یـــان
زانستەکانی ماددەی بێگیان . فیزیک ناسی ، شیمی ناسی ، زەوی ناســـی و
ئەستێرەناسی لەمانەن .
بێ : زانستە ژیانی یەکان ( Biological Sciences ) یان
زانستەکانی ماددەی گیانلەبەر . ژیان ناسین ، لەش ناسی ( فیزیۆلـــۆژی ) ،
گیاناســی و گیانلەبەرناسی لەمانەن .

---

( ١ ) ــ جەلال دەباغ ، پێشوو ، لاپەڕی ١٢١ ــ ١٢٤

بێ ، زانستە کۆمەڵایەتی یەکان ( Social Science ) یان زانستە ئیسانی یەکان ، مێژووناسی ، ئابووری ناسی ، دەروون ناسی و کۆمەڵ ناسی ، ئەمانەن .

ئاشکرو گرێی یەکەم تێدەکۆشێ یاساکانی جموجۆڵی مادەی بێ گیان دیاری بکا . هی دووهەم ، وا بەدوای دۆزینەوەی یاسا جۆراوجۆرەکانی مادەی گیانەبەرو هی سێیەم تێدەکۆشێ یاساکانی جموجۆڵی هێندێك لە مادەی گیانەبەر کە ناوی مرۆڤەو هەمیشە بەشێوەی کۆمەڵایەتی ژیان بەسەر دەبا ، بدۆزێتەوە .

لەبەر ئەوە ئەم سێ گرۆیە ئەماشای خوێندنەکانی یەك راستەقینە دەکەن ، لەگەڵ یەکتر پێوەندی یان هەیە . لەبەرئەوە زانستی ، بە رێ وشوێن ناسی یەکی لەوزیاد یەك جۆرە لە هەبوون دەکۆڵنەوە . وەی متۆدۆلۆژی ( Methodology ) بە چەمکی قامووسی دەبێتە رێ وشوێن ناسی ، لە دوو واتادا کەڵکی لێوەرگیراوە :

یەکەم ـ لێکۆڵینەوەی رێ وشوێن ( Method ) ەکانی لێکردنەوەی زانستی .

دووهەم ـ کۆی رێ وشوێنەکانی هەر زانستێك .

بە واتای یەکەم دا ، رێ وشوێن ناسی ، ئامرازێکە ، بۆ بە سەرنج لێدان و بیرکردنەوەی ئاراستە لەلایەن لێکۆڵەرەوە ، دەگرێ و یارمەتی دەدا تا بە راستی بگا . ئەم رووانگەوە لقێکە لە ژیریی واتا هونەری دروست بیرکردنەوەو لە واتای دووهەم دا ، ژمارەیەك رێ وشوێن دەگرێتەوە . کۆی ئەو لێکۆشانانەی کە گەیشتن بە ئامانج هاسان دەکەن ، پێی دەڵێن رێ وشوێن . بەم پێیە رێ وشوێنی زانستی ، بریتی یە لە کۆی ئەو لێکۆشانانە کە ئەدی پشمەند بە زانست واتا یاساکانی راسی ، رێنوێنی دەکا . رێ وشوێنەکانی زانستی وەك خودی زانست زۆرن و هەر رێ وشوێنێك تا رادەیەك بە دۆزینەوەی یاسا زانستی یەکان یارمەتی دەدا . زانا لە هەر بابەت و هەر لێکۆڵینەوەیەك دا ، شیاوترین رێ وشوێن هەڵدەبژێرێ . شیاوترین رێ وشوێن ئەوەیە کە وردتر لە رێ وشوێنەکانی تر ،یاساکانی راستی نیشان بدا . لەگەڵ گشت ئەمانەدا ، هەموو رێ وشوێنە زانستی یەکان لەلایەکەوە ، وەك یەکن بانیان داوەتە ئەزموونەوە . ئەزموون سەرەتا و ئەنجامی کاری زانستی و

باخەو زەمینەی ڕێوشوێنی زانستی یە • لەبەرئەوە زەمینەی هەر ئەزموونێـــك بریتی یە لە زنجیرە کردەوەو بڕیارە زەینی یەکان ، بیروڕا یان بە ڕتەیەکی تـــر فەلسەفەی لێکۆڵەرو زانا لە کارەکەی دا سوێن دادەنێ • بەم واتایە کە زانـــا بە فەلسەفەی نافەکەسی خۆی ئەو مادانەی کە لە ئەزموون وەریان دەگـــرێ ، ڕێك و پێکیان دەکاو شێوازیان بۆ دیاری دەکاو واتایان پێ دەدا •

ئاری زانا کاتێك ئامادەمی دەبێ کە پێچگە لەوە هەنگاو بۆ ئەزمـــــــوون وەرگرتن بەرێلاو هەڵدەگرێ ، پێویستە بیروڕا یان فەلسەفەی تایبەتی ئەویش دروست بێ ،واتا لەسەر بندەرەتە زانستی یەکان دانرابێ • ڕێوشوێنی دروست هی زانایەکە ، خاوەنی ئەزموونی بەرێلاو و فەلسەفەی دروست بێ •

## پەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی :

ڕێوشوێنە زانستی یەکان چەند کردەوەو لە دەگرێتە بەر • مەسەلەیـــەك دەکرێ ئەو پلانەی کە زانا لە سەرەتای کارەوە تا دۆزینەوەی زانـــــــــــی دمیان پێوێ ، بەم جۆرە دەمرتیتان بکرێن :

١ــ دیاری کردنی مەسەلەو بابەت

٢ــ ئەزموونی سەرەتایی

٣ــ گەڵاڵە کردنی گومان یان ( فرضیه )

٤ــ ئەزموونی بەرفراوان بۆ لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی گومان

٥ــ دۆزینەوەی یاسا

٦ــ ڕێك و پێك کردنی شێوەی تێڕوانینی یان ( نظریه )

یەکەم ــ دیاری کردنی بابەت یان مەسەلە : لێکۆڵەر لە سەرەتاوە لەگەڵ بابەتێك بەرەوروو دەبێ و سنوورەکانی دیاری دەکا •

دووهەم ــ ئەزموونی سەرەتایی : زانا بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەکـــــە ، خەریکی ئەزموون ( Experience ) دەبێ یان تەماشای شــــــــەو ئەزموونانە دەکا کە لە کەسانی ترەوە بۆی بەجێ ماون • ئەزموون بریتی یە لـــــە توێی دەست تێ وەردانەکانی مرۆڤ لە راستی دا •

سێ یەم ــ گەڵاڵەکردنی گومان یان ( فرضیه ) : بەهۆی تەماشـــــا ــ کردنەکان یان ئەزموونە سەرەتایی یەکان ، چەند دیاردە سەرنجی زانا بـــــۆ

خۆیان رادەکێشن ، بەڵام ئەم دیاردانە ، پێکەوە پەیوەندیان نیەو رێگای
چارەسەرکردنی مەسەلە ، نادەن بەدەستەوە . لەم رووانگەوە ، زانا بە
پاڵپشت دان بە خەیاڵی ڕێک و پێکی خۆی ، بە شێوەی کاتی ، ئەو
دیاردانە پێکەوە دەبەستێتەوەو ڕێک و پێکیان دەکا . لە ئاکامدا ، رێگای
چارەسەرکردنێکی کاتی ، ئەداتە دەستەوە . ئەم رێگا کاتی یە یان ئەم
شی کردنەوەیەی مەسەلە ، پێی دەڵێن ؛ ( Hypothesis )

چوارەم- ئەزموونی بەرفراوان بۆ شی کردنەوەی گومان ؛ ئەو گومانەی کە
بەدوای دا ئەزموونی بەرفراوان دێتە کایەوە ، بێ نرخ و پووچە ، هەروەک
ئەزموونی بێ گومان ، خاوەنی پەیوەندی و واتا و ئاکامە . لەم رووانگەوە زانا کە
لە سەرەتاوە بۆ پێشینی بیروڕای خۆی ، گومانێکی لە خەیاڵی وەرگرتووە . لەم
پلەدا بە مەبەستی دیاریکردنی درووست یان نادرووست بوونی گومانەی خۆی
بە ئەزموونی بەرفراوان ، دێتە مەیدان و پێوانەی دەکا و هەڵی دەسەنگێنێ .

ئەزموونی چەند تێکنیکی وەک دیتن ، ئەزموون وەرگرتن ، بەش بەش
کردن ، تێکەڵ کردن ( ترکیب ) ، ئەندازەگرتن ، ناساندن ، سەرژمارێ ،
هەڵسەنگاندن و ڕێک و پێک کردن دەگرێتەوە .

دیتن ؛ ( Observation ) بریتی یە لە تێگەیشتنی ورد لە
دیاردەکان بەخۆی هەستەکانەوە یان بە هۆی ئامرازە زانستی یەکانەوە .
دیتن یان ئەفسوورە ( فعال ) یان نیمچە سوێن وەردەگرێ ( منفعل )
دووەمیان بریتی یە لە تێڕوانین بە دیاردەکان لە هەلومەرجی
هەبوونیان دا بەڵام بێ ئەوەی دەست تێوەردان .

یەکەمیان کە ناوی تری دیتنی ئەزموونی یە ، بریتی یە لە دیتنی
دیاردەکان لە هەلومەرجی دەستکرد دا کە بە هۆی زاناوە ، دابین کراوە .
لە هەر زانستێک دا بۆ ئەم شێوە دیتنە ، چەند شێوەی تایبەتی هەیە .

ئەزموون ؛ ( Experimentation ) جۆرە ئەزموونێکە کە بە
وردبینی ئەوا وەوە ، ئەنجام دەدرێ تا شتە وردەکانی دیاردەکان ئاشکرا
بکا .

بەش بەش کردن ( تجزیە ) بریتی یە لە وەرگێران و گۆڕانی دیاردەیەک
بەرەو ئەو رەگەزو عونسورانەی ئەویان پێک هێناوە .

تێکەڵاو کردن ، بریتی یە لە درووست کردنی دیاردەیەک لە عونسورەکانی

خۆی .

ئەندازەگرتن بریتییە لە رادەی تاڵ وگۆڕی دیاردەکان . هێندێک لە زانایان چەند شێوەیان بۆ هەڵسەنگاندن و راگرتن و تاقیکردنی تاڵ و گۆڕەکان ، دڕیوەتەوەو بە بۆچوونی خۆیان هەندێکیان بۆ هەڵ گرتووە . وەک فرانسیس بیکن و ستیوارت میل .

ناساندن بریتییە لە کۆکردنەوەی تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی دیاردەیەک لە یەک رستەدا ، بە جۆرێک کە ئەو رستە گشت ئەفرادی ئەو ناسێنراوە بگرێتەوە بەرز ئەفرادی تر نەگرێتەوە بەرو پێش بەو کارە بگرێ .

سەرژماری بریتییە لە کۆی وردی ژماردنە یا وەکو سەرەتای رێک و پێک کردنە . زانا بە هۆی چاوپێکەوتن و دیتنی ژمارەیەکی زۆر لە دیاردەکان و تاقیکردنی رووداوە تەری و نەتییەکان و جۆراوجۆری ئاکامەکان و سەبەبەکانیان ، چەند پەیوەندی لە نێوان دیاردەکان ، دادەمەزرێنێ . بە وتەیەکی تر ، سەرژماری دەکا . سەرژماری کاتێک پێویست دەبێ کە ئەندازەی پێویست دیاردەکان بەش بەش بکرێن و لە هەل ومەرجی جیاوازدا ، بخرێنە بەر لێکۆڵینەوە . بەم پێیە ، زانا لەو رووداوانەدا نە بتوانێ بە هۆی چەند کەرەسەی تر ، بدۆزێتەوە ، بەنا ئەباتە بەر سەرژماری . بۆ نموونە ئەوەی کە زانستی ئەستێرەناسی ، بە ئەندازەی پێویست بەرەوپێش نەچووبوو ، بۆ پێشبینی مانگ و خۆرگیران ، ناچار بوون کە بۆ سەرژماری مانگ و خۆرگرتن و راگرتنی چوارچێوە تایبەتییەکان ، هەنگاو هەڵبگرن . بەڵام ئەورۆکە یاساکانی مانگ و خۆرگرتن دۆزراونەتەوە ، ئیتر هیچ کەس ئەو کارانە ناکا .

هەڵسەنگاندن بریتییە لە ، لەبەرامبەریەکتر راگرتنی دیاردەکان . هەڵسەنگاندن پەیوەندی بە بەش بەش کردنەوە هەیە . بەش بەش کردنی دیاردەکان کاری ئەوەیە کە جیاوازییەکان ، لێک چووەکانی ئەوان دیاری بکا و رێگای هەڵسەنگاندن هاسان بکا . هەڵسەنگاندن هەروەک ئاکامی بەش بەش کردنە ، بەش بە حاڵی خۆی سەر ئەکێشێتە لای چەند بەش بەش کردنی تازەو وردترەوە . لێک چوون و وەک یەک بوون یان جیاوازی دیاردەکان ، خاوەن چەند پلەن . ئەگەر لێک چوونی دیاردەکان زۆر بێ ، گشتی کردنی دیاردەکان و رێک و پێک کردنی ئەوان ، دەگونجێ .

ڕێك و پێك كردن باڵی داوەتە ناساندن و هەڵسەنگاندنەوەو دابەش کردنی دیاردەکان بەدەستەی جۆراوجۆر، دەگرێتەوە، بەجۆرێك دیاردەکانی هەر دەستەو گرۆ وەك یەك بێ و لە دیاردەکانی دەستەکانی تر جیاواز بێ. کاتێك ڕێك و پێك کردن گونجاوە کە دیاردەکان بەتوندی وەك یەك بێ و بەرێ ئەوانە وەك ئەندامی لەشی یەك دەستە یان یەك شتی گشتی، دابنێین.

دۆزینەوەی یاسا: دوا پلەی ناسینی زانستی بریتی یە لە دۆزینەوەی یاسا ( LAW ). ئەگەر گومان لەگەڵ ئەزموون بسەلمێنرێن، دەبێتە یاسای زانستی. یاسای زانستی بریتی یە لە ڕاگەیاندنی پێوەندی و لایەنە گشتی و ڕاستی و ئەزموونەکانی ڕابردوو بە شێوەیەکی لەسەریەك و پتەو، نیشان دەدا و لە ئاکام دا لەباری پێش بینی ڕوداوەکانی داهاتوو و دۆزینەوەی یاساکانی تری ڕاستی دا، مرۆڤ ڕێنوێنی دەکا.

ڕێك و پێك کردنی تیۆروانین یان ( نظریه ): نەزەریە ( Theory ) بە گشتی کردنی چەند یاسای زانستی پێك دێ. ئەگەر بکرێ چەند یاسای زانستی، پێکەوە پەیوەند بدرێن و گشتی بکرێن، ئەوکات "نظریه" پێك دێ و ژمارەیەکی زۆر لە دیاردە جۆراوجۆرەکان شی دەکاتەوە. هەر نەزەریەیەك، لەنێوان دیاردە جۆراوجۆرەکانی هەستی دا، ڕێك و پێکی یەکی تایبەتی دادەمەزرێنێ، لە ڕاستی دا، یەکیەتی دروست دەکا و ڕێگای زانست و کردەوە ڕوون دەکاتەوە. ئەگەر زانست خاوەنی نەزەریە نەبێ: تەنیا بریتی دەبێ لە چەند ڕاپۆرتێ دیاردەی بێ پێوەندی و جیاجیاکان و نرخی نەزەری و کردەوەیی وای نابێ.

## ڕێوشوێنە تایبەتی یەکانی زانستە کۆمەڵایەتی یەکان:

دەست نیشان کرا کە لێکۆڵینەوەی زانستی شەش قۆناغ دەگرێتەوە. دیاری کردنی بابەت، ئەزموونی سەرەتایی، گومان دروست کردن، ئەزموونی بەرفراوان، دۆزینەوەی یاسا و دانانی نەزەریە. گشت زانستەکان لەم شەش قۆناخەدا هاوبەشن. بەڵام ڕێوشوێنەکانیان بەتایبەت لە پلەی ئەزموون دا، بە تەواوی وەك یەك نین. لەسەریەك ئەزموون لە گشت

زانستەکاندا . دوو شێوەی هەیە : هێندێك لە زانستەکان وەك فیزیـك ـ ناسی و شیمی ناسی ، بە تونڈی پاڵیان بە ئەزموونەوە داوەو هێندێـك وەك زەوی ناسی و مێژووناسی ، پێ لەسەر دیتن دادەگرن . بەم پێیە لە بـەی ئەزموونـدا ، دوو جۆری ڕێوشوێن بەدی دێ : ڕێ و شوێنە ئەزموونی یەکان ( Methods experimental ) و ڕێوشوێنە دیتنی یەکـــان . ( Observational Methods )

١ ـ ڕێوشوێنە ئەزموونی یەکان : ئەم ڕێوشوێنانە ، لە بنــەڕەت دا پێوەندی یان بە زانستەکانی فیزیکی و شیمیایی یەوە هەیە ، هەربۆیە لە باسی ئیستای ئێمەدا ناگونجێ .

٢ ـ ڕێوشوێنە دیتنی یەکان : بە پێی زاراوە ( اصطلاح ) ئـــەم ڕێوشوێنانە تایبەتن بە زانستە کۆمەڵایەتی یەکانەوەو بە دوو بەشی بنەڕەتـی دابەش دەکرێن :

یەکەم ـ ڕێوشوێنە وەسفی یەکان ( Discreptive Methods ) .

دووەم ـ ڕێوشوێنە بەڵگەیی یەکان ( Documentary Methods ) .

یەکەمیان ئەو تێکۆشانانە دەگرێتەوە کە بۆ دیتنی ڕاستەوخۆی دیاردەکان دێنە کایەوەو دووەمیان ئەو تێکۆشانانە دەگرێتەوە کە بۆ دیتنی ناڕاستەوخۆی دیاردەکان ، کەڵکی یان لێ وەردەگیردرێ .

زانستە کۆمەڵایەتی یەکان زۆرتر لە ڕێوشوێنە دیتنی یەکان بۆ لێکۆڵینەوە کەڵك وەردەگرن ، بەڵام هێندێك لەوان وەك دەروون ناسی و خەڵك ناسـی ، بێجگە لەوە بەتوندی لە ڕێوشوێنەکانی ئەزموونی کەڵك وەردەگرن . هێندێـك لە زانستە کۆمەڵایەتی یەکان وەك مێژووناسی بە کردەوە : بۆ لێکۆڵینەوە لــە ڕێوشوێنە بەڵگەیی یەکان واتا دیتنی ناڕاستەوخۆ ، کەڵك وەردەگرن . هێندێك وەك کۆمەڵ ناسی زۆرتر لە ڕێوشوێنە شی کردنەوەکان واتا دیتنی ڕاستەوخۆ ، کەڵك وەردەگرن .

ڕێوشوێنە وەسفی یەکان : ئەو ڕێوشوێنەی کە بۆ دیتنی ڕاستەوخـــۆی دیاردە کۆمەڵایەتی یەکان کەڵکی لێ وەردەگیردرێ ، لەسەر چەند ئامـــراز و هۆ و شێوە ( Technique ) دانراوە :

وەسیلە : هۆیەکانی دیتنی ڕاستەوخۆی دیاردە کۆمەڵایەتی یەکـــان ، زۆرن :

لێ پرسینەوە ( مقابلە ) ( Interview )

پرسیارنامە ( Questionnaire ) و نموونەگرتن (Sampling) و بەڵگە تایبەتییەکان و ئامرازە ئەزموونییەکانی زانستی ، لەو شتانەن . لێ پرسینەوە چاوپێکەوتنێکی خاوەن نەزم و بنچ و پێك و هەڵسەنگێندراوە ، کە لەنێوان لێکۆڵەرو کەسێك یان چەند کەسی سەرنج‌راکێش بەدی دێ ، بە گردەوە زانا لەگەڵ بارودۆخی ئەو کەسە یان ئەو کەسانە ، بە باشی ئاشنا دەکا . پرسیارنامە لاپەڕێکە چەند پرسیاری رێك و پێك سەبارەت بە مەسەلەی جێی باس و لێکۆڵینەوە لەو ، دەگرێتەوە . زانا پرسیارنامە کە دەنێرێتە لای کەسیان کەسانێك کە مەبەستی یە ، و لە ئاکامی وەڵامەکانیان دا ، سەبارەت بەو مەسەلە ، بڕیار دەدا . نموونە وەرگرتن ئامرازێکە کە دەبێتە هۆی ئاسان کردنی لێکۆڵینەوە . بەم واتایە کە زانا بە جێگای لێکۆڵینەوە لە گشت ئەو شتانەی مەسەلەکە ، دەگرێتەوە ، چەند یەك لەوان کە نموونەی ئەوانی ترن ، هەڵدەبژێرێ و لێیان دەکۆڵێتەوە . هەرچەند بەڵگە تایبەتییەکان بەشێکن لە ئامرازەکانی رێوشوێنی لێکۆڵینەوەی بەڵگەیی ، لە رێوشوێنی پەسنیش دا ، کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ ، چونکە زانا بەهۆی خوێندنەوەی نامەکان و بیرەوەرەکانی کەسیان کەسانێك کە ئەو چاوی پێیان کەوتوە ، تێ‌ڕوانینێکی قووڵتر پەیدا دەکا . گەرمەکانی ئەزموونی زانستی ئامرازێکن کە زانا جاری وایە بۆ ئەندازەگرتن ، تایبەتمەندی دیارکردنەوەی کەس یا کەسانی لێکۆڵراوەی خۆی کەڵکیان لێ وەردەگرێ .

شێوە ، رێوشوێنی دیتنی راستەوخۆی دوو شێوەی بنەڕەتی دەگرێتەوە ؛ یەکەم شێوەیەکە ، دەبێتە هۆی [illegible] کردنەوەی گشتی بارودۆخی ئێستا دیاردەیەکی بەرفراوان ، ئەم شێوەیە کە پێی لەسەر لایەنی چەندی دیاردەکان دادەگرێ ، سەرژمارییە جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە . نموونەیان بۆ زەمینەی ئەزموونەوەو هەڵسەنگاندن ( Survey ) یان باری لێکۆڵینەوە یان خوێندنەوەی بارودۆخ ( Status study ) یان لێکۆڵینەوەی پەسنی ( Discreptive study ) چەند ناون کە بە لایەنەکەم یان زۆر جیاوازەکانی ئەم شێوە دەڵێن . گەرمە بنەڕەتییەکانی ئەم شێوە ، بریتین لە پرسیارنامەو نموونە وەرگرتن . تەکنیك بریتی یە لە شێوەیەکی تر کە دەبێتە هۆی پەسن کردنی وردی جەریانی رابردوو و ئێستای دیاردەیەکی دیاریکراو .

ئەم شێوە کە پێ لەسەر لایەنی چلۆنی دیاردەکان دادەگرێ ، لە جێگـــای جۆرێك ژیاننامە دانراوە •

لێکۆڵینەوە لە بەسەرهات ( Case study ) یا شیکردنـــەوەی بەسەرهات ( Case analysis ) یان لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەسەرهات ( Case history ) یان لێکۆڵینەوەی شێوەی خوڵقانـــــــــدن ( Genetic study ) چەند ناون کە بە لایەنە کەم یان زۆر جیاوازەکانی ئەم شێوە دراون • ئەگەر ئەم شێوە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە بارە دەروونی یەکانی مرۆڤ ، ئەنجام بدرێ ، بەوە دەڵێن شیکردنەوەی دەروون (Psychograph)• کەرەسە بنەڕەتی یەکانی ئەم شێوە وەك ووێترو بەڵگە تایبەتی یەکان و ئامـــرازی ئەزموونی زانستین •

رێوشوێنە بەڵگەیی یەکان • رێوشوێنێك کە بۆ دیتنی ناراستەوخـــۆی دیاردە کۆمەڵایەتی یەکان ، کەڵکی لێ وەردەگیردرێ ، لەسەر چەند جـــــۆر کەرەسەو شێوە دانراوە :

وەسیلە • کەرەسەکانی دیتنی ناراستەوخۆی دیاردە کۆمەڵایەتی یەکـــان یەکجار زۆرن • لەوانە ، کوتاڵە کۆنەکان ، نوتکە کۆنەکان ، ئەفسانەکـــان ، گۆرانی یەکان ، مەتەڵۆکەکان ، ئایینە گەلی یەکان ، بەتایبەت کتێـــــب و نامەکان و بەڵگەکانی تر •

شێوە • رێوشوێنی دیتنی ناراستەوخۆی دیاردە کۆمەڵایەتی یەکـــان ، چەند شێوەی جۆراوجۆر بۆ ئامادەکردنی بەڵگە پێویستەکان و ئەزموونکردن و رەخنەی و دروست بوونی ئەوان و واناکردن و شیکردنەوەیان ، دەگرێتەوە • ئەم جۆرە شێوانە دەنەی زانا دەدەن کە چاو لە بیسراو و بەرپا گـــــد و دەنگوەکان بنوقێنێ و بۆ بەڵگە رەسەنە فراوانەکان بگەرێ ، بە لەبەرچاو گرتنی چۆنیەتی خەت و جۆری کاغەزو رێکەوتی ئیمزا و شێوەو مەبەستی بەڵگە : بـــــە پلەی دروست بوونی ، بگا ، هەر بەڵگەیەك لەژێر تیشکی شارستانی یەتی خـۆل و ئەو کۆمەڵەی کە خوازیاری ئەوە ، واتای لێبداتەوە ، وردبینی و راست وتن و راست بوون و تێگەیشتنی نووسەری بەڵگەکە پێوانە بکا و بیخاتە ژێـــــــر ئەزموونەوە • هەروەها بەڵگەکان پێکەوە هەڵسەنگێنێ و کەم یان زیاد : بـــــە

راستی یەکانی رابردوو بکا ٠ (١)

## بەشی دووەم

### هێندێك لە چەمکە گرنگ و مانایانەکان :

اتصال و انفصال : دوو چەمکی بە واتای بناخەی مادەو جموجۆڵ و گەشەکردنی مادەن ٠ جیابوونەوەی مادە لە خۆیشانداان لەسەر گرێیەك لە شتەکان و لە چوارچێوەیەك دا ، خۆ دەنوێنێ کە بە نیسبەت، لایەنەکانی دیاریکراوە ٠ وەك جەستە سەرەتایی یەکان ، گەردیلەکان ، بەش بەشەکان ، جەستە ئاسایی یەکان ، ئەستێرەکان ٠٠٠ بەڵام جێگاو شوێنی ئەم جەستە وردانە ، بە بەرباڵاوی ، مەیدان نین ، بەڵکوو مەیدانی مادیین ٠ وەك کێشەری ، کارەبایی و گەردیلەیی ٠ ئەویش لە شوێن دا بە شێوەی پێکەوە لکاو دابەش دەکرێ ، هێزی پێوەندی لەنێوان جەستەکان دا ، تووشی گواستنەوە دەکا ٠ لە هەمان کات دا ، جەستە سەرەتایی یەکان ئەبنە خاوەن پەسنی شەپۆلی ٠ مەیدانەکان لە کاتی کارلێك کردن دا ، بەشێوەی جیا جیا ( انفصال ) ؛ خۆ دەنوێنن ٠ واتا لە شێوازی جەستە وردەکان دا ( فوتۆنەکان ، میزۆنەکان و گرفیتۆنەکان ) ٠ یەك بوون ، پێکەوە بوون و جیابوونەوە ، نیشانەی ئاشکرای گەشەکردنی مادەن ٠ ئاڵوگۆڕی چەندی پێکەوەلکاو لە بارەکانی شتەکان و پەسنەکانیان دا ، لە پلەیەکی دیاریکراودا سەر ئەکێشێتە لای ئاڵوگۆڕی چلۆنایەتی بنەڕەتی یەوە ٠ بەڵام سەرهەڵدانی چلۆنایەتی تازە ، بریتی یە لە راپەڕینێك لە بڕین و جیابوونەوە لە پێکەوە ـ بوون دا ٠ ( ٢ )

اساس و نتیجە : دوو چەمکی فەلسەفین ، پێوەندی لەنێوان دوو شتی رواڵەتی دا ، رادەگەیەنن ، بە شێوەیەك لە بێ ئەملا و ئەولا ، " اساس " لە " نتیجە " لە دایك دەبێ ٠ ئەم دووە لایەنێکی دیاریکراو لە هۆ و خاوەن هۆ رادەگەیەنن ٠ ئەویش بریتی یە لەوەکە بەرواڵەت مەرجی

---

( ١ ) ـ د ـ ئاریانپور، پێشوو، ل ٢٤ ـ ١٦ ـ ( ٢ ) ـ المعجم الفلسفی المختصر، پێشوو، ل ١٠

ئەوی‌تریانە • بەلاَم هۆگری باس‌ناکەن • لەو کارانەوە جموجوڵی زاتی مـادە دەوزراوەتەوە • کارلێک کردن نمێوانیان‌دا هەیە • واتا " نتیجە " ئەبێتـە بناخە • لە بیروبۆچوونی ناسین دا ، ئەو پێوەندی‌یە بەراوەژوو دەبێتـەوە ، بە شێوەیەك : لە داناندا ، دروست کردن و داڕشتن دا ، جارێك یەکیـان ئەبێتە " ئەساس " ئەوی‌تر ئەبێتە ئاکام و ئەبە هۆی دروست بوونی ناسین • ئەزموونگەرەکان لە بەخشراوەکانی هەستەوە ، چاو لەم بناخە دەکـەن و هۆشی یەکان لە بیرە رووەکانەوەو لە " حدس "ەوە تەماشای ئەکەن ...( ۱ )

استدلالی • کردەوەیەکی ناسینە ، دادگەری زنجیرەیی‌یە کە لـە خەریك بوون بە داوا گوێستن لە چەمکێکەوە بۆ چەمکێکی‌تر ، کۆتایی پێ‌دێ • بریتی‌یە لە وەسەریەك خستنەوەی دوو یان زیاتر ، بناخەی پێوانەو بەلگـە هێنانەوەکانە • هەموو ئەو چەمکانەیەکە بەلگە یان پێ‌دێنەوە ، چونکە لە ڕێگای پێوەندی ئەو هەستە جۆراوجۆرانەوە کە لە پێش‌دا ناسراون ، دروست بـوە • ئەو شتە بە بەلگەهێنانەوە روونە ، لە ڕاستی‌دا روونی زنجیرەیی‌یە • واتـا زنجیرێکی بەبڕشتە لە پێوەندی چەمکەکان لە کاتی ئاخاوتن یـان نیشان دان دا •( ۲ )

استنباط • یەکێك لە ڕێ‌و ڕەوتە بنەڕەتی‌یەکانی بەلگەهێنانەوەو بـاس کردنە • لای " منطق صوری " ئەرستوو ، بریتی‌یە لە جموجوڵی ناسین لـە گشتی‌یەوە بەرەو تایبەت • وەك : هەر مرۆڤێك بیرد ەکاتەوە ، هەلمەت مرۆڤـە ، کەوابوو بیر دەکاتەوە • ئاکام‌وەرگرتن لە ڕێگای بەلگەهێنانەوە ، بریتی‌یە لـە زنجیرە رستەیەك کە گشت لەوانەیان ، سەرەتایە یان ئاکامە ، وەرگیراو لـە رستەکانی‌تری ئەم زنجیرە • ڕێبازی ئاکام‌وەرگرتن بریتی‌یە لە نیازێکی بنەڕەتی لە بناخەدانان و دروست کردن و بیروڕای زانستی‌دا • ( ۳ )

انعکاس • پەستێکی گشتی مادەیە لە پەنای ئاڵ‌وگۆڕی خود بـە خودی دا ، لە توانای جەستە مادی‌یەکان دا ، خۆ دەنوێنێ ، بە ڕەنگـی تایبەتمەندی جەستەکان کە شوێن لەسەر یەکتر دادەنێن ، دەردێ •

---

( ۱ ) ـ المعجم ، لاپەڕی ٢٤

( ۲ ) ـ االمعجم ، لاپەڕی ٢٥

( ۳ ) ـ المعجم ، لاپەڕی ٢٧

بەپێی پلەی گرێ وکۆتی و رێك و پێکی بابەتەکا رێك کەرەکـــان ،
رەنگ دانەوە بەشێوەی جۆرا وجۆر خۆ دەنوێنێ . کەوابوو بەدوادا هاتنـی
شێوازە سەرەتایی یەکانی ئەو ، لە سروشتی بێ گیانەکان دا ، بەدوای دا دێ.
ئەو ئیترەدا لە شێوازی شوێن داناندا ، دەست پێ دەکا . ئەو شوێنەی کـە
کردەوەی جەستەیەکی تر بەجێ دێلێ . بەردێك لە سەرەوە بەرد ەبێتـــەوە ،
قووڵنەیەك لەسەر زەوی دروست دەکا ( خۆیشی شوێن نە زەوی هـــەڵ ـ
دەگرێ ) . لای ئەندامە زیندووەکان ( یەك ئەندامی ) شێوەیەکی تازە لـــە
رەنگ دانەوە ، خۆ دەنوێنێ کە بریتی یە لە شوێن لەسەردانان . ئەم جـــۆرە
رەنگ دانەوە لای ئەو زیندەوەرانەیە کە کۆئەی دەماریان نیە . بە یارمەتـــی
شوێن لەسەر دانان ، ئەندامە ساکارەکان ، جۆرەجۆرێکی دیاری کـــراو وەك
دژی کردەوە لە بەرامبەر شوێن دانانی ستی دەرەوەدا ؛ لە چوارچێـــوەی
تاڵ وکۆتی ماددەکان ، نەخۆنیسان دەدەن . بەرتی گیاکان ، بەرەو تیشکی
خۆر ، مل کەچ ئەکەن . . . لەوی دژایی لە گەشەکردنی تایبەتمەندی رەنگ ـ
دانەوەدا ، پێوەندی بە سەرهەڵدانی ئەو گیانلەبەرانەوەیە کە خـــاوەن
رێکی وپێکی یەکی بەرزن . . . لەوانەدا ، لەهێمادا ، کە خواردەمەنی یـــان
مەترسی بکەیەنی ، خۆ دەنوێنی . لەگەڵ گەشەکردنی هەست پێ کردن لای
ئەمانە ، شێوازێکی تازەی رەنگ دانەوە ، کە بریتی یە لە رەنگ دانـــــەوەی
دەروونی و " نفسی " خۆ دەنوێنێ . ئەمە لە هێزو توانایەك دا خۆی دەنوێنێ
کە وێنەو پەسنە تاناتەکان لە شتەکان ، دەخرۆشێنێ . رەنگ دانەوەی مەرجی
کە لە رەنگ پێدان و نەبێ خواردەمەنی بە بۆنموونە سەگێك و دروســـات
کردنەوەی پاشان لە رەنگ دان و نەدانی خواردەمەنی وتا ولەدمەهاتنـی
سەگەکە ، بناغەیەکی راستی یە . لە مرۆڤ دا بەهۆی کردەوەوە پـەیدی دێ ،
بەهۆی کردەوە ، دەکەوێ ، شتەکان بۆ مرۆڤ رەنگ بدەنەوە . نەك تەنیـا
لایەنی ژیانەوە ، بەڵکوو بە ردە لەسەر خودی شتەکان و پێوەندی یە قـــووڵ و
گەوهەری یەکانی هەڵبداتەوە . تامادەکردنی ئامرازی ساکار نەبێتە هـــۆی
گۆڕانی شتەکەو شوێن لەسەر دانانی بەشێکی تر . بەجۆرێك لەگەڵ پەسنـــە
دەروونی یەکانی ، یەك بگرێتەوە . هەرلە تێکۆشانی کردەوەی دا ، زمـــان
پەیدا بوو . پاشان بیری رووت ( مجرد ) واتا هێز لەسەر کەمك وەرگرتن لەو
چەمکانەی کە پێوەندی بە شتەکانەوە هەیە ، بێ ئەوەی پەنا بدرێتە بـــــەر

شتەکان . لەم پلەدا ، سروشتی تێکۆشانی ڕەنگ دانەوە ،خۆ دەنوێنێ .
مرۆڤ تەنیا جیهان بەراوەژوو ناکا ، بەڵکوو تا ئەندازەیەك ئەی خولقێنێ و ئەی کا بە جیهانێکی تری زەمینی و جیهانی فەرهەنگی ڕوحی . کارلێکـــەری بیری مرۆڤ لە گەڵاڵەکردنی مەبەستە دیاریکراوەکانی دا و لە بێـــــداری زانستی دا ، خۆ دەنوێنێ . واتا لە ڕەنگ دانەوەی شتەکانـــــی دەرەوەی زەمین دا ، پاشان جیهانی وێنەو چەمکە رووتەکان ، یاریدە بە مـــــرۆڤ دەدەن بۆئەوەی بەکردەوەو بە تێکۆشان ،لەگەڵ جیهانی مادەدا پێوەنـدی بگرێ . وریایی مرۆڤ ، بەرزترین شێوازەکانی ڕەنگ دانەوەو گـــــــرێ و گۆڵ دارترینیەتی . . . ( ١ )
ایمان ، هەڵوێستێکە لە ڕووداوەکان ، بیروبۆچوونەکان ، تەنانـــــەت کێشەکان لە بێ بەڵگە لەسەر ئەو بناخە کە ڕاستەقینەن ، پەسند دەکرێن . بەم واتایە لە بەرامبەر چەمکی ناسینەوە ، ڕادەوەستێ . بەڵام بابەتەکەی بە پێـی باو و عورف ئەوەیە کە زانست و ئەزموونەکانی خەڵك ، وجوودیان پەسنـــــد ناکەن . ( ٢ )
برهان ، سەلماندنی ڕاست بوونی بڕیار ( فرض، قضیە ) بە واتـــــای بەرفراوانی وشە ، بریتی یە لەسەر سەلماندنی دەسکەوتەکانی ئەزمـــــوون و هی تر . بەڵام بەواتای بەرتەسکی ،مەبەست لەو بەڵگەهێنانەوەی تیریێری یە . ئەوەیە کە سەر ئەکێشێتە لای دروست بوونی بابەتێکی دیاری کـــراو . . . سەرەتاکانی " برهان " پێویستە ڕاستەقینە بن . هەرکات ئاکام وەرگرتن لـــە بابەتێکی گەڵاڵەکراو لەو سەرەتایانە ، بە پێی کۆڵەکەی تیریێری یەکان ،کۆتایی پێ هات ، ئەم بابەتە بە دروست دادەنرێ . شمشیر ئاسنە ، ئاسن لـــە بەرامبەر ئاگردا دەتوێتەوە ، لەوابوو شمشیر لە بەرامبەر ئاگـــــــــردا ، دەتوێتەوە . ( ٣ )
تجربە ، بەواتای بەرفراوانی وشە لە بەرامبەری چەمك دایە . . . بــــە واتای بەرتەسکی لە بەرامبەر " اسلوب " دا بریتی یە لە لێکۆڵینەوە لـــــە

---

( ١ ) ــ المعجم ، لاپەڕی ٧٧ ــ ٧٦
( ٢ ) ــ المعجم ، لاپەڕی ٨٣
( ٣ ) ــ م ، ٩٠ ــ ٨٩ . " م " کورتەی " المعجم " ە

ڕواڵەتەکانی لە هەل ومەرجی عورفیدا • بەڵام بەدوردی ڕێگا بە دوپات کردنەوەی ئە. ڕواڵەتەو چاوەدێری دەدا • لەودا لێکۆڵینەوەی ڕواڵەتی شتی دیاریکراو لە هەل ومەرجی جۆرا وجۆردا ،دەگونجێ و دەکرێ بە پێی داخواز لەو هەل ومەرجەدا یان لە هەل ومەرجی تازەدا ، دوپات بکرێتەوەو بەشەکانی خۆیدا بەش بکرێ • ڕێ رەوێکە بۆ شوێن دانانی ماددی مرۆڤ لە سەر بابەت • هەروەها بۆ وەبەرچاو گرتنی بەکردەوەی تەواوی ڕاستەقینە • (١)

تجرید • (Abstraction) دوزرخستنەوەی کاری زەینە بۆ دوورخستنەوەی هێندێك بەش و پێوەندی بابەتێك و جیاکردنەوەی لە بەشەکان (پێوەندییەکانی تر) • زیاد لەوە لە زاراوەدا بەسەر چەمك دا دەبردرێ • ئەو چەمکەی کە بە بۆنەی ئەم کارەوە ، پەنا بەر بردن ،کۆتایی پێدێ • واتا بە پاڵپشت دان بە چەمکە روونەکانەوە • ئەو بەشانەی کە کاری " تجرید " جیایان دەکاتەوە ، مرۆڤ بەهۆش بڕیان دەدا ، نە تەنیا بەشێوەی جیا لە بەشەکانی تر ، بەڵکوو بەشێوەی جیاکردنەوە لە هەڵگری ئەو بەشانەش • بەم جۆرە چەمکە جۆرا وجۆرەکان ئەوانەی زانست کەڵکیان لێ وەردەگرێ ، وەك ژمارەو سەردی و گەرمی ، خۆدەنوێنن • ئەم رچە ئیزن بە لێکۆڵینەوەی قوڵ و چوونە ناخی شتەکان ، دەدا • • • (٢)

تحلیل و ترکیب • شیکردنەوەی ئەندامەکانی کۆشکی مەبەستێك کە کەوتوەتە بەر لێکۆڵینەوەو پێوەندی ئەم ئەندامانە پێکەوە • شیکردنەوەی پلەکانی بەرەوپێشچوون و گەشەکردنی مەبەستەکەو ئەو بارە جۆرا وجۆرانەی کە بابەت لە درێژایی کاتدا ، تێپەری کردووە و دیاری کردنی مێژووی لە دایك بوون ، پاشان گەشەکردن و نەمان و مردنی دیاردەکە ، لەبەر مێژوویەوە ، دیاری کردنی دەورەکان ؟ ئەرکەکانی مەبەستەکەو یاسا زانەکتان بەسەریدا و کاریگەری ئەم ئەرکانە لە چوارچێوەیەکی گشتی گەشەکردن دا و چەند جۆری تر • • • (٣) ترکیب لەسەر بنەت دانانەوەی ئەو بەشانەیەو دوبارە لێکۆڵینەوە بەشێوەی زانستی •

---

(١) ــ المعجم ، لاپەڕی ١٠٧ ــ ١٠٦

(٢) ــ م ، لاپەڕی ١١٠ ــ ١٠٩

(٣) ــ احسان طبری ،نووسراوە فەلسەفی و کۆمەلایەتییەکان،ل ٥٧

جزء و کل : دوو چەمکی فەلسەفیی کە بە واتای بوونی پێوەندی لە نێوان کۆ یەك لەشتەکانە ، هەروەها لەسەر پێوەندییەك کە ئەم شتانە دەگرێتەوەو سەر ئەکێشێتە لای وەدەست هێنانی کۆیەکی پەسن و یاسای تازەکە لە کاتی جیاجیادا ، ئەم پەسنانەی نیە · بە پاڵپشت دان بەم پێوەندییەوە " کل " دروست دەبێ کە بەشە جیاجیاکان وەك بەشەکانی ئەوەن ئوکسیژن و هیدرۆژن ، هیچ کامیان بە تەنیایی ئەو تایبەتمەندییەی نیە کە پێکەوە هەیانە ··· بەندەکان " جزء " ن ··· ( ١ )

تصور : وێنەیی هەستی ، ئاشکراو هەست پێ کراوە لەو شتانەی کە مرۆڤ لە کەمینیان دادەنیشێ و سێرمیان لێدەگرێ و زانەت وروود اوەکانیان هەست پێدەکا کە لەسەر بناخەی شێوازی تێبینی هەستی ، دروست دەکرێ · وەك هەست پێکردن و ئیدراك · لە دروست کردنی وێنەگرتن دا ، وەبیرهێنەرەوە ( داکرە ) دەورێکی باشی هەیە · بە نیسبەتی هەست پێ ـ کردن و ئیدراکەوە ، پێوەندییەکی کەمتری بە بابەتەوە هەیە ، جۆرە گشتی کردنێکە ، دوورخستنەوەی ئەو پەسنانەی کە کەمتر روون و سەفامگیر بوونیان لاوازە ، لە وەبیرهێنەرداو پاڵ دان بە پەسنە گرنگەکانەوە · نرخی (تصوّر) لە ناسین دا ، ئەگەرێتەوە بۆئەوەی کە هوشیاری مرۆڤ لەدوو بواردا کە لەوان لە خودی شتەکان وەردەگرێ ، بەڵام لەسەر وێنە هەستییەکان ، کاردەکا ··· فووڵایی لە چەمك کەمترە ··· ( ٢ )

تطور : چەمکێکی سروشتی یە ئاڵوگۆڕی لە جەرەیان دابوو ، لە جیهان دا شی دەکاتەوە · ( ٣ )

تغییر : ئاکامی ئاڵوگۆڕی کارێکەر ( تفاعل ) ی شتەکانە ، کارێکەری لایەنە جۆراوجۆرەکانی · بە سروشتی بابەتی وەبەرگر ، دەس نیشان ەکرێ · لە رێگای ئاڵوگۆڕەوە ، جاری وایە چلۆنایەتی ، چەندی ، بناخەی و ەرکی دەگۆڕدرێ · ( ٤ )

---

( ١ ) ـ م ، ١٧٢ ـ ١٧١
( ٢ ) ـ م ، ١٢٩ ـ ١٢٨
( ٣ ) ـ م ، ١٢٩
( ٤ ) ـ م ، ١٣٤

تفکر : بریتی یە لە توانای مرۆڤ لەسەر گۆڕانی ئاکامەکانی تێکۆشانــــی فیکری ، بە بابەتێك بۆ بیرکردنەوەو تێ ڕوانین ،ئەوەی لە ناوەڕۆکەکەی بگــا . جان لاك پێی وایە ، یەکێك لە .رچاوەکانی ناسینە . هیگل پێی وایــــــە ، جوولانەوەیەکی تایبەتی چەمکەکانە . ( ١ ) فیکر جموجۆڵێکی زەینی یە لـــــە سەرەتا ( مقدمات )ەوە بەرەو ئاکام .

تفکیر : هێزێکی داهێنەرە لای مرۆڤ کە لە جەرەیانی تێکۆشانـــــــی کردەوەیی دا ، لەدایك دەبێ و بەرزترین شێوازەکانی ناسینە . ( ٢ )

تناقض : پێوەندی یەکی ئێوخۆیی یە لەنێوان شتێك و پەستێکی یـــــان کردەوەیەك لە باروە لایەنەکانی ئەو شتەیە کە یەکیان لەگەڵ ئەوی تر دەرلـــە کاروباری یەکتر دەدەن و لە هەمان کات دا یەکیان ئەوی تر " نفـــــــی " دەکاتەوە . لە سێوازی یەك بوونی تەری دژەکان دا لە دەروونی هەمـــــوو شتێك دا هەیە ،چونکە هەموو شتێك لە ئاڵ وگۆڕدایەو لایەنی دژی یەکی هەیەو لە راستی دا ، خۆی لە خۆی دا دژ بەیەکە . . . ( ٣ )

حد : یەك بوونی لایەنی چەنایەتی و چەندی شتیان هەـــــــی کردەوەیە ، بۆچوونێکە سەرناکێشێتە لای ئاڵ وگۆڕی شتەوە لە چەندی یەوە بـــۆ چەنایەتی . ئەوەی باش " حد " داوای ئەم گۆڕانە دەکا ، چلۆنایەتی یەکی تایبەتی یە ، شتەکە دەبێتە شتێکی تر .

حدس : بریتی یە لە توانایی لەسەر نیدراکی راستی بە شێوەیەکـــــی دەستەوپەخە . هێندێك " حدس " بە دژی هۆش دەزانن کە ناتوانــــــێ بچێتە ناخی شتەکانەوە . بەم پێ یە دەبێتە جۆرە " اشراق " ێك یـــــــان " وحی " یەك کە لە ئیمانی تایبەتی یەوەسەرچاوە دەگرێ . . . کێشە لەسەری زۆرە . لـــە راستی دا " حدس " ئاکامی دووپاتکردنەوەی ئەزموون و کردەوەکانە کـــە خەڵکی نەزان بە شتێکی نائاسایی دادەنێن . . . ( ٤ )

حرکت : پەستێکە لە دەروونی مادەدایەو لێی جیا نابێتـــــــــــەوە ،

---

( ١ )ــ م ، ١٣٦
( ٢ )ــ م ، ١٣٦
( ٣ )ــ م ، ١٤٥
( ٤ )ــ م ، ١٨٢ ــ ١٨١

ڕێ‌وشوێنێك له بوونی ماده دەروست دەكا بێ ماده نیه ، هەتا هەتایــــه •
( ماده‌ش بێ جموجۆڵ نابێ ) • نه خوڵقاوه‌و نه نەمێو دەچێ ، نه تەهێنیــی
دەمێ و نه له هیچه‌وه دەخوڵقێ • به واتای تەواوی وشه ، به واتای ئــاڵ و
گۆڕی گشتی یه ، گشت جموجۆڵێك له جەرمیانی گەردوون دا ، دەگرێتەوه • ( ۱ )

حرکت ذاتی : ئاڵ وگۆڕێکه له شتەکان دا لەسەر بناخەی توانایەکانــی
دەروونی ، نەك به شوێن دانانی دەرەوەیی • ( ۲ )

حریت و اراده : بریتی یه له توانایی مرۆڤ له بڕیاردان و دەســــت
تێ وەردان دا که لەگەڵ مەبەست و نەخشەکان یەك بگرێتەوه • ئەم هێزه لــه
جەرمیانی ناسینی یاساکانی جیهانی ڕاستی و زاڵ بوون بەســــــەر
پلەنایەتی یان دا ، پەیدی دێ • ( ۳ )

حریت و ضرورت : ئەوکات که دەمان هەوێ کارێك ئەنجام بدەین ، ئایا
له ئەنجامدانی دا ، ئازادیمان هەیه؟ یان ئەوەی ئەنجامی دەدەین بــه
شێوەی پێویست له ویستی ئێمه سەربەخۆیەو وادیاری کراوه؟ هــــەروەك
هێندێك پێیان وایه پێویست و ڕووداو ، دژی یەکترن ، پێیان وایــــه
پێویست و ئازادی لەو چەشنەن • ئەمانه پێیان وایه ئەوانیش یــــەك
ناگرنەوه • کردەوەی ئازادی به واتای مەلاتن له پێویست (ضرورت) ە • ئەگەر
وابێ ، مرۆڤ ئازادی نیه • گشت تێکۆشانەکانی مرۆڤ وا لەژێر دەسەلاتــی
یاساکانی هێزگری دا • کردەوەی هێزگری ( طبیعت ) بەتایبەتمەندی پێویستی
ڕووداوەکان ، دەگاو سەر ئەکێشێته لایــەوەو ئاکامی بێ ئەملا و ئەولایـــان
دیاری دەکا • مرۆڤ هیچ کات ناتوانێ له گرێ وگۆڵی پێویست له سروشت و
کۆمەڵ دا خۆی ڕزگاربکا • پێویست سەر ئەکێشێته لای ئازادیـــــەوه و
مەرجی پێشەکی ئەوه • ( ٤ )

ئازادی و پێویست بریتی یه له پێوەندی نێوان تێکۆشانی مرۆڤی ئازاد و
تێکۆشەرو باروڕۆخی دەرەوەیی ، بەتایبەت لەنێوان ئەو و کردەوەی یاساکانی

---

( ۱ ) ــ م ، ۱۸٥
( ۲ ) ــ م ، ۱۸۷
( ۳ ) ــ م ، ۱۸۹
( ٤ ) ــ نظریهٔ شناخت ، پێشوو ، لاپەڕی ۷٦ ــ ۷٥

سروشت و کۆمەڵی دیاری کرا و کە نە گرەوی هوشیاری مرۆڤ و ئیرادەی ئەودا نیە. ئاسپینوزا پێی وایە ئازادی کردەوەیی مرۆڤ بە ئەندازەی هۆشمەندی ئەو دیاری دەکرێ. هیگل وتی: جموجۆڵ بریتی یە لە ئاگایی پێویست، هوشیاری پێویست مەرجی گرنگە بۆ گەیشتن بە ئازادی، بەڵام تاقە مەرج نیە. ئازادی تێگەیشتنێکی زانیارانە و بە ئامانجە لەگەڵ پەیدا بوونی یەک دەگرێتەوە و پاڵ بە یاسا دانراو و ناسراوەکانی سروشت و کۆمەڵەوە، دەدا و لەم ناسینە کەڵک وەردەگرێ. مەیدانی ئازادی لەسەر ناسینی گشت یاسا گشتی یەکانی راناوەستێ: بەڵکو بە رەفتار پێکردنیان، پێوەندی هەیە و تەنیا بە گەشەکردنی ناسین دیاری ناکرێ. بەڵکو بە ئاڵوگۆڕی سروشتی ـ تەوە، پێوەندی هەیە.

ئازادی کۆمەڵ لە بەرامبەر پێویستی سروشت و زاڵ بوون بەسەر لێی و پێی یاساکانی سروشت دا! لەگەڵ بەرەوپێش چوونی بەرهەمهێنان، پلەی بەرز ئەبێتەوە. لەگەڵ گەشەکردنی تەکنیک و بەرەوپێش چوونی زانست و زاڵ بوون بەسەر ملبەندی سروشتی ژیان دا، پلەیان بەرز ئەبێتەوە. لە دەرەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی، بەرهەمهێنان و زانست و تەکنیک، سەربەخۆ نین... (۱)

ضرورت، حادثەو عینیت: دۆزینەوەی پێویست لە سروشت و کۆمەڵ دا، لەگەڵ دۆزینەوەی هۆیەکان، یاساکان بەسەر پێوەندی هۆ و خاوەن هۆکیان (علت و معلول) ەکان دایە. ئەوەی پێویستە لەبەرئەوەیە کردەوەی هۆیەکان دادەڕێژن... شتی بە تەواوی بێ هۆ، لە ئارادا نیە... (۲)

پێویست لە کۆن و فۆرمی زنجیرە رووداوێکەوە، بەدی دێ، بە ئازادی دەست تێ وەردان بەو واتایە کە ئێمە وەک هۆیەکی هوشیار، پێویستە بەسەر کردەوە بەسەر رووداوەکان دا زاڵ بین. بەشێوەیەک ئەنسوری بێ هۆ و وەک پلاری کوێر لە دیاری کردنی ئاکامەکانی خۆیان دا، تەفروتونا بکەین و ئەم ئاکامانە بە تەواوی لەگەڵ مەبەستەکانمان دا، هاوئاهەنگ بکەین... (۳)

---

(۱) ـ م، ۱۵۲ ـ ۱۵۱

(۲) ـ نظریه شناخت، پێشوو، لاپەڕە ۷۳

(۳) ـ نظریه شناخت، لاپەڕە ۸۲

پێویست ( ضرورت ) هەتا نەناسرێت کوێرە · بڕوانە ( ٩٩ ــ ٩٨ کورتەی باسێکی ماتریالیزمی دیالێکتیکی ) · · ·

ئازادی شتێکە بەکارهێنانی پەرە دەسەنێ · ئەویش پلە بە پلەو کەمکەم و لە جەرەیانی تێپەڕبوونی سەدان ساڵ تێکۆشانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دا ، دەخولقێ و دەبێتە دەسکەوتی هەوڵ و تێکۆشانی زانیارانەی مرۆڤ · مرۆڤ لەژێر چەمبەری گرێ و گۆڵی ژیانی کۆمەڵایەتی و بارودۆخی دا ، لەدایک دەبێ ، بە هۆی ژیانی کۆمەڵایەتی خۆی و یاساکانی گەشەکردنی کۆمەڵ ، وردە وردە لە چوارچێوەی کاری کۆمەڵایەتی دا ، ئەو هێز و توانایانەی کە دەبنە هۆی ئازاد بوونی ، وەدەسیان دێنێ و گەشە دەکا · ئەم کارە لە خەبات لەگەڵ سروشتی دەرەوەی خەباتی کۆمەڵایەتی و گرۆیی و هەروەها لە خەباتی فەردی دا ، بە ئەنجامی ئەگەیەنێ · بۆخۆی ئەم ئازادی یە دەخولقێنێ و وەدەستی دێنێ · کەوابوو مرۆڤ خاوەنی ئەو ئازادی یەیە کە لەژێر دەسەڵاتی دایەو وەدەسی هێناوە · ( ١ )

حکم ؛ بە واتای بڕیاری وشە · هەر وتەیەک یان هەر بیروڕایەک سەبارەت بە شتێک یان رووداوێکی دیاری کراوە ، لە ژێرێتی دا بە واتای بیرکردنەوە لە شتێکە کە بەشێکی پێوە دەچەسپێ ، یان لێی دەکاتەوە · بەپێی عورف و باو بریتی یە لە پێوەندی نێوان دوو چەمک کە یەکیان پێی دەڵێن " زات = موضوع " ئەوی تریان پێی دەڵێن " هەواڵ = محمول " · بریتی یە لە پێوەندی نێوان دوو چەمک کە لەو پێوەندی یەدا ، بە هۆی یەکێتیانەوە ، ناوی ئەوی تریان دەبڕدرێ و تەوجی دەکرێ · وەک ئاو هەمیشە گوێزدارە ، مەزنووم هەژارە · بەو ساوە کرێکارە · · · ( ٢ )

خێر ؛ لە بەرامبەر شەڕەوە دانراوە · بە واتای فراوانی وشە ، ئەو شتانەیە کە بە نیسبەتی مرۆڤەوە بە ئازانجێ یان بەنرخن ( ٣ ) دیارە شەڕ بە پێچەوانەیە ·

دیالێکتیک ؛ زانستی یاسا گشتی یەکانی بۆناسینی سروشت و کۆمەڵ و

---

( ١ ) ــ نظریه شناخت ، لاپەڕی ٩٠ ــ ٨٩

( ٢ ) ــ م ، ٢٠٤

( ٣ ) ــ م ، ٢١١

بیرە • ڕێبازی لێکۆڵینەوەی ڕەوانەتی ستەکانی دەرەوەی زەینە لە گەشەکردنیان و
لە جموجۆڵیان دا کە لە داڕژێتی یەکانی دەروونی ستەکانەوە سەرچاوە
دەگرێ • بریتی یە لە زانستی گەشەکردنی مێژوویی کە بە فراوانی دژەکان
لەگرێدەبەر • لە سەرەتادا بۆ باس و پێشە و تێک هەڵچوونی بیروڕا کەڵکی
لێوەرگیراوە کە سەری کێشاوەتە لای ڕاستی یەوە • بیروڕای زانستی
دیالکتیکی لە جەرەیانی گەشەکردنی ناسینی مرۆڤدا ، سەری
هەڵداوە . . . ( ١ )

تاییین : شێوازێکە لە شێوازەکانی هوشیاری کۆمەڵایەتی . . . کۆمەڵێکە لە
بیروبۆچوون و کردەوە کە بەرەو ئەم یان ئەو ئامانج دەڕوا . . . ( ٢ )

ذات و موضوع : دوو چەمکی فەلسەفین بۆ شی کردنەوەی تێکۆشانی
کردەوەیی و ناسینی خەڵک کەڵکیان لێوەردەگیرێ • مرۆڤ لەگەڵ
ئامادەکانی تر ئەم جیاوازی یەی هەیە کە تەنیا بەند سروشتی یەکان شوێن
لەسەری دانانێن ، بەڵکوو ئەویان گۆڕێ و ئەویش شوێن لەسەریان دادەنێ و
کارلێکیان پێکەوە هەیە • لەم بەرەوڕووبوونەدا ، مرۆڤ لایەنی تێکۆشەر و کاریگەرە ،
ئەمەش مرۆڤ دەکاتە " ذات " و سروشت دەبێتە " موضوع " یان بابەت بۆ
ئەم تێکۆشانەی مرۆڤ ( ٣ )

روح : چەمکێکە کە بە پێی عادەت لە فەلسەفەدا کەڵکی لێوەردەگیرێ
وەک " عقل " " هۆشیاری " " بیر " " هۆش " • روح لەگەڵ روحی یەی
ماددی دا ، لێک دەدەن • ئەفلاتوون و ئەرستوو بە هێزێکی ماددیان دانا کە
وێنە ( صورت ) بە ماددە دەبەخشێ • لە فەلسەفەی ئیسلامی دا ، روح
" نفس " یان لای مرۆڤ وەک یەک دانا • فارابی و ابن سینا ، پێیان وابوو
لێک جیاوازن و وتیان ، یەکەمیان هەڵگری ماددی دووهەمە " نفس " سەرچاوەی
جموجۆڵی بارستایی یەکانی ئاسمانە • بەڵیەتە لە پلەکانی " فیض " ی
خودایی • " صوفی " روح بە پایەبەرزتر لە " نفس " دادەنێ • لە
ئەوروپای سەدەکانی نێوەنجی دا ، جیاوازییان بۆ دانان ، خوای روح

---

(١) م ، ٢٢٤
(٢) م ، ٢٢٧
(٣) م ، ٢٣٠

جیهانی مادە دروست دەکا • ئیدەئالیستەکانی ئێستا پێیان وایە گەوهەری روح یەکێك لە عونسورەکانی هوشیاری فەردە • • • ماتریالیستەکان بە پەستی مادەی دەزانن • • • (١)

ظاهر و باطن • دوو چەمکی دیالکتیکی مادین، دوو لایەنی جۆرا وجۆری شتەکان نیشان دەدەن یان روالەتەکان و پێوەندییەکانیان دەسرنیشان دەکەن • روالەت (دەرەوە) بە واتای پێوەندی شتە بە شتێکی ترەوە • باسی جێگای ئەو شتە دەکا کە لەودایە • بەلام دەروون (داخل) بریتییە لە تێکەلاوی خودی شتەکە، بنچینەو پەسنەکانی عونسورەکان و پێوەندی نێوانیانە • ئەم وانگەوە شتێك (روالەت) دەبێتە یەك بوونی روالەت و دەروون • ئەم دوو چەمکە تەنیا روالەتی شتەکان لە لایەن پێوەندییەکان و تێکەلاوییەکانیانەوە، بەراوەژوو ناکەن، بەلکوو لە روانگەی پلەی دەروونی ناسینی مرۆڤەوە، لە چوونە ناخیانەوە، بەراوەژوویان دەکاتەوە • لێرەدا تا ئەم رادەیان تەری‌تر، سەروکارمان لەگەل روالەت دەبێ و دەبێتە واتای پەسنەکان و واتای دەسرنیشانەکانی ئەو شتانەی کە هەستەکان سێرمیان لێ ترنوون • بەلام دەروون بە واتای ناوەرۆك، گەوهەری بابەتی ناسینەو بە پێی عادەت، لە تەماشاکردنی راستەوخۆ، شاراوەیە، تەنیا لەسەر بناخەی شی‌کردنەوەی زەینی دەکری رای‌گەیەنێ • ئەو شی‌کردنەوەی کە بەهۆی ئامرازو زانستە هاتووەکان لەلایەن هەستەکانەوە، جێبەجێ دەکری • • • (٢)

عرض • شتێکە کە زوو و بە خێرایی لەبەین دەچێ، لە بەرامبەر گەوهەردا، کەلکی لێ وەردەگیردری (٣)

علم و نظریە • مەیدانێکە لە مەیدانەکانی باس‌کردن • لایەنە جۆرا وجۆرەکانی زانست بەو جۆرە کە چڕا رچێوەیەکی تەواون، شی دەکاتەوە، بە پێی یاسای تایبەت بەخۆیەوە، گەشە دەکا • بیروۆزی (نظریە) لە گۆشەی یەك بوونی لایەنە جۆرا وجۆرەکانیەوە، زانست ئەخاتە بەرلێکۆلینەوە •

---

(١) ــ م، ٢٤٢ ــ ٢٤١

(٢) ــ م، ٢٩٧

(٣) ــ م، ٣٠٣

واتا بەو مانایەیە کــــە چوارچێوەیەکە لە زانستەکان و مەیدانێکی تایبەتە لە تێکۆشانی مرۆڤ و بنکەو بنیاتێکی کۆمەلایەتی یە ۰ هەرچۆنە بیردۆزی ، مەیدانە جۆراوجۆرەکانی ناسین دەگرێتەوە ۰۰۰ لە یاساکانی گەشەکردنی ناسینـــی زانستی و دەوری زانست و پێگەی لە گەشەکردنی کۆمەڵ دا ، لایەنەکانـــی رامیاری ، ئابووری و دەروونی لە لایەنەکانی باسی زانستی دەگرێتــــەوە ۰ هەروەها توانایی بنیاتە زانستی یەکان و پێوەندی یەکانی بە دابەش‌کردنـــی کاری زانستی ۰۰۰ دەگرێتەوە ۰۰۰ ( ۱ )

عمل ؛ کردەوەیەکە کە مرۆڤ لەودا شوێنی خاوەن ئامانج لەسەرشتـــە سروشتی یەکان ،دادەنێ و ئەیان‌گۆرێ ۰ عونسورە ساکارەکانی بریتی یە لـــە تێکۆشانی خاوەن ئامانج یان خودی کردەوە ئامانج بێ ،مادەی کردەوە و ئامرازی کردەوە ۰

عملی زەینی و جەستەیی ؛ دوو جۆرە لە تێکۆشانی مرۆڤ ، لـــــــە سەرەتاوە تاقە تێکۆشان بوە ، بیـــرکردنەوەی زەینی کە لەگەڵ رەنـــــگ دانەوەی جیهان لە زەین دا پێوەندی بوەو هەروەها تێکۆشانی جەستەیی‌کە پێوەندی لەگەڵ شتە مادی یەکانەوە هەیە ، دەگرێتەوە ۰ لە دابەش‌کردنـــی کاردا ، کاری لەشی و کاری زەینی بوو بە بەشی دوو گرۆ ، گەنجەکان بـــۆ کاری لەشی و خاوەن ئەزموونەکان ، کاری زەینیان وەئەستۆ گرت ۰۰۰ ( ۲ )

زمان و مکان ؛ دوو شێوازی بنەرەتی مادین و دوو پەسنی گەوهـــەری لە پەسنەکانی مادەن ۰ پێوەندی یەکانی شوێنی نەلایەن باس لە رێك وێکـی پێوەیەتی رووداوە جاری یەکان لە یەك کات دا دەکەن و لە درێژایـــــــی جەستە مادی یەکان و درێژەدانیانە ۰۰۰ دوو پەسنی دوور لە ئاگـــاداری مرۆڤن و سەربەخۆن و لەگەڵ راستەقینەو رواڵەتەکانی گشت مادەکـــان دا هەن ۰ هەر رووداوێك لە جیهان دا هەبێ ، لە کات و شوێن دا جەرەیانی هەیە ۰۰۰ ( ۳ )

سبب و نتیجە ( علت و معلول ) ؛ دوو چەمکی فەلسەفین کە بـــــە

---

( ۱ ) ــم ، ۳۱۲ ــ ۳۱۱
( ۲ ) ــم ، ۳۱۸ ــ ۳۱٦
( ۳ ) ــم ، ٤٧٤

واتای شیکردنەوەی پێوەندی نەنێوان شتەکان و رواڵەتەکانیان دان • ئـەم پێوەندییە لە هەر شتێك و لە هەر رواڵەتێك دا ، خۆ دەنوێنێ • لـــە شتەکان و رواڵەتەکانی تر سەرچاوەیان گرتوە • پاشان ئەم پێوەندییە بـــە نۆرەی خۆی سەر ئەکێشێتە لای ئەو رواڵەت و شتانەوە کە لەگەڵ ئەوانی تر وەك یەك نین • لێرەدا ناوی " سبب = علیت " دیتە کایەوە بۆ رواڵەتێك کـــە دەبێتە هۆی لەدایك بوونی رواڵەتێکی تر ،کە لەم لایەنەوە بەدی هاتوە کـــە دەبێتە " نتیجە = معلول " • • • (١)

سفسطە • • ماموستا و حەکیم و زانا ، زانیارانە لە بەڵگەهێنانەوەیە ، بـــە چەند بەڵگەکە لە رواڵەت دا دروستەو لە واتا و ناوەڕۆك دا ناد روستە •

ئەویش لە کێشەو باسی بەڵگەی روون دا • " سوفسطائی " بەو ماموستایـــ ـــەیان دەگوت کە نەخشی روون کردنەوەیان هەبوو ، زانیاریان لەنێـــــو خەڵك دا ، بڵاو دەکردەوە • (٢)

ضد • لایەنێکە لە " تناقض " ی دیالکتیکی کە لەگەڵ لایەنی دیکەدا دژایەتی هەیە • بۆ نموونە دژایەتی کرێکار و سەرمایەدار ، سەقامگیربوونـــی شتێك وشاڵ وگۆڕی • یاسای کێشەو یەك بوونی دژەکان لە یاسای پێوەنـــدی گەوهەری بنەرەتی لەنێوان دژەکان دا ، پەردە هەڵدەداتەوە • لە کۆمـــەڵ و بیرو مادەدا هەیە • • • دوو دژلە سەرەتاوە گەشە ناکەن ، شـــــاراوەن ، جیابوونەوەیەکی ئاشکرا پەیدا دەبێ ،خۆ دەنوێنێ • هەرکامە رواڵەتێکـــــی دەرەوەیی بەخۆوە دەگرن ،ئەمنە دوو دژەن لە بەرامبەر یەك دا،کێشەیـــان دەست پێ دەکا بە جۆرێك کە یەکیان ئەویتریان " نفی " دەکاتەوە • لـــە کاتی کێشەیان دا ، شوێنی کاریگەر لەسەر یەکتر داد ەنێن • شــــــەڕی دژەکان ، سەرچاوەو هێزی دنەدەری گەشەکردنی گشت شتەکانە • ئەوکات کە مرۆڤ بیروڕای کێشەی دژەکان ، ئەخاتە بەرباس، لە جموجۆڵی زاتی شـــت تێ دەگا و لەسەر گەشەکردنی رادەوەستێ و بۆی دەسەلمێنێ • (٣)

عنصر • لایەنێکی ساکارە لە جەستە گرێ وگۆڵ دارەکان یان بنیاتـــی

---

(١) ــ م ، ٢٤٩

(٢) ــ م ، ٢٥١

(٣) ــ م ، ٢٨٤

مادی یان دانانە بیروڕایەکانە ٠ واتای عونسور لەگەڵ گەشەکردنی کردەوەیــی زانستیدا ، گۆڕاوە ٠٠٠ ئێستا بۆ واتای هەر بابەتێك چ خاوەن بناخەیەکی گرێو گۆڵدار بێ و چ نەبێ ، پێوەندی لەگەڵ بابەتەکانیتردا لـــــــە چوارچێوەی یەك سیستەمدا ، هەبێ ،بنیات بەواتای پێوەندی لەنێــــوان عونسورەکانی ئەو سیستەمە دایە ٠٠٠ ( ١ )

فرضیە ، بناخە ، سەرچاوە ، .گومانە ، دانان ، گەلاڵە ،لێ پرسینەوە کە بەڵگەهێنانەوە لەسەری تەواو نەبووبێ ٠ بەمەدا لە " نظریە " جیادەبێتەوە کە لایەنی جێی متمانەیەو " برهان "ە ٠ گەلاڵەکردنی و بەڵگەهێنانەوە لـــــە سەری ، لایەنێکی پێویست لە گەشەکردنی کردەوەی زانستییە ٠ گشـــــت زانستەکان لە مەتماتیکەوە ،دەستی پێ کراوەو لە فەلسەفەوە کۆتایی پێ هاتوە و گەشــەکردنەکەی لە جەرەیانی گومانەوە تێپەڕیوە ، تەواوی بیروبۆچوونەکان لــە بنەی گومانەوە ، تێپەڕدەبێ ٠ تێگەیشتنی مادی لە مێژوو لە سەرەتـــاوە ، تەنیا گومانە بوە ٠ پاشان بوەتە بابەتێکی خاوەن بەڵگەی روون ٠٠٠ ( ٢ )

صیرورت ، لایەنێکە لە گۆڕانی رواڵەتەکان و گەشەکردنی تەواو کە بــە واتای سەرهەڵدان و گۆڕانی هێندێکیان بە هێندێکیتره ٠٠٠ ( ٣ )

قانون ٠ پێوەندییەکی گەوهەرییە لەنێوان رواڵەتەکان لە سروشـــت و کۆمەڵدا ، چەمکی یاسا بە واتای گەوهەرونا وەرۆکەوە نزیکە ٠ بەڵام یاســـــا پێوەندی فەردی نیە کە لەسەر رواڵەتێکی دیاریکراو کورت ببێتەوە ، بەڵکـــوو پێوەندییەکی گشتییە کە گشت رواڵەتەکانی ئەم یان ئەو شت لە پەسنەکان ، ئەگرێتە بەر ( ٤ )

قوەو فعل ، وێچوون ، راستی ، دوو چەمکن لە دیالکتیکــــــــــــی مادیدا ، بە واتای دوو پلەی بابەتی پێویست لە گەشەکردنی هەمـــــــوو شتەکان و رواڵەتەکان دایە ٠ هێز " وجود بالقوه " ئەوەی کە ئێستا نیـــە٠ بەڵام لە کاری یاساکانی گەشەکردنی شتی دیاریکراودا ، بۆی هەیە خـــۆ

---

( ١ )م ، ٣٢١
( ٢ )م ، ٣٣٢
( ٣ )م ، ٢٨٢
( ٤ )م ، ٣٧٢

بنوێنێ و گەشە بکا و ئێستا سەر هەڵبدا ۰ بەڵام " فعل " یان راستی ئەوەی کە روونە ، لە داهاتوودا وی ناچێ بەدی بێ و ببێتە راستی ، مەگەر ئـــەو بەشەی کە لە شێوازی وێ چوون دا و پاشان سەرهەڵبدا و ببێتە راستـی ۰ بەڵام راستی شتێکە ئاڵ وگۆڕی بەسەردادێ و گەشە دەکا ۰ هەر شتێکــــــی روالەتی ، هێندێك شتی نهێنی و وێچووی تێدایە ، لە جەرەیانـــــــــی کارکردنی دیاری کراودا ، تەنیا یەکێکیان بەدی دێ ۰۰۰ ( ۱ )

قیاس ؛ بریتی یە لە دیاریکردنی پێوەندی چەندی لەنێوان ئەم یـان ئەو پەسنانەی شتێك و نێوان ئەندازەیەکی دیاریکراو کە وەك پێوانـــــــــە " وحدة قیاس" لەبەرچاو دەگیردرێ ۰۰۰ بەهۆی ئەوەوە ، گەیشتن بـــــە پەسنی وردی ئەم یان ئەو شتە مەبەستە لە پەسنەکان و لە هەل ومەرجی تردا ، بەدی دێ ۰ هەڵبژاردنی پەسنە دەسرنیشان کراوەکان ئەوانەی مل بـــــۆ پێوانە دادەنوێنن ، بە ئەندازەیەکی زۆر پێوەندی بە پلەی گەشەکردنـــــی زانستەوە هەیەو بە " تصورات "ی بیروڕایی کە دانراون ،دیاری دەکــرێ ، بۆ ناسینی گرنگی هەیە ، چونکە باسی چەندی لە زانستی هاوچەـــــرخ دا بەرەویکی بەرفراوانی هەیەو مەیدانی روالەتەکانی سروشت و کۆمەڵی وەك بـــەك گرتۆتە بەر ۰ ( ۲ )

کیف و کم ؛ دوو پەسنی ئەس بابەتین ، لەباری دیالکتیکــــــــــەوە پێوەندییان پێکەوە هەیە ۰ کۆتایەکی لێك جیانەکراوەیە لە شتـــــــــــە دەست نیشان کراوەکان و پەسنەکان ۰ بەواتای دیاریکردنی شتێکە لـــە تایبەتمەندی هەست پێ کراودا ۰ لە وجوودی ئەو شتە مەبەستە ، جیا بێتەوە ۰ نهێنی بوونی شت بەواتای نهێنی بوونی چلۆنایەتی یە ۰ تەنیا لەچوارچێوەی پـێوەندی شتە دیاریکراوەکە لەگەڵ شتەکانی تردا ،خۆ دەنوێنـــــی ۰۰۰ یەکەم پەسنەکانی هەستی شتە بەڵام ناسین لەوێدا راناوەستێ و بــــــەرەو چەندیش دەڕوا ۰ هەروەها بۆناسینی پێوەندی ئەو دووەش هەنگـــــــاو هەڵدەگرێ و دەچێتە نێوەرۆك و ناخی شتەکانەوە ۰ چەندی بە زۆریــــــی بریتی یە لە پەسنەکانی کاتی و شوێنی شت ، ئەوەی کە تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ

---

(۱) م ، ۲۷۸
(۲) م ، ۲۷۸

شتەکانی تردا ، دەدەوزرێتەوە · شتێك لە شتەکانی تر بە بارستایی (حجم) شوێنی دیاریکراو ، بە مادەیەکی کاتی دیاریکراو ، بە کۆڵەکەکانی گفتەکردنی خاوەن سنوور لە کەڵك وەرگرتن " قیاس " دۆزینەوەی پەسنەکانی چەندی شت ، تەواو دەبێ و کۆتایی پێ دێ ،لەودا شتێك لەبەرچاو دەگیردرێ لە دیاریکردنی چەندییەکەیدا وەك پێوانە بۆ ئەوانی تر · لە سەرەتادا بە شێوەی ئەندازەی جیاکەرەوەی شت ، خۆ دەنوێنێ و پێوەندی بە چلۆنییەوە نیە · بەڵام ئاڵۆگۆڕی پەسنە چەندییەکانی شت لە ئەندازەیەکی دیاریکراودا ، سەر ئەکێشێتە لای گۆڕانی چلۆنایەتییە ـ کەیەوە · · · (١)

لادریە : (Agnosticism) ناسین دژوارە ، ڕێبازێکە پێی وایە مرۆڤ ناتوانێ بەگشتی و بەناگشتی " جزئی " گەوهەری دیاردە و شتەکان بناسێ ، ناسینی جێی متمانەیان لێ پەیدا ناکاو تێیان ناگا · · · (٢)

مادە : چەمکێکی فەلسەفییە کە بەواتای ڕاستی بابەتییە · ئەوەی لە هەستەکانی مرۆڤدا ، رەنگ دەداتەوە ،و بە شێوەی سەربەخۆ لە هەستەکان وجودی هەیە · · · (٣)

مادی تاریخی : بەشێکی بنەرەتییە لە فەلسەفەی مارکسیستی لینینیستی و زانستی فەلسەفی سەبارەت بە کۆمەڵەو ڕێبازی کۆمەڵ ناسی گشتییە · (٤)

مادی دیالکتیکی : فەلسەفەی مارکسیستی لینینیستییە کە لەنێوان چارەسەرکردنی مادی مەسەلەی بنەڕەتی فەلسەفی و دیالکتیکدا ، ڕێك خستنێکی ئۆرگانیکی ، پێك دێنێ · کۆیان دەکاتە ، زانستی یاسا گشتییەکان بۆ گەشەکردنی رواڵەتە ڕاستییە بابەتییەکان و کردەوەی ناسین ، ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانەیە بۆناسینی ڕاستی و

---

(١) ـ م ، ٣٨٨
(٢) ـ م ، ٣٩١
(٣) ـ م ، ٤٠٢
(٤) ـ م ، ٤٠٨

گۆڕانی ... (١)

مارکسیستی لینینیستی : چوار چێوەیەکی کردەوەیە، بۆ هەمیشە لە گەشەکردن دایە. لە بیروڕای فەلسەفی، ئابووری و کۆمەڵایەتی و بیروبۆچوون پێك هاتووە کە بۆچوونی چینی کرێکار لەسەر جیهان و ئاڵ وگۆڕی نیشان دەدا ... (٢)

ماهیت و ظاهر : دوو لایەنی بابەتێکن کە پێوەندی دیالکتیکییان پێکەوە هەیە "ماهیة" باسی پێوەندی بەکردەوەی، نێوخۆیی شت دەکا، کە پێویست و بە نیسبەت سەقامگیرە، کە شتە دەرنیشان کراوەکان و مەسەلەکانی لەهەریەك لە ئەندامەکانی، دەگرێتەوە. لێرەدا یەك بوونی لە جۆراوجۆربوونی مەسەلەکان ذا، رادەگەیەنێ. "ظاهر". بریتی یە لە مەسەلە رواڵەتی یەکانی دیاردەکە بە هەست و ئەزموونی هەستی پێیان دەزاندرێ. لە رواڵەت دا ئەو یاسایانەی دیاردە دەدوزرێنەوە کە ناوەرۆکیان پێك هێناوە ... (٣)

مضمون و شکل : دوو لایەنی یەك دیاردەیان کردەوەیەکن کە پێوەندی دیالکتیکییان پێکەوە هەیە. "مضمون" بناخەی مادیی را وەستاو لەوپەڕی ئاڵ وگۆڕی دیاردەوە، بریتی یە لە کارلێکەرە عونسورە جۆراوجۆرو پەیوەند و ئەرکەکانی بابەتێك ... "مضمون" هەرشتێك یان هەرکردەوەیەك بە شێوەیەکی دیاریکراو رێك و پێکە. هەرشتێك سەقامگیربوونێکی نیسبی هەیە. بنچینەیەکی تایبەتی هەیە. شێوازی ئەم جۆرە سەقامگیربوونە، تەوجیه دەکا، باس لەسەر بنچینەی نێوخۆیی دەکا ئەو شتەی کە لە رێك و پێکی دەرەوەیی دا، دەدوزرێنەوە ... (٤)

مطلق : (Absolute) بێ گرێ وگۆڵ، نەبەسراوە. چەمك. لە فەلسەفەی ئیدیالیستی دا بەواتای "ذات"ی بەرج هەڵنەگرو بێ گرێ وگۆڵ، سەربەخۆ و لەسەر پێی خۆ راوەستاو، کەڵکی لێ وەرگیراوە.

---

(١) ـم، ٤١٠
(٢) ـم، ٤٢٠
(٣) ـم، ٤٢٤
(٤) ـم، ٤٥٩

" مثْل " " اللّه " روحی جیهانی لای هیگل ، ئەون . ئیستا بەواتـــــای دیاردەو شتی بەمەرجە کە گومانی تێدانیەو لە بەرامبەر چەمکی " نیسبی " و بەمەرج و گرێوگۆڵ دار و رێبواردا ، ئەڵێی لێ وەردەگیردرێ .

معقول : شتێکە یان روانەتێکە تەنیا بە هۆش دەناسێندرێ یان بەهۆی " حدس "ی هۆشی یەوە . لە بەرامبەر هەست پێ کراو " محسوس " دایـــە . " مُثُل "ی افلاتون و شتی لە " زاتی خۆیدا "ی کانت ئەگرێتەوە . ( ١ )

منطق : زانستێکە کە یاساکانی بیرو شێوازەکانی و رێگای گەشەکردنـــی ناسین و کۆنکی هۆینەوە ، ناسینی بەکردەوە ، ئەخاتە بەرباس .

منطق دیالکتیکی : ناسینی یاساکانی بیرو داڕشتنی گشتی و رێگـــای ناسینی زەمین بەرەو راستی بابەتی ،زانستی پێوەندی چەمکـــــــــــــــــــە فەلسەفی یەکانە ... ( ٢ )

منطق ریاضی : پلەیەکی هاوچەرخە لە گەشەکردنی " منطق صوری " کە جاری وایە پێی دەڵێن " منطق رمزی " . ئەو بیرکردنەوەی کە واتایەکـــی دیاریکراو ئەگرێتەوەو لە " منطق ریاضی " دا رەنگ دەداتەوە ، لە مێشکی مرۆڤ دا لەو چوارچێوەی ژیرێژییاندا کە بە شێوەیەکی تایبەتـــــــــی بناخەیان دانراوە بەراوەژوو دەبێتەوە ... ( ٣ )

منطق صوری : زانستێکە کە لە شێوازەکانی بیرکردنەوە دەکۆڵێتەوە وەك چەمك و بڕیار ، ئاکام وەرگرتن و بەڵگە . لەلایەنی لەسەریەك دانانـــــــــی ( ترکیب )ی ژیرێژی یەوەو بە شێوەیەکی رووت کراوە لە واتا هەست پـــێ ـــ کراوەکەی کە لەودا رەنگی داوەتەوە ... ( ٤ )

منطق علم : باسێکە لە زانستدا ، لە یاسا ژیرێژی یەکانی ناسینی بە کردەوەیی دەکۆڵێتەوە . ناسینی زانستی هاوچەرخ باڵی بەسەر مەیدانـــی زۆردا ، راکێشاوە . بەلام ، لە گشت مەجالە گشتی یەکانی دا ، نیشانـــــە گشتی یەکانی ،دەدوزرێتەوە . کە جیایە لە گشت بیروبۆچوونێکی زانستــــی .

---

( ١ ) ــ م ، ٤٦٥

( ٢ ) ــ م ، ٤٨١

( ٣ ) ــ م ، ٤٨٤

( ٤ ) ــ م ، ٤٨٦

لێرەدا بەکارهێنانی ئامرازی جۆراوجۆری ژیریی، ئەوانەی کە دارشتنی هەر کۆشکێکی زانستی بێ ئەوان، دژوارە، کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. بابەتی ژیریی زانستی ،بریتی یە لە وەدەرخستنی ئەو نیشانانەو شی کردنەوەیان ...

منظومە ، (System) کۆگایەکە لە عونسورە هاوپێوەندییەکان بە شێوەیەکی دیاریکراو ،ئەوەی کە یەك گشتی پێك دێنن ... مەرجەکە بە نیسبەت کۆگایەکی تەواوکەری یەکترن ... وەك جۆر (نوع) و دایرەی پێوەندییەکان و هتد ... (١)

نفسی ، چەمکێکە بەواتای جیهانی دەروونی مرۆڤ و گیانلەبەرانی بەرەوپێش چوو. هی مرۆڤ لەگەڵ هی گیانداراکان جیاوازە. چونکە هی مرۆڤ ئەتوانێ بناخەی ئیشارەو مێما دابنێ و خاوەن سروشتی کۆمەلایەتی یە جێگای کێشەی ماتریالیسم و ئیدیالیسمەو زانستی دەروون ناسی لێی دەکۆڵێتەوە ... (٢)

نفی نفی ، یاسایەکی بنەڕەتی یە لە یاساکانی دیالکتیك. هیگل یەکەم کەسە کە ئەم یاسایەی دارشتوە ... (٣)

واحدیت ، تاقانە، سەرچاوەیەکی فەلسەفی یە ،پێی وایە گشت بوونەوەرەکان لەبنەڕەت دا یەك و یەك بناخەیان هەیە لە بەرامبەر دووبەرستی یەوە دانراوە ... (٤)

وجود ، چەمکێکە لە فەلسەفەی مادی دیالکتیکی دا بە واتای گشت جیهانێکە کەئێمەی داگرتوە،بەشێوەی سەربەخۆلە ناسینی ئێمە هەیە. (٥)

وحدت عالم مادی ، سەرچاوەیەکی بنەڕەتی یە لە فەلسەفەی مادی لە هەنگاوە بەرینەکانی دا ،پێی لەسەر ئەوە داگرتوە کە جیهان خاوەن سەرچاوەی مادی یە.

---

(١) ــم، ٤٨٧ــ٤٨٨
(٢) ــم، ٥٠٦ــ٥٠٧
(٣) ــم، ٥٠٧
(٤) ــم، ٥٢٧
(٥) ــم، ٥٢٩

وحدت وجود : رێبازێکی فەلسەفی یە · پەیڕەوانی پێیان وایە خـوا و سروشت یەك شتن و یەك دەگرنەوە ، هەردووکیان یەك گشتی پێـك دێنن · ( ۱ )

بەشی سێهەم :

## مەسەلەی بنەرەتی فەلسەفـە

وەك باس‌کرا فەلسەفە دەی‌هەوێ جیهان بناسێ و بۆ گۆڕانی هەوڵ بدا و ئاڵ‌وگۆڕ لە بیری مرۆڤ دا پێك بێنێ · دوو جۆر بۆچوونی جیاوازلـەم پێ‌یەدا هەیە · پاش ئەوە باسی مادەو روح کراوە کە مادە چی‌یـەوروح کامەیە ؟ پاش‌ئەوە مەسەلەی بنەرەتی فەلسەفی کە بریتی‌یە لـەوە : روح خوڵقێنەری مادەیە یان مادە خوڵقێنەری روحە ، ناسینی ئێمە تاچ ئەندازە بە راستی‌یەکان دەگا و چەندە دەتوانین بە بیری خۆمان کە ئاکامـی هەڵس‌و کەوتی کۆمەڵایەتی‌یە ، لە گۆڕانی جیهان و کۆمەڵ دا شوێـن دابنێین ،بە وردی بخەینە بەر لێکۆڵینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ کە بیـرو بۆچوونە جۆراوجۆرەکان چۆنن و ئیدەئالیستی زەینی و عەینی کـەن و ماتریالیسم بە لق و پۆپەکانی‌یەوە کامەیە ؟

مادە : هەموو جیهانی دەرەوەی زەینمان کە کار دەکاتە سـەر ئەندامەکانی هەستمان و ئەبێتە هۆی هەست پێ‌کردنمان بەو شتانـە ، دەوترێ مادە · ( ۲ )

مادە وتەیەکی فەلسەفی‌یە بۆ دەربڕینی راستی مەوزوعی یان ئەمەیە کـە مرۆڤ بەهۆی هەست پێ‌کردنەوە ،تێ‌یان دەگا · مادە ئەوەیە کە کار دەکاتـە سەر ئەندامەکانی هەست‌کردنمان و هەستمان دەبزوێنێت · مـادە راستی‌یەکی مـەوزوعی‌یە و لە هەست دا پێمان دراوە شتی لەم بابەتـە مادەیە · لێرەدا مرۆڤ بە پێی عورف پێی وایە هەموو شتێك سەرەتا و کۆتایی ـ

---

( ۱ ) ـ م ، ۵۲۸ ـ ۵۲۷

( ۲ ) ـ کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیکی ،پێشوو ، بەرگی ۲٦

بێ ماتێکی هەیە ، وەك ماتریالیستەکان دەڵێن ، ئەگەر مادە هەمیشەیی و بێ سەرەتایەو کۆتایی بێ نایە ،ئەم پرسیارە چی بەسەردێ کە ، کێ مادەی خوڵقاندوە ؟ • زانست دەڵێ مادە هەمیشەو هەر لە کۆنەوە هەر بووە ، سەرەتای دەسپێکردنی نیە • جیهانێکی نەمادی نیە (١) بێجگە لە مادەی خاوەن جموجۆڵ و پەرەسەندوو ، بەردەمەکانی هیچ جۆرە چەشنێکی تر وجودی نیە • یەکیەتی جیهان ئەوەدایە کە مادەیە (٢) لەبەر ئەوە بەش بەشەکانی مادە ، خاوەن سنوورن ، بێسنوور بوونی شوێن یان جیهان ( بێپایان بوونی مادە ) بەم هۆیە ، هەرچەند بوونی راستەقینەیان هەیە ، هۆش نای پێکێ • کاتێك بەش بەشەکان هەتا هەتایی نەبن ، دیاری کراو و خاوەن سنوور بن ، گشت مادە ناتوانێ لەم چلۆنایەتیە ، بەپێچەوەرا ئەمە قسەی " اسکات "ە • برتراند راسل لە کتێبی " چەمکی نیسبەتی ئەنیشتەین " دا نووسیویەتی • پاش لێکۆڵینەوەی کورتی دوو جۆر جیهانی نەبێ سنوور ( محدود ) ناچارین ئەم بیردۆزییە پەسند بکەین کە پەندێك " الکترووپرۆتۆن " جیهانی مادی یان پێك هێناوە ، لە کتێبی " علتی بەرمعلولها " دا لەم بارەوە بە درێژە باسی کراوە • ( علتی بر معلولها ، نووسراوی سید محمد باقر نجفی ، ١٣٥٢ ی هەتاوی ٨٩ـ٩٣ )

دیارە ئەو بەڵگە کە دەڵێ بەش بەشەکان " محدود " ن ، پێویستە گشت جیهان ئەو پەسنەی هەبێ لەباری فەلسەفەی زانستی یەوە دروست نیە چونکە بەشەکان لە تێکەڵاوێك یا جوزئێك لە کولێك ،پەسنێکی هەیە کە گشتی یەکە لەکاتی کۆبوونەوەی بەشەکان دا ،ناتوانێ وەك یەکێك لە بەشەکان بێ • بۆ نموونە ، ئۆکسیژن و هیدرۆژن ، جیاجیا پەسنێکیان هەیە هیچ کامیان بە تەنیا ئاو نین ، بەڵام کە کۆبوونەوە ، پەسنێکی تر کە " ئاو " ە پەیدا دەکەن •

میتافیزیسیەنەکان دەڵێن ، جیهانی مادی ، خوڵقێندراوی شعووری بەرباڵاو ( مطلق )ە • خوداپەرستان پێی دەڵێن " خودا " •

---

(١) ــ کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیکی ،پێشوو، بەرگی ٢٩ ــ ٢٨
(٢) ــ هەر ئەم سەرچاوە ، بەرگی ٤

ماتریالیستەکان پێیان وایە ، ریشەی فەلسەفەی ئیدەئالیستی ئایینە ، چونکە وەك ئایین بە جیهانێکی تر بڕوایان هەیە . هەروەك باس دەکەین ئیدەئالیستەکان لە مەسەلەی ناسین دا لەسەر ئەو بڕوایەن ، رەنگدانەوەی شتەکانی جیهانی دەرەوە لە زەین دا ، ناسینەو ئەو وێنە زەینییە بنەڕەتە ، نەك جیهانی دەرەوە . ئەمەیان ئیدەئالیسمی زەینییە . و ئیدەئالیسمی عەینی دەڵێ : نە ئەو وێنەی جیهانی دەرەوە نە خودی جیهانی دەرەوە ، هیچ کامیان ، راستی نین و جیهانێکی دیکە هەیە کە ئەم جیهانە وێنەی ئەوەو ئەو بنەڕەتە . دیارە رێبازێکی دیکە هەیە کە نە وەك ماتریالیسم بیردەکاتەوە نە وەك هەرد ورك ئیدەئالیسم کە پێی دەڵێن " رئالیزم " .

بەهەرحاڵ بەبڕوای ئەوان ئیدەئالیسم دریژەی هەڵوێستی ئایینییە سەبارەت بە مەسەلە جۆراوجۆرەکان ، لە خورافات و بڕوا بە سەرەوەی سروشت و شتێکی نەناسراو ، جوێ نابێتەوە . لە حاڵێك دا ماتریالیسم بەشوێن شی کردنەوەیەك دەگەڕێ کە پێوەندی بە جیهانی مادییەوە هەیە . بەشێوەیەك کە لە مەیدانی کردەوەدا دەکرێ راست بوونی بسەلمێندرێ . لە عەینی کات دا ئەوەش دەسەلمێنێ کە چەمکە ئایینییەکان لای ئیدەئالیستەکان واتا چەمکەکانی هەستییەکانی روحی سەرەوەی سروشت، ریشەی زۆر قووڵیان لە گەشەکردنی مێژووی زانیاری کۆمەڵ دا هەیە . بەڵام سەرچاوەکانیان چییەو لە سەرەتاوە چۆن پەیدابوون ، ئەگەر بڵێین سەرچاوەی سروشتییان هەیەو بۆمان بسەلمێندرێ ، کارمان هاسانەو ئەو کات دۆزینەوەکانی خودایی و هۆیەکانی و سەرەوەی سروشت ، نایەنەکایەوە . بەبڕوای ئەوان ئەم چەمکانە لە نەزانین و سەرلێشێواوی مرۆڤ لەبەرامبەر سروشتەوە ، سەرچاوە دەگرن . ( ١ )

روح ، جەستە ، خودا ، مرۆڤ یان پاشایەتی ئاسمانی و زەوینی و ئەو شێوازەو باوەڕانەی کە شعووریێ یان دەزانێ ،هەروەها جیهانی راستییە مادییەکان کە بەهۆی هەستەکانەوە ، دەرك دەکرێن ، تایبەتن بە ئیدەئالیسمەوە . لە ئیدەئالیسمی زەینی دا ئەم شێوە لە جیٚدانانە ، تا

---

( ١ ) ــ موریس کونفورت، پێشوو ، بەرگی ٢٥ ــ ٢٤

بێ سنوور دەبێتە پێشەوەو دەگاتە ئەو جێگایە کە جیهانی مادی دەبێتە گومان و وای لێ دێ کە تەنیا جیهانی نامادی ئەبێتە راستەقینە . بۆ ئیدەئالیسم هەمیشە جیهانێکی بەرزترو راستەقینەترو نامادی هەیە کە لە پێتر جیهانی مادی دایە ، هۆ و سەرچاوەی سەرەتای جیهان (ازلی) یەکە جیهانی مادی پەیرەوی‌یەتی . لە هەمان کات دا تەنیا یەك جیهان واتا جیهانی مادی بۆ ماتریالیستەکان هەیە .

ئێستا مەسەلەی بنەڕەتی و گرنگی گشت فەلسەفەکان ، پێوەندی بە بیرکردنەوەو هەستی‌یەوە هەیە .

هەروەك گوترا باسی ئێستا ئەوەیە کە روح لە پێش ماددایە یان مادە لەپێش روح دایە ؟ کە پێویستە وەك گرنگترین باس سەرنجی بدەین و ریشەی کێشەکەو گەلالەکردنەکەو راست رۆیشتن و لادانەکان روون بکەینەوە .

ئەوەمان زانی کە فەلسەفە بریتی‌یە لە لێکۆلینەوە لە گشتی‌ترین مەسەلەکان و جیهان و مرۆڤ شی ئەکاتەوە . لەم بوارەدا بیروبۆچوونی زۆر هەن کە لێرەدا دوو جۆر بۆچوونی گەورە هەیە کە دەخرێنە بەرباس :

١ــ بۆچوونی زانستی

٢ــ بۆچوونی نازانستی

سەبارەت بە مادەو روح ، فیلسوفەکان دیاردەکانیان بە دوو بەش دابەش‌کردوە : شتە هەست پێ‌کراوەکانی دەوروبەرمان . ئەوانەی کە بۆ ئەندازەگرتن و هەست پێ‌کردن و دیتنی نین . وەك بیروتێگەیشتنەکانمان . کەوابوو ئێمەش دوو جۆر شتمان هەیە : یەکێك هەست پێ‌کراوی مادی . دووەم ئەوانەی لە ناوچەی رووح و بیردان .

بە جێگای باس‌کردن لە روح ، لە بیروبۆچوونی خۆمان " شعوور " و گیان باس دەکەین . هەروەها لەکاتی وت ووێژ لە مادە باسی سروشت و جیهان و زەوی و وجوود ، دێنە کایەوە . لای ئەنگلس وجوود هەمان مادەیەو بیریش هەمان " روح "ە . بۆ ناساندنی بیر یان روح و وجوود و مادە دەلێن : فیکر ئەو وێنەگرتن و بۆچوونەیە کە ئێمە سەبارەت بە دیاردەکان هەمانە . هێندێك لەم وێنەگرتن و بۆچوونانە لە هەستەکانمانەوە ، وەدەست دێن وەدی دێن و پێوەندی‌یان بە دیاردە مادی‌یەکانەوە هەیە . هێندێك بۆچوونی تر وەك چەمکی خودا و فەلسەفە ، بێ سنوورن .

بە بۆچوونی ماتریالیستەکان ، خودی بیر شتێکی مادییەو پێوەندی بە ئەوەوە هەیە • ئەو مەبەستە بنەڕەتییەی کە پێویستە لەبەرچاومان بێ ، ئەوەیە کە ئێمە بۆچوون ( تصور ) بیرو هەستمان هەیە ، چونکە ئەبینین و هەست پێ دەکەین •

مادە یان وجوود شتێکە ، کە هەست و ئیدراکەکانمان بە ئێمەی نیشان دەدەن و ئێمە لەو شتە ئاگادار دەکەن • بەگشتی هەموو ئەو شتانەیە کە لە دەوروبەری ئێمە دان • ئێستا باس ئەوەیە مادەو روح ، مێشك وبیر ، کامیان گرنگترن ، کامیان بەسەر ئەویتردا زالە ، کامیان پێش ئەویتریانە ئەمە پێی دەڵێن مەسەلەی بنەڕەتی فلسفە • ( ١ )

مەسەلەی بنەڕەتی • پاش مردن چمان بەسەردێ ،جیهان لەکوێ را هاتوە ، زەوی چۆن دروست بوە ؟ ئەمانە چەند پرسیارن کە مرۆڤ لە خۆی دەکاو دژوارە بڵێین ، شتێك هەمیشە هەیەو هەمیشەش دەمێنێ • ئایینی مەسیح دەڵێ • روح لە سەرەوەی تاریکییەکان لە جموجۆڵ دابوو ، پاشان مادە بەوجوود هات• مرۆڤ ئەمە بە هاسانی پەسند دەکا • مرۆڤ لە بیروڕای خۆی دەپرسێ لە کوێوە بەمجۆرە پێوەندی روح و مادەو مێشك و بیر بۆ ئێمە دێتە کایەوە ؟ بۆ نموونە چ پێوەندییەك لەنێوان ویست و توانین دا هەیە ؟ خوازیاری بریتییە لە روح و بیرو توانایی ئەوەیە کە دەکرێ و دەگونجێ واتا مادەو وجوود • هەروەها دەتوانین سەرنجی پێوەندی نێوان " وجوودی کۆمەڵ " و " شعووری کۆمەڵ " بدەین • • • هەروەها وەك وتمان وڵامەکان بەگشتی دووجۆرن • زانستی و نازانستی •

## بیرو بۆچوونە فلسەفییە جۆراوجۆرەکان •

یەکەم ـ ئیدەئالیسم وەك باس کرا لە مەسەلەی ناسین دا ، رەنگ ـ دانەوەی جیهانی دەرەوە لە زەین دا پاش بەرەوڕووبوونی مرۆڤ لەگەڵ شتەکان دا ، لای ئیدەئالیستەکان بەواتای ناسینە •بەڵام ماتریالیستەکان

( ١ ) ـ ژورژ پۆلیستر ، اصول مقدماتی فلسفە ، نووسراوی موریس لوگویا آ ، ١٩٤٦ ، لاپەڕی ٢٠ ـ ١٧

مەرجی سێهەمیان بۆ دانا وە ئەویش، کارێك و شوێن دانانی مرۆڤ لەسەر شتەکان و سروشتە • کە بەبڕوای ئەوان ئەوکات ناسین تەواو دەبێ • ئەمە یەك جیاوازی بەرچاوە ،جیاوازی دووهەم ئەوەیە کە بە وتەی ماتریالیستەکان، مرۆڤە سەرەتاییەکان پێیان وابوو هەر مرۆڤێك تێکەڵاوێك لە دوو جۆرە • ئەم بۆچوونە ئەوانی بەو پلەیە گەیاند کە بیرو هەست پێکراوەکان بەهۆی لەشیانەوە دروست نەکراوە ، بەڵکوو بەهێزی روحێکی تایبەتییەوە کە لەم لەشە دایەو لەکاتی مردنی لەشەکان دا بەجێیان دێڵێ ، دروست بوون • • • (١) لێرەوە بیرکردنەوە لە هەمیشەیی و هەتاهەتایی روح یان رەوان و وێچوونی تریانی روح لەوپەڕی مادەوە ، بەوجوود هات • پاش افلاطون ٢٥٠٠ سال پێش مادەو فیکر بەراشکاوی لە بەرامبەر یەکتر دا ، دانران •

ئەوان پێیان وایە مرۆڤ ماوەیەکی زۆر پێی وابوو ، مرۆڤ پاش مردن بە ژیانی روحی درێژە دادە • روح جۆرە جەستەیەکی بریقەدارو سووکە ، بەڵام ساکار نیە • بە چەند خودا بڕوایان هەبوو کە توانایان لە مرۆڤ زۆرترە ، بەڵام پێیان وابوو لە قاپوری مادەدان ،پاشان بە چەند خوداو سەرەنجام بە یەك خودا گەیشتن • دەروونی ،بێ (جزء) و بێ خەوش • لە ئاکامدا بەو دەروونانە بڕوایان پەیداکرد کە ژیانی تایبەتی خۆیان هەیەو بۆ درێژەدان بە ژیانیان نیازیان بە جەستەیەك نیە • پاشان وای لێ هات ، ئایا جیهان خوڵقێند راوی خودایە یان لە سەرەتاوە بوە؟ ( وەك وتمان فیلسوفەکان بە چەند شێوە وەڵامیان داوەتەوە) بە پێی وەڵامەکان دوو گرۆ فیلسوف پەیدا بوون ، ئەوانەی بە گومان و تەنیا بە بیروبۆچوون و شی کردنەوەی نازانستی هاتوونەتە مەیدان و بێ بەڵگەی زانستی هێنانەوە ، جیهان بە خوڵقێند راوی روح دەزانن ، " ئیدەئالیست "ن •

ئەوانە کە پێیان وابوو دەبێ جیهان بەشێوەی زانستی شی بکرێتەوە و مادە یان بە عونسوری سەرەکی و بنەرەتی دانا وە ، رێبازە جۆراوجۆرە ماتریالیستییەکانیان پێك هێناوە (٢) بە وتەی ماتریالیستەکان لە

---

(١) ــ اصول مقدماتی فلسفه ، پێشوو ، لاپەڕی ٢١ ــ ٢٠

(٢) ــ ژورژ پولیستر، اصول مقدماتی فلسفه ،پێشوو، لاپەڕی ٢٢ ــ ٢١

ەزموونەکانمان دا ،دەردەکەوێ کە لەشی بێ روح و فیکر وەك بەرد ، ئاسن و خاك هەیە ، بەڵام کەسێك نەیدیوە ، روح و بیری بێ لەش هەبێ .

وەڵامی ئەو پرسیارەکە مرۆڤ چۆن بیر دەکاتەوە ، دوو جۆرە :

١ ــ مرۆڤ بیردەکاتەوە چونکە روحی هەیە .

٢ ــ مرۆڤ بیردەکاتەوە چونکە مێشکی هەیە . مادییەکان ئەو شتـــــە ئاوەها گەڵاڵە دەکەن : ئایا مێشك فیکری خوڵقاندوە یان فیکر مێشکـــــی دروست کردوە ؟ وەك وتمان وەڵامی ئەم پرسیارە دوو رێبازی ناســـــراوی فەلسەفی دیاری دەکا . ( ١ )

سروشتی فەلسەفە لە سەر چارەسەرکردن و لێکدانەوەی ئەو مەسەلـــــە راوەستاوە . دوویاتی دەکەمەوە ماتریالیستەکان ، بە بوونی سەربەخـــــۆی شتەکانی دەرەوەی زەین ، بڕوایان هەیە . ئیدەئالیستەکان پێیان وایە ئەم دیاردانە تەنیا لە هۆشمەندی مرۆڤدان ، لە جیهانی زەین دا ، چونکــە مرۆڤ بەرەورووی دیاردەکان دەبێ ولە رێگای هەستەکانەوە ، دێنـــــە جیهانی زەین ، کەوابوو بوونیان پێوەندی بەو بەرەورووبوونەوە هەیـــــە ( ئیدەئالیسمی زەینی ) . کەوابوو لە جیهان دا دوو کۆمەڵە دیاردە هەن، هێندێکیان سەربەخۆن و لە هۆشمەندی ئێمەو لە دەرەوەی هۆشمەندیمان دا هەن ( دیاردەی ماتریالیستی ) . بەڵام کۆمەڵی دووەم تەنیا لەهۆشمەنـــدی مرۆڤدا هەن ( دیاردەی ئیدەئالیستی ) . پرسیار ئەوەیە ، پێوەنـــــدی نێوان ئەم دوو دیاردەیە کامەیە ؟ کامەیان لەپێش و کامەیان لەپاشـــــە ؟ جیهانی مادی و سروشت لەپێشە یان جیهانی هۆشمەندی ؟

ئەمە مەسەلەیەکی بنچینەیی لەگشت فەلسەفەیەك دایە . مەسەلەیەکی تـــر ئەوەیە : ئایا مرۆڤ دەتوانێ جیهان بناسێ و بۆچوونێکی راستەقینەی لـــێ پەیدا بکا یان نا ؟ ماتریالیستەکان پێیان وایە جیهانی مادی و سروشتی یەکەمەو هۆشمەندی دووەمەو ئاکامی جموجۆڵی سروشتە . ئیدەئالیستـــــە زەینییەکان پێیان وایە : هۆشمەندی یەکەمەو مادەو سروشت دووەمـــــە و ئاکامی هۆشمەندییە . ( ٢ )

---

( ١ ) ــ اصول مقدماتی فلسفه ، لاپەڕی ٢٣ ــ ٢٢

( ٢ ) ــ کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیکی ،پێشوو، بەرگی ١٢ ــ ١١

پێم‌خۆشە لێرەدا پەردە لەسەر ڕاستی یەك هەڵدەمەوە ، ئەویش ئەوەیە کە ماتریالیستە هاوچەرخەکانی ئەم چەرخە ، لەگەڵاڵەکردنی ئەم باسەدا ، هەموو لایەنی باسەکەیان شی‌نەکردۆتەوە ! ئەو بەشەی کە خۆیان بەڕاستی دەڵێن ، هۆشمەندی ئاکامی گەشەکردنی مادەیەو لە جەرەیانی جموجۆڵ و بەرەوپێشچوونی مێشکی مرۆڤ دا و لە ئاکامی هەڵس‌وکەوتی کۆمەڵایەتی‌دا سەری هەڵداوە ، ڕاستی‌یەکی حاشاڵێ‌نەکراوە . بەڵام تەواوی بیروبۆچوونی ڕێبازە ئایینی و ئیدەئالیستە زەینی‌یەکانیان شی نەکردۆتەوە ! وەك ڕامان گەیاند ، ئەم باسە باسی ناسینەو باسی کەرەسەی ناسین‌و شوێن دانانی دیاردەکانە لەسەر دەزگای ناسینی مرۆڤ . باسی ئەوە نیە کە شعوور و هۆشمەندی مادەو سروشت بخولقێنێ و ئەم ئاکامی ئەو بێ . کەوابوو کاتێك هەربەپێی چوارچێوەی ناسینی ماتریالیستی وتمان ، ناسین بریتی‌یە لە بەرەورووبوونی مرۆڤ لەگەڵ دیاردەکان ، شوێن دانانی دیاردەکان لەسەر هەستەکان ( ڕەنگ دانەوە ) و سەرەنجام شوێن دانانی مرۆڤ لەسەر دیاردەکان ، واتای پڕبەپێستی ئەم ناسینە حاشاڵێ‌نەکراوە ئەوەیە : تا مرۆڤ لەگەڵ دیاردەکان بەرەوروو نەبێ و هەستی‌یان پێ‌نەکا ، لە زەینی ئەودا ، دیاردەکان بوونیان ( چ بەشێوەی وێنەی ساکارو چ لەباری ناسینی قووڵ دا ) بۆ سۆفی ناسێنەر ناسەلمێندرێ . کەوابوو لە چوارچێوەی ناسین و لەو پێوەندی‌یەدا کە ئیدەئالیستە زەینی‌یەکان دەڵێن ، لە ناسین دا شتەکان ، دیاردەکان و بوونیان ، پێوەندی‌یان بە منی " فاعل " ی ناسینەوە هەیە ، چونکە کاتێك من هەست بە بوونیان دەکەم کە بەرەورووییان بم ، بە دەست ، چاو ، گوێ و چێژتن و بۆن کردن ، هەستیان پێ‌بکەم و پاش‌نەمانی ئەو بارودۆخە ،دیاردەکان لەسەر زەینم و بەهۆی ئامرازی‌ناسین یان هەستەکانەوە ، شوێن دابنێن . ئەو پێوەندی‌یە لە بواری ناسین دایە واتا ڕەنگ دانەوەیان لە زەین دا پاش‌بەرەورووبوون لەگەڵیان، بوونیان لە عەین داو لە جیهانی دەرەوەی زەین ، بۆمن ئەسەلمێنێ . کەوابوو بۆمن و لە پێوەندی لەگەڵ من دا ، ئەوکات دیاردەکان هەن کە من بەو جۆرە هەستی‌یان پێ‌بکەم .

ئینجا ئەگەر دیاردەکان لە دەرەوەی هۆشمەندی‌دا نەبن ، چۆن‌شوێن لەسەر جیهانی زەین و هۆشمەندی دادەنێن ؟! شتی نەبوو کوا

شوێنەواری هەیە؟! چۆن هەستەکانمان بەوانەوە پێوەندی بگرن؟! ڕاستی ئەوەیە ئەو بوونەو شێوەی ئەو بوونە، بوونی ناسینەکە " ذات = مـــن " " موضوع = دیاردە " لە کردەوەی ناسین دا، دەناسێ و هەست بــە بوونی دەکا نەك بوونی دیاردەکان لە جیهانی دەرەوەو سەربەخۆ و بوونی ڕاستەقینەو دوور لە هۆشمەندی مرۆڤ. باسەکە باسی ناسینە نـــەك خولّقاندن و هۆ و ئاکام.

ڕاستە هێندێك لە ئید ەئالیستەکان وەك بریکلی لە سنـــووری ڕاستی یەکان تێپەڕ بوون و ئەوەندەیان پاڵ داوەتە زەینەوە، کەدیاردەکانی سەربەخۆ لە هۆشمەندیان لەبیرکردەوە، بەڵام وا باشە، شت چۆن هەیەو گوتراوە بخرێتە سەر کاغەز. ئەگەر کەسێك شتێ وای گوتبێ هێندەیـــان زەق کردۆتەوە کە ئەوەڕی دیارنیە! بۆ نموونە دەڵێن ئید ەئالیستەکان پێیان ـــ وایە مادە هەرنیە و دەس ناکەوێ و لەبەین چوە! (١) هەر ئەوەنـــدە دەڵێن، نەماوە! بە واتای ئەوەیە لەپێش دا بوە. کەوابوو ناڵێن نیـــەو نەبوە.

ماتریالیستەکانی ئەم چەرخە لە نووسینەکانیان دا، شتێکی تریـــش بەراوەژوو، نیشان دەدەن کە هەر ئێرە جێگایەتی و باسی لێ دەکــەم، بە ئامان و زامانەوە ناوەستن و باسی ئەوە دەکەن کە هاوخەڵکینـــە! ئید ەئالیستەکان دەڵێن: دیاردەکانی دەرەوەی زەین، ئاکامـــی هۆشمەندین و ئێمەی ماتریالیست دەڵێن، هۆشمەندی ئاکامی تێکۆشـان و گەشەکردنی مادەیەو هۆش بەرهەمی گەشەکردنی مێشکی مرۆڤە. بەڵام باسی ئەوە ناکەن کە چ خاوەن ئایینەکان و چ ئید ەئالیستەکان وەك هیگـــل پێیان وایە کە جیهان بەگشتی بە دیاردەو بەنادیاردیەوە، بە هـــۆش و شعوورو مادیەوە، خولّقاوی شعوورێکی " مطلق " ە و ئەو دووئالیستی یەی کە لەگشت گەردیلەو چووکەترو دیاردەو بەشەکانی تری مادەدا بە شێـــوەی دژەکان، خۆیان دەنوێنن، بەگشتی لە جیهانیش دا هەیەو جیهـــان تێکەڵاوێکە لە مادەو مەعنا. (خودی مادەو هۆشمەندی بابەتی ئەم باسە) و مرۆڤ و هۆشمەندی یەکەی لە پێوەندی لەگەڵ دیاردەکان دا، لە جیهانی

---

(١) ـ کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالێکتیکی، پێشوو، بەرگی ٢٢

بێ سنووردا و لەو بوونە د ووئالیستی یەدا بەشدارن و بەشێکی کـــەم و بێ بایەخ لە گەردوونی پان و بەرین و بــێ سەروبن • دەبەیترا وەکـــان ، یاساکانی شەڕی دژەکان و یەك بوونیان ، نموونەیەکی بچووکـــی ئــەو د ووئالیستی یەی گەردوونی هەرمانن • تاقانە پەرستان و زۆربـــەی زۆری ئید ەئالیستەکان پێیان وایە لە مادەو مەعنا لە سەرانسەری جیهـــان دا مەعنا لەپێشە ، چونکە هۆیە بۆ مادە یان هۆیە بۆ رێك و پێك کردنی مادە و سروشت • ئەم باسە گرنگ و گشتی یە یان بچووك کراوەتەوە یان خراوەتـــە پشت گوێ و لە مەسەلەی ناسین دا بەرئاوەژوو نیشان دراوە! هۆیەکـــەی ئاشکرایە • دەکرێ بە ئاوردانەوەیەك لە مێژووی سەرهەڵدانی مرۆڤ لـــەم سەرزەوی یەدا و گەشەکردنی لایەنەکانی لەشی و هۆشی ئەو ، ئـــەو ئیدیعایە بە باشی جێی خۆی بگرێ کە هۆشی مرۆڤ لە ئاکامی کردەوەی ناسین و هەڵس و کەوتی نرێنەلایەتی دا ، سەری هەڵداوە • ئەویش پـــاش تێپەرکردنی پلەکانی ئید راك و زانین بە شعوور واتا بە ئید راکی چەمکـــە گشتی یەکان ، گەیشتوە • هەموو فیلسوفێکی خاوەن ویژدان ، شعـــووری ئینسان بە ئاکامی جموجۆڵ و گەشەکردنی مادەی مێشکی مرۆڤ دەزانـــێ • بەلام گریمان ، هێندێکیان وتیان ، هۆش و ئاوەزی مرۆڤ بەخششی دەروون یان نەفسەو جیا لە لەش نەفس هەیەو پاش مردنیشی هەر ئەمێنێ (١) ئەی تۆخوا ئەوە ویژدانە تۆ خۆت لەو باسە مێژوویی یە کە لانی کەم پێنج هـــەزار ساڵە ، لە مێشکی مرۆڤ دا دێ و دەچێ ، نەدەی و ئەوکێشە لە مـــادەی مێشك و هۆشمەندی مرۆڤ دا ببڕیتەوە ؟!

با ئید دیعاش بێ ئەدەی بۆ باسی ئەوە ناکەن بە ملیارد مرۆڤ هەن کە پێیان وایە گشت جیهانی مادی ئاکامی شعوورێکی گشتی " مطلق " ە کـــە دەسەلاتی بەسەر جیهان دا هەیەو لەگەڵ جیهانی مادی یەو لەراستی دا جیهان هەوێرێکە لە دووشت ( مادە و مەعنا ) • رەنگە چونکە چەمکێکـــی یەکجار بەرفراوانی وەك هەستی ئەویـــش خۆی لە خۆی دا ، بریتی بێ لـــە دوو چەمکی ئاوەها ، سەروینی دیارنەبێ و بۆ هۆشی فیلسوفی ماتریالیستی کە پێی خۆشە دیفاع لە فەلسەفەی چینی کرێکار و ئازادی و نان و ئاوی بکـــا

---

(١) ــ کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیکی ، پێشوو ، لاپەڕی ٤١

گەما رۆنەدرێ وبۆی نەلوێ خۆی لەو مەیدانە پان و بەرینە بدا ،ە. رێوبە دزەیەکی بۆ کرد ەوەو تێ کشا وەتەوەو لە بابەتێکی بچووك وەك " ناسین " دا ، کێشەکەی بڕیوەتەوە! ماتریالیستەکان دەڵێن ، ئەوەی وەك ئیدەئالیست بیر بکاتەوەو بەتایبەت بڕوای بە خوا و رۆح و چەمکی هەست نە پێك بێ ، ناتوانێ جیهان بەو جۆرە کە هەیە شی بکاتەوەو لێی تێ بگا و لە ئاکام دا ناتوانێ کەڵکی لێ وەربگرێ و بیگۆڕێ . سەبارەت بە کۆمەڵیش هەروا دەبێ و لەبواری هۆش و ئاوەزیشەوە وەك هەیە دەمێنێتەوە! خۆ ئەگەر بێت و بڵێین : ئێستا کێشەی ئاوەها گەورە حەل نابێ و با چەند میلیارد مرۆڤ هەبن ،بڕوایان بە وزەو هێزێکی داهێنەرو خوڵقێنەر هەبێ و پێیان وابێ لە پێوەندی جیهانی بێ سنووردا ،کاریگەرە" سروشتیش وەك دەبینین خاوەنی یاسای خۆیەتی ،بە دۆزینەوەی یاساکانی بەسەری دا زاڵ دەبین و لە بەرهەمی زانست و تێگەیشتن دەخۆین و بۆ وەدەرهێنانی ئازادی و دابەزاندنی دادگەری کۆمەڵایەتی کەڵك لە دەسکەوتەکانی زانست وەردەگرین و ئەم رێبازەش هەیەو پێی دەڵێن " رئالیسم " (١) ، دەبێژن بێ رەتکردنەوەی خوا و رۆح و ئەو چەمکە هۆشی یانە ، نابێ و ناکرێ کەس ئاوەها بیر بکاتەوە و نەو مەیدانە هەنگاو هەڵێنی! پێیان وایە لە جیهان دا دوو رێباز هەیە : ١ــ ئیدەئالیسم ئەویش بەو شێوە کە خۆیان ئەلالەیان کرد وە ٢ــ ماتریالیسم. بەڵام بەکردەوە دەبینین هەزاران بلیمەت و زانا و پسپۆر لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زانست دا لە گۆڕەپانی لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەدا ، ئەوەپەڕی تێکۆشانیان هەیەو بەزیرەکی و بیردۆزی هەرکاتە بەرهەمێکی تازە لە زانست ئەخەنە بەردەم بیروڕای گشتی جیهان و بەو جۆرە کە وتمان لە بواری بیروباوەڕی خۆیان دا ، بیر دەکەنەوە و بۆ گۆڕانی کۆمەڵ بە هەزاران شەهیدیان داوە . بەهەرحاڵ ئەچینە سەر شێوە باسەکەی ماتریالیستەکان و وەدوای پۆشەپێنیان ئەکەوین . ئەگەر لە جێگایەك بە پێویستمان زانی ، شتێك وەك هەیە بخەینە بەرباس، ئەوا بە پێی توانا باسی لێ دەکەین و لە

---

(١) ــ واقیعپەرەستی بەرامبەر بە خەیاڵپەرستی ،رئالیست باوەڕی بە راستی هەیە لە کردارا راست و واقیعهەوڵ دەدا لەگەڵ واقیعی خەڵك و ناوچەوجیهان دا بڕوا و بگونجێت ... فەرهەنگی نوێ ،بورهان قانیع کردوویە بەکوردی، ١٩٨٥،ل ٩١

بەرامبەر راستی یەکانیشەوە مل کەچین •

## مـــــادەو شعـــــــــوور •

مادە بەرزترین چەمك یان " مفهوم " ە (١) بەبڕوای من " هەستی " گەورەترین چەمکە • تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی پێوەندی لەش و ئەوەی کە پێی دەڵێن روح یان گیان ، لەمێژە بەردەوامە • ناسینی روح دژوارە •

هۆشمەندی بریتی یە لە بیروباوەڕو هەست و " تصور " کردن و خواست و ئیرادە ، لە پلەی یەکەمدا مرۆڤ هۆشمەندی هەیە • ئەگەر یەکێك نەبێ هەست بکا ، هەست کردن نابێ • ئەگەر یەکێك نەبێ ئیرادە بکا ، ئیرادەش نابێ • هێندێك لایەنی هۆشمەندی لە ئاژەڵیش دا هەیە • بەڵام لایەنەکانی هۆشمەندی ماوەیەکە پەیدابوون • بەم پێ یە سروشت نە تەنیا پێش مرۆڤ بەڵکوو پێش هەموو زیندەوەرێك هەبوە • کەوابوو سروشت لە هۆشمەندی سەربەخۆیە • هیچ لە تواناداتیە کە هۆشمەندی ( هی مرۆڤ ) لە پێش سروشتەوە بێ ،بۆیە دووهەمە • • • بە بێ مادە هۆشمەندی ( هی مرۆڤ ) نایێتە بوون •

ئایا هەموو مادەیەك بیر ـ ەکاتەوە ، شیاوی بیرکردنەوەیە ؟ بەرد بیر ناکاتەوەو نیشانەی هۆشمەندی لە هەموو گیانلەبەرێکیش دا نیە • سروشتی زیندوو لە سروشتی نازیندوو پەیدا بوە • ئیدەئالیستەکان پێ یان وایە سروشتی زیندوو هیچ پیوەندی یەکی لەگەڵ سروشتی نازیندوو نیە • (٢)

خوێنەری خۆشەویست ! وەك ئاشنا بێ گەیشتووی ،ماتریالیستەکان ئایین و چەمکە ئایینی یەکانیان بە بەردی بناخەی ئیدەئالیسم ناساندوە (٣) کەوابوو دەبێ بۆ نموونە ئایینی ئیسلام ، لەنێوان سروشتی زیندوو و نازیندوودا ، پێوەندی نەبینێ • بەڵام لە باسی خوڵقاندنی

---

(١) ـ کورتەباسێکی • • • پێشوو ، لاپەڕی ٢٦

(٢) ـ هەر ئەم سەرچاوە ، لاپەڕی ٤٣ ـ ٤١

(٣) ـ جیهان بینی مادی و جیهان بینی ئیدەئالیستی م • ح کاوە ١٣٢٧ ی هەتاوی تاران لاپەڕی ٣٦ ـ ٣٥

قورئان دا دەیان جار هێما بەوە کراوەو بەراشکاوی راگەیەند راوە کـــــە تەنانەت خودی مرۆڤ لە خاك خوڵقاوەو تێکەڵی دەبێتەوە، دەبێتە گــڵ و سەرلەنوێ سەر هەڵدەداتەوە • واتا لە گڵەوە •

بەبڕوای ماتریالیستەکان، ئیدەئالیستەکان چونکە ناچنە ناخـــــی شتەکانەوە، بە باشی نایناسن، بۆیە لەو پێوەندی یە نکوولی دەکەن •

لەگەڵ ژیان دا یەکەمین سەرماکانی هۆشمەندی پەیدا بـــــوە، بەستراوەتەوە بە هەردوو بەشە گەورەکەی مێشکەوە • ئەم دوو بەشەی مێشـــك ئەنجامی پەرەسەندنی بەرەبەرەن کە چەندین سەدەیان خایاندوە • لەمەدا کوێ ئەندامی دەمار پەرەی سەندوەو چالاکی و هەڵسووڕانی ئاڵۆز بـــوە • هەروەها رەوشت و هەڵس وکەوتی ئاژەڵیش، پەرەی سەند وەو ئاڵۆز بوە، تــا مێشکی مرۆڤ پەیدا بوە • لەگەڵ ئەمەشدا، هۆشمەندی مرۆڤ دەرکـــەوت • دیاردە هەرە بەرزەکانی چالاکی و هەڵسووڕانی دەماریش، پێوەندی بــــە تویکلی هەردوو نیوە گەورەکەی مێشکەوە هەیە •••

بیرکردنەوە خاسیەتێکی تایبەتی مرۆڤە، بەستراوەتەوە بە پەیدابوونـــی بەرزترین شێوەی مادەوە لە رەوتی پەرەسەندنی بەرەبەرەدا، ئەم بەرزتریـــن شێوەیش، مێشکی مرۆڤە • هۆشمەندی بەرهەمی هەموو چەشنە مادەیـــەك نیە • بەرهەمی مادەیەکە، کە خاوەنی رێك و پێکی یەکی بەرزە • بەرهەمـــی چالاکی مێشکە • هۆشمەندی فەرمانی مێشکە و بە بێ مێشك بوونی ناگونجێ • لە نەخۆشی دا، دڵ دەخرێتەوە کار، بەڵام ئەگەر مێشك تووشی بـــێ و هێندێك کردەوە ئەنجام بدرێ، گەڕانەوەی بۆ نیە • (١)

لێرەدا رەوایە ئەم پرسیارانە بکرێ: ئەگەر هۆشمەندی بەرهەمی مادەیەو مادە لە پێشەوە هەیە، ئەدی بۆ گشت مادەیەك نابێتە خاوەن هۆشمەندی ؟ بۆ تەنیا مێشکی مرۆڤ وایە؟ خۆ گیانلەبەرانی تریش چالاکی یان هەیەو هـــی وایشیان تێدایە هەزاران و بگرە سەدان هەزار سال پێش مرۆڤ خوڵقاون ، بۆ مان و مانەوە تێکۆشاون و تا ئێستاش، هۆشمەندی یـان بەخۆوە نەدیوە ! سروشتی زیندوو لە سروشتی نازیندوو پەیدابوە • ئەمە راستە • کەوابـــوو پرسیار ئەوەیە: ئەگەر نازیندوو لە وزەو هێزو توانای دا وەك بنەمـــا ،

---

(١) ــ کورتەباسێکی ••• پێشوو، بەرگی ٤٥ ــ ٤٢

هۆشمەندی نەبێ ، چۆن لە ئاڵامی گەشەکردن دا ، بەو پلەیە دەگــا ؟!
دانەیەک گەنم کــە دەچێتە ژێرگڵ تا نەمرێ ، لە جەستە مردوەکەی گوڵی گەنم
ناروێ ٠ ئەگەر لەودا ، بنەمای بەرەوپێش چوون نەبێ ، وەك ئەوە پووچەڵ بێ،
دەبێتە گوڵی گەنم ؟! ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ ، ئەسڵ بنەماکەیەکە ئامادەیـــــی
قبوڵ کردنی ئەو گشت گەشەکردن و وەرگرتنی ئەو گشت پەسنە بەرزانـــــەی
هەیە ٠ با بچینەوە سەر هۆشمەندی یە بۆرە هۆشمەندی چی یە؟ ئەو دارە
بەرزەو ئەم پێنووسە ئەبینم ٠ ئاشکرایە ، ئەوەی لە مێشکمان دایە ، خودی دار
و پێنووسەکە نیە ، بەڵکوو بیرێکە سەبارەت بەوان ٠ کەوابوو ئەوەی لــــــــە
سەرمان دایە ، وێنەی دیاردەکانە ٠ وەك وتمان هەموو بیرێك لە چەنـــــــد
تێگەیشتنێك ( مفاهیم ) پێك هاتوە ٠ بۆنموونە رستەی : " ئالا گەشـــــە "
بە دوو وشە دەربڕاوە ٠ ئالا و گەش ٠ ئەم تێگەیشتنانە لەکوێوە وەرد ەگیردرێن؟
وتمان لە ژیانەوە لە راستی یەوە ٠ شتەکان بەشێوەی سەربەخۆ هەن و لەســـەر
ئەو بوونە یان شێوازی تێگەیشتن دادەرێژین ٠ تێگەیشتن باسی بوونـــــی
شتەکان دەکا ٠ لەپێش هەموو شتێك دا ، راستی یەکە هەیە ٠ پاشـــــــان
رەنگ دانەوەی وێنەکەی لە زەین دا و لە ئاکام دا دروست بوونی بیرەکــــــە
لەبارەی دا ، خۆدەنوێنێ ٠ بەبڕوای لینین بیرکردنەوە بریتی یە لـــــــە :
" لەبەرگرتنەوەو پێچەوانە کردنەوەی راستی ، لە بیرکردنەوەدا ، سەرلەنوێ
راستی بەرهەم دێتەوەو وێنەو نەخشەی لەبەرد ەکێشرێتەوە" ( ١ )
وەك وتمان هۆشمەندی تایبەتمەندی یەکی مادی یەو خاوەنی رێــــــك و
پێکی یەکی زۆر بەرزەکە ئەویش مێشکەو راستەقینەی مادی یە ٠ وێنە دەکێشێ و
وەك خۆی نیشانی دەداتەوە ٠ ( ٢ )
لە کاتێك دا دەڵێ لە مێشکی مرۆڤ دا ، راستی بە شێوەیەکی گونجــاو
دەگۆڕدرێ ، نابێ بڵێ وەك خۆێ پیشانی دەداتەوە ٠ وێنە ساکارەکـــــان
ئاوەهان بەلام لە چەند وێنە بوون بە چەمك و مفهوم وکردەوەکانــــــــی ،
گشتی کردن و رووت کردن و داماڵدراوی ، خۆیان نواند ، ئەوکـــــــات
وەك خۆیان نین ٠ تازە ئەوەی زەین ناتوانێ وەك ئەوەی دەرەوە بێ، چونکە

---

( ١ ) ـ کورتەباسێکی ٠٠٠ لاپەڕی ٤٥
( ٢ ) ـ کورتەباسێکی ٠٠٠ لاپەڕی ٤٦

چەمکی گشتی ئاوەزلە زەین و هۆش‌دا ، گشتی‌یەولەدەرەوەی زەیــن دا ، بەش‌بەش و جوزئی‌یە ٠

لەکاتی ئەمانی ئەندامێك لەو ئەندامانەی هەست پێ‌کردن ، مــــرۆڤ دەتوانێ ئەگەرچی بە نیوەچلیش بێ ، بە ئەندامەکانی تر جێگای بگرێتـــەوە ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە هەموو ئەو ئەندامانە بێ‌بەش بوو ، ئەوا دەستەوەستـــان دەبێ و ناتوانێ لە راستی بکۆڵێتەوەو سەبارەت بە جیهانیش هیچ شتێـــــك فێربابێ ٠ هەست پێ‌کردن ئەنجامی کارتێ‌کردنی شتەکانی جیهانـــــی دەرەوەیە لە ئەندامەکانی هەستمان ٠ هەرلەبەر ئەمەشە کە زانستـــــــی راستەقینەی تەواومان دەربارەی جیهانی دەوروپشت ئەداتێ ٠ بەڵام ئاخـۆ چۆنی دەسەلمێنین کە هەست پێ‌کردن زانستی راستیمان دەربارەی جیهان دەداتێ ؟ ئەوەی ئەمە دەسەلمێنێ پێش هەموو شتێك پەیرەوکردن و راستی بەکردەوەمانە ٠ خۆ ئەگەر وا نەبوایە ، مرۆڤ نەی‌دەتوانی کەڵك لە شتەکانـــی جیهانی دەرەوە وەربگرێ ٠٠٠

بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ تەماشای شتێکی کرد ، وەك چاوی وێنەی بگرێـــت وایە ٠ ئەگەر شتەکە لە جموجۆڵ دابێ ، لەسەر پەردەی چاویش وێنەکەی بــە جووڵاوی دەردەچێت ٠٠٠ چاو وێنە دەگرێ و پێچەوانەی دەکاتـــــەوە ، ئەندامەکانی تری هەست پێ‌کردنیش هەروەهان ٠ (١) بـــــــــە بڕوای ماتریالیستەکان گشت چەمك و ئیدراکەکانی زەین لە سێ شتەوە سەرچـــاوە دەگری ، دیاردەکانی دەرەوەی زەین کە شوێن لەسەر هەستی ئێمـــــــە دادەنێن ٠ ئەوی‌تر کارلێکی دیاردەکان لەسەر دەزگای مێشك و لەدایـك ــ بوونی هەست پێ‌کراوەکان و سێ‌یەمیان بریتی‌یە لە پێوەندی وێنـــــــــە زەینی‌یەکان و ئیدراك کراوەکان لەسەربناخەی ئەزموون و کردەوە ، پێك دێ‌و ئەبێتە هۆی پەیدابوونی چەمکە گشتی و گشتی‌ترەکان ٠ (٢)

وەك لە باسی بڕەوی ناسین و پلەکانی‌دا، رامان گەیاند ، هەرچەنـــد ئیدراکە هەستی‌یەکان بناخەی گەیشتن بە ناسینن ، بەڵام ئەم تێگەیشتنـــە پڕژو بڵاوە کە لە رەنگ دانەوەی دیاردەکانی دەرەوە ، سەرچاوە دەگـــرن

---

(١) ــ کورتەباسێکی ٠٠٠ لاپەڕی ١١٦

(٢) ــ جیهان‌بینی مادی وجیهان‌بینی ئیدەئالیستی،پێشوو ، ل ٤٢

بۆ دۆزینەوەی یاساکان و گەیشتن بەراستی ، بێ هێزەو پێویستە بیروهۆشی مرۆڤ بەهێزتربێ و بتوانێ بەسەر سروشت دا زاڵ بێ • ئەم ئەرکەش ئەزموونی زانایان ، جێ بەجێی کرد وە (١) ئەگەر هەستەکان راستەوخۆ مرۆڤ بەو شتانەوە ببەستنەوە کە هەن ، ئەوا بیرکردنەوە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ ، جیهانی دەرەوە ، دەرئەخا • ئەمە بەو واتایەکە بە ئەنجام گەیشتەکانی ئاوەزی لەسەر بناخەی ئەو شتانەی ناراستەوخۆ دەس دەکەون ، دادەرێژرێن • • • بە بێ رووداوە راستی یەکان هیچ بە ئەنجام گەیشتنێك نابێ • ئەوان ئەو هەوایەن کە زاناکان هەناسەی تێدا هەڵدەکێشن • ئەم رووداوانەش بەهۆی هەست پێ کردنەوە دەزانرێن ، بەهۆی ئەنداەکانی هەست پێ کردنەوە • بەئەنجام گەیشتن بەهۆی پوختەو پاڵفتەکردنەوە لەکاتی بیرکردنەوەدا پێك دێ • • • هەست کردن هەمووشت و رووداوێکی راستی کە پێویستن ، ئەداتە عەقڵ • ئێمەش لەسەر بناخەی ئەوانە ، بەئەنجام گەیشتن و پوختە و پاڵفتە پێك دێنین • ئەمەش لە پلەی عەقڵی زانستە • بە بێ هەست کردن ، مێشك ، عەقڵ ، ژیری ، هیچ کارێکیان نیەو بەبێ کاری مێشکیش، زانستی هەست پێ کراو نابێ • ئەمانە بەدوای یەك دا دێن و لە زانست دا لێك جیا ناکرێنەوە • (٢)

## جیهان وماتریالیسم و رئالیسم و ئیدەئالیسم ،

دوو رێبازی فەلسەفی ئیدەئالیسم و ماتریالیسم ، ئەوەندە باسیان لەسەر کراوە کە لە زەمینی زۆرەی زۆری زانست دۆستەکان دا ، جێی گرتوە • بەلام رئالیسم کەمتر خراوەتە بەرباس، هەربۆیە لێرەدا بەپێویستم زانی ، باسێکی کورتی لەسەر بکەم •

فەلسەفەیەکی خۆرێکخەر هەیە کە ناوی " رئالیسم " ە • ئەم فەلسەفە لە شێوەی تازەی دا لە مەیدانی دژایەتی ئیدەئالیسمی زەمینی دا پێك هاتوە •

(١) ــ جیهان بینی مادی وجیهان بینی ئیدەئالیستی ، پێشوو ل ٤٧ ــ ٤٦

(٢) ــ کورتەباسێکی • • • پێشوو ، لاپەڕی ١١٩ ــ ١١٨

فیلسۆفانی ئەم رێبازە دەڵێن : جیهانی مادی دەرەوەی زەین لە راستی‌دا بەشێوەی سەربەخۆ لە ئیدراکەکانی ئێمەدا هەیەو بەشێوەیەك لە زەینی ئێمەدا ، رەنگ دەداتەوە • لەم بەشەدا رئالیسم لە دژایەتی ئیدئالیسم دا لەگەڵ ماتریالیسم یەك دەگرێتەوە • لەراستی دا كەس ناتوانێ ببێتە ماتریالیست مەگەر ئەوەكە سەبارەت بە مەسەلەی هەستی راستەقینەی جیهانی مادی لەپێش‌دا ببێتە رئالیستی تەواو • بەلام قبوڵ کردنی ئەم راستی‌یە کە جیهانی دەرەوەی زەین و هەستەکانی ئێمە بەو واتا نیە کابرا ماتریالیستە •

رئالیسمی تازە : بوونی مادە لە ماتریالیسم قبوڵ دەکاو شتەکانی تر بە ئیدئالیسم دەسپێرێ • زۆر لە رئالیستەکان بە بوونی جیهانێکی تر لە دەرەوەی شوێن و کات بڕوایان هەیە •

بەکورتی ئەم باسە دەبڕینەوەو بۆ هەڵسەنگاندن دەچینە سەر بۆچوونی ئیدئالیسم :

۱ـ جیهانی مادی پێوەندی بە جیهانی روحی‌یەوە هەیە •

۲ـ روح یان زەین یان ئیدەو وێنە ( Idia ) جیا لە مادە دەتوانێ هەبێ و توند ترین جۆری ئیدئالیسمی زەینی‌یە • ( مادە بە شێوەیەك ، لە چوارچێوەی ناسین دا ، رەت دەکاتەوە ) •

۳ـ کیشوەر یان وڵات ، مەیدانی دەسەلاتێك نەناسراو لەسەرەوەیان لەوبەر یان لە پشتی هەر شتێکەوە هەیە کە هەست و ئیدراك و ئەزموون و زانستەکان نای پێکن و نای‌ناسن •

بۆچوونی ماتریالیسم :

۱ـ جیهان لەباری ناوەرۆکەوە مادی‌یە • هەرشتێك لە دایك دەبێ هۆی مادی هەیەو بەم پێ‌یە یاساکانی جووڵانەوەی مادە پەیدابوو بەرەو پێش‌دەچێ •

۲ـ مادە راستی‌یەکی دەرەوەیی زەقەو سەربەخۆ لە زەینە ، هەر شتێکی بیری ، بەرهەمی هەڵس و کەوتەکان و جم‌وجۆڵی‌مادی‌یە •

۳ـ جیهان و یاساکانی بۆوەی دەبن بەتەواوی بناسرێن • هەرچەندە دەگونجێ کە هێندێك شت بە دژواری بناسرێ یان تا ئێستا نەناسرابێ ، بەلام شتی وانیە لە ناوەرۆك دا ، بۆناسین

ئەبێ . (١)

## شوێنەواری ئەم بۆچوونانە لە هەڵس و کەوتی کۆمەڵ دا

ئێستا ئید ئالیستەکان بەتایبەت ئید ئالیستی عینی لە پەرستشگاکان دا ، زۆربەی وت ووێژیان لەسەر جیهانێکی ترو راستی یەکانی ئەو جیهانەی کە لەژێر دەسەڵاتی زانستەکان دا نیەو زانستەکان ناتوانن بەسەریان دا زاڵ بن و بیان ناسن و دوورن لە ئەزموونی زاستی . بە داخەوە پەیڕەوانی ئەم بیروبۆچوونە کە یەکجار زۆریشن ، لەو شێوە باس و شی کردنەوەو بۆچوونە ، کەڵکی خراپ وەردەگرن و پشت لە بیروباوەڕو ئەزموونی زانستی دەکەن و ئامادە نابن گیروگرفتی ئاکاری و کۆمەڵایەتی خۆیان لە چوارچێوەی زانستە باوەڕپێکراوەکان دا ، جێ بەجێ بکەن و زانایانە بیر لە چارەڕەشی خۆیان بکەنەوەو چارەیەکی زانستی بۆ بدۆزنەوە !

ئەم کەم بایەخ دانە بە زانست و دوورەپەرێزی یە لە کەڵك وەرگرتن لە ئەزموون و دەسکەوتەکانی زانست ، لە درێژایی مێژوودا ، جۆرێك جیهان بەجێ هێشتن و زۆر بایەخ دان بە جیهانی روح و کەمتەرخەمی نیشان دان بەم جیهانەی کرد وەتە بەرنامەی پەروەردەکردن و لە ئاکام دا بازار و دوکانێکی پڕلە فێلبازی بۆ هێندێك تاڵانچی سامان و بیروباوەڕی ئامادە کردوە . نموونەی ئەمە لە سەرانسەری جیهانی مەسیحی یەت و ئیسلام و ئایینەکانی ترا ، یەکجار زۆرەو بێجگە لەوە پاش خستنی کۆمەڵ و کاروانی بەرەوپێش چوون و شارستانی یەت ، شوێنەوارێکیان نەبوەو ناشیان بێ .

بەگشتی گۆشەگیری و خۆگێل کردن لەیاساکانی سروشت وتێنەکۆشان بۆ رزگاری لەژێر دەسەڵاتی زۆرداری رقی سروشت ، پەسنی مرۆڤ نیەو بگرە زۆر گیانلەبەر ئەگەر شتی وایان وەپاڵ بدەی و زمانی رەخنەیان هەبێ ، لە بیرورای گشتی داوای سزادانی وێژەری بکەن . دوکتور علی شەریعەتی کۆمەڵ ناسی ئایینی بەناوبانگی ئێرانی سەبارەت بەو بۆچوون و خۆ خەریکی پڕوپووچ کردن و گسۆمی خۆ ئاخنین لە خەڵکی دی دەڵێ ، عیرفانی رووت بە

---

(١) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ٣٠ ـ ٢٩

تەنیا و هیچی تر، کەڵکی خەڵکی پێوەنیە وەکوو چەڵی درکە زێیە، بێ مێوە و بەرەزی خێوی دپارێزی و ناشێ کەس توخنی بکەوی ··· بۆنموونـــــە کابرایەك هەیە دەروێشە، چلە کێشە بۆ نەندێشە؛ لە مەرگەوەدوا رۆژو ســزا، دەم بەنزا خزاوەتە غارێکەوە، چاوی دڵی دەعاسمانەوبێ ئاگایە لـــــەم جیهانە··· لەوەدەمەش دا لە پشت دیواری ئەو غارە، کوشتارە هــــات و هاوارە، نوزەو ناڵەی بریندارە، گورەو هەرەشەی زۆردارە، هـــــەزاران بێ گیاح دەگرن، هەزاران لەبرسان دەمرن، ئابرووی ئابرووداران دەبرێ هەرچی ناشێ بکرێ دەکرێ! کەچی کابرای کرۆشمەکەر گوێی نابــــزوێ، نایەتەدەر، دەرگا لەسەر خۆی دادەخا، دوو گرد مۆری رادەخا· گرنــەی بەهەشتی گرتۆ، خەریکە بارگە تێك دەنێ··· بە خەڵکی دەری ئەشکەوتیــش کە لەسەر دنیا شەڕیانە بێ دەکەنێ! دوەپاتی دەکاتەوە؛ بەبڕوای مــن، رەنگە هی تۆش، ئەو کابرایە نەك هەستی پیاوەتی نیە، بەڵکو لە هەمـــوو دەعبایەك زەرەندتر و بەستترە· مەیموون، ورچ، سەگ، بەراز، زۆر تیــرەی جانەوەری دیش بەزمیی یان بە داماوانی هاوڕەگەزی خۆیان دادێ، کەچی ئەو خۆری پەرستە کە هەر خۆشی خۆی مەبەستە، هەست ناکا کە لــــــە دڕندان دلرەقترە· وا گریمان بۆبەهەشت چوو دیسا چ بوو؟ کەرەکـەی نەبی عوزەیریش لە بەهەشتە· هەوەڵ پیاوبوون، ئەوسا بەهەشت، گـــــەر بەهەشت بۆ ناپیاوانە، چونی بۆپیاوان ناوانە··· بوون و نەبوونی پیاوانی لەو چەشنە بە هەزاران چی؟ بە بریندارو دەردەداران ئیمانی موسوڵمـــان چی؟ (١)

ئەو جۆرە تێ ڕوانین و ئەوینە بی کەڵکە· ئەوین ئەو ئەوینەیە، ئـــەو ورە و نەترەیە کە لە درێژایی مێژووەدا لە دەورانی تازەو زووەدا، زۆر پیاوی رەنێـــو هێناوەو دنەی داوە کە دەستیان لەخۆ بەرداوەو سەریان نەپێنا و گڵ ناوە، شۆڕشی وایان گێراوە، باری دنیای پێ گۆڕاوە·

پیاو کاتێك پیاوە، دڵداربێ· دەنا هەر مەیموونەکەیە، کلـــــك و کوڵکەی لەدەر داوە··· لەباری کەمترخەمی نیشان دان دەڵێ: مــــــن

---

(١) ــ دوکتور علی شەریعەتی، عیرفان، بەرابەری، ئـــــازادی، وەرگێراوی هەزار ١٣٥٩ ی هەتاوی لاپەڕە ٣٥ ــ ٣٤

نەهاتووم ببمە مایەی ئاسوودەیی ، من گەرەکمە ئاسوودەکان وەڕەز بکەم • من تریاك و هیروئین نیم هەوێنی ئۆقرەگرتن بم • • • ئەگەر کەسێ نیازی خزمەت بە کۆمەڵ بێ ، دەمێ رەحەت بێ حەسەت بکا • ئارام بۆ ئارام نەهێڵـــی • جووتیاری باش کۆد مو بمیاران دەکێڵێ • دەمێ خەڵکی فێری شەڕەو چەنــەو دەم بە دەما نێو پرسیارو پەرسەنـدان ( وەڵام ) بکەین تا تێك بگەیـــن ، لەخۆ بگەین • قەستم بەخوا دوودڵی هاویتنە دلان ، لە بڕوا بـــــە زۆربێ هێنان ، هێژاترە • • • ( ١ )

بەو جۆرە کە ماتریالیستەکان چەمکێکی بەرباڵاو بە ئیدئالیسـم دەدەن و گشت ئایین و رێبازەکانیش، دەخەنە ژێر رکیفی ئەو چەمکە ، دەکرێ بڵێیـــن ئەگەر ئایین ئەی‌هەوێ لە گۆڕەپانی پێشکەوتنی زانست و خەباتی بێ‌وچانـی زانایان بۆ دۆزینەوەی شتە نەناسراوەکان بەجێ بمێنێ ،هەر بەو شێوە کـــە لە چەند هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە ،چۆن روانیویانەتە شتەکان و بابـــەت و دیاردەکان و چۆن گەردوونیان شی‌کردۆتەوە ، پێدابگرێ ، وا بیر بکاتـەوە ، زیاتر لەمە ئەکەوێتە ژێر نیشانەی پرسیارو پتر هێرش ئەکرێتە سەری و شــەڕی بیروباوەڕ وەك خونەکانی پێشوو، سەرهەڵدەداتەوە •

ئێستا لە جیهانی ئایینەکان داهەن لە چوارچێوەی ئایینی خۆیان دا بیرد ەکەنەوە ، بەڵام بەکردەوە لە دەسکەوتەکانی زانست کەڵك وەرد ەگـــرن • دەڵێن لە مەیدانی شەڕدا فلانە پیاوی گەورە کە لانی‌کەم هەزار ساڵــــە مردوە ، پشتیوانی لە سەربازەکان کرد وەو بەکردەوە دوژمنی تێك شکانـــد وەیا بەڵام بەشرخی سەد بەرامبەرو بە قاچاخ ،بە پێوەندی‌گرتن لەگەڵ دۆســـت و دوژمن ، جۆرەها چەکیان وەرگرت ! ئەوە مانای ئەوەیە بە بیروبــــاوەڕی ئیدئالیستی و بەکردەوە ، بە شێوازی زانستی بیرد ەکەنەوە ( کۆســـــە و ریش پان ! ) •

ئایا دەکرێ بە شێوازی زانستی بیربکەینەوەو لە هەمان کات دا ، بـــە هێزێکی روحی و سەرەوەی سروشت باوەڕمان هەبێ ؟ ئەگەر زانستەکان لـــە ماتریالسم کە هەموو شتێك لە مادەدا کورت دەکاتەوە ، پشتیوانی دەکــەن و بیروبۆچوونەکەی دەچەسپێنن ، باوەڕکردن بە هێزێکی نە مادی کـــــە

---

( ١ ) ــ دوکتور شەریعەتی ،هەرئەو سەرچاوە ، لاپەڕی ٣٣ ــ ٣٢

خولقێنەرو زانا و توانا و بینا و خاوەن دەسەڵات بێ،لەگەڵ قبوڵ کردنی ، ئەو مەوجوودەدا ، دەگونجێ ؟ دەکرێ دەسکەوتەکانی زانست کە فەلسەفەی مادی پشتی پێیان بەستووە ئیددیعاکانی بەوان دەسەلمێنێ ، قبوڵ بکەین ولە هەمان کاتدا ماتریالیست نەبین ؟

لە باسی بیروبۆچوونە فەلسەفی یە جۆراوجۆرەکاندا وەڵامی ئەم پرسیارانە دراوەتەوە . خواپەرستی زانا و بەتوانا لە مەیدانی ناسیندا ، ئەم راستی یەی سەلماندوە کە دەکرێ ئیمانمان بە خودا هەبێ و بۆ ناسینی یاساکانی سروشت تێ بکۆشین و لە روانگەی مادی یەوە ، لە دیاردەکانی گەردوون بکۆڵینەوەو بابەتە تایبەتی یەکانی زانست بە گوێرەی توانا شی بکەینەوە .

ئەگەر لە کاتی لێکۆڵینەوەدا رێبازێکی فەلسەفی راستمان گرتە بەر ، ئەوا ئەتوانین بە سەرکەوتوویی نهێنی یەکانی سروشت و گەردوون بخەینە روو، بەڵام ئەگەر رێبازێکی ناراست و چەوتمان هەڵبژارد یان پەیرەویمان لێ کرد ، ئەوا لە تاریکەشەودا ، وێڵ دەبین و سەرمان لێ دەشێوێ و بە ئامانجی دیاریکراومان ناگەین ،لە سروشت ئاگادار نابین و سەرکەوتمان نابێ .

هەموو زانیاری یەك بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردەکان ، خاوەنی رێبازێکی تایبەتی یە ، کەمترکاری بە رێبازی زانیاری و زانستەکانی ترەوە هەیە . بۆ نموونە زیندەوەرناسین ، رێبازی تایبەتی تاقیکردنەوەی خۆی هەیە . بەڵام ئەرکی فەلسەفە ئەوەیە ، بۆ لێکۆڵینەوەی هەموو دیاردەکانی جیهان ، بە سروشت و کۆمەڵی یەوە نەك هێندێکیان ، رێبازێك پێشان بدا . بەم جۆرە ئەرکی فەلسەفە ئەوەیە ، رێبازێکی گشتی بۆ زانین بدۆزێتەوە کە ببێتە رێبەری گشت زانیاری یەکان و ئەوانیش بتوانن ، شان بەشانی رێبازی تایبەتی خۆیان کەڵکی لێ وەرگرن . (١)

بە گومانی من ئەمە رێبازی فەلسەفەی زانستی یەو پێویستە کۆمەڵ ئەمەیە هەڵ بگرێ . بە جۆرێك تەماشای هەموو شتێك و گشت دیاردەیەك بکا کە لە ئاڵوگۆڕو گەشەکردن و پەرەئەستاندن دایەو هەمیشە ئەو رەوتە لە بارودۆخی ئێستادا ، بەردەوامە . مرۆڤ زیندەوەرێکی دوو لایەنی یە ،

(١) ـ کورتەباسێکی ... پێشوو ، لاپەڕە ١٥ ـ ١٤

لایەنی مادی و زانستی و لایەنی هونەری و عاتیفی . بە وتەیەکی تـــر دوو
باڵی هەیە باڵی زانست و باڵی هونەر . باڵە زانستەکەی بۆ ناسینی یاساکانی
سروشت و خوڵقاندنی ئامرازی پێویست وەکار دەکەوێ و باڵە هونەرییەکەی ،
ڕێگای کەڵك وەرگرتن لە دەسکەوتە زانستییەکان ، دەس نیشان دەکا . ئـەو
دووباڵە ، دەبێ هاوسەنگ بن و ئەمیان لەوی تر قورس تر یان درێژتر نەبێ .
ئەگەر باڵی عاتیفە درێژتر بێ و مرۆڤ خەریکی چلەکێشان و خواپەرستی بێ و
لەبەر نەکوشتنی مێرووڵەیەك دەس بۆ دانانی بنیاتێکی کۆمەڵایەتی نەبـــا ،
ئەوا ژیانی مرۆڤ تووشی چارەڕەشی دەبێ و زانست پێش ناکەوێ و دیسانەوە
مرۆڤ دەبێ مل کەچی سروشت بێتەوەو سروشت بە ڕق و تووڕەیی خـــۆی
هەردی بەسەر بەردییەوە نەهێڵێ ! ئەگەر باڵی زانستی درێژ بکا و واز ل
عاتیفەو ئازادی و تێکۆشان بۆ ڕزگاری لە چەوسانەوە بێنێ بە دەسکەوتـــە
سامناکەکانی زانست دەسخەڕۆ بێ و خۆی پێوە ڕابنێ ، ئەوکـــات ،
زۆرداران لە بەرهەمە زانستییەکان ، بۆ زاڵ بوون بەسەر ژێردەستـــان و
هەژاران دا ، کەڵکی ناپیاوانە وەردەگرن و کارەساتی هێرۆشیماکـــان
دەخوڵقێنن .

هەربۆیە نابێ تەواوی کاتمان بە نان و فەلسەفەی زانستی و زانســت و
ماتریالیزمی دیالکتیکی تاریخییەوە ، بەسەربەرین و هیچ ئاوڕێك بۆ هونەر و
عاتیفە و ڕزگاری گەل و گەشەکردنی باری دادگەری کۆمەڵایەتی، نەدەینەوە .
زانست و هونەر هەردووکیان پێویستن .

زانست بۆیە بەرخەو پێویستە بۆ پێگەیشتنی ، تێبکۆشین کە بـــە
پێگەیشتنی ، مرۆڤ ئاسوودە بکەین و بەرهەمی ئامرازی تازەی زانستـــی،
ئاسایش و ئاشتی بێ و هونەر و سۆز و عاتیفەو مرۆڤ دۆستی بەسەر زانستـــی
بێ عاتیفەدا زاڵ بێ .

بەداخەوە ئەوڕۆ نابێ هیچ میدالیێك بە بیردۆزی و دۆزێنەرە بەناوبا ـــ
نگەکانی جیهانی زانست پێشکەش بکرێ ، چونکە بەرهەمی کوێـــرەوەری
ئەوان کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی زۆرداران و داگیرکەران و بۆ نیشاندانـــی
زەبروزەنگ و چەوسانەوەی ژێردەستان ، کەڵکی یان لێ وەردەگرن ! زانـــا
ناتوانێ بە زانستی شانازی بکا ، چونکە بەرهەم و دەسکەوتەکانی ، لـــە
ئیختیاری خۆی دانیە ، چونکە سەربەست نیە . لە سەربەستی دا هەست بـــە

بوونی خۆمان نەکەین ، ئەو کەسەی بە د یلی ئەمڕێ هیچی لە کیس ناچێ ۰ هێشتا جیهان ئازاد نەبوە ،چونکە گەل و خەڵکێك هەیە ، سەربەستی لێ زەوت کراوە ۰

## ماتریالیسمی میکانیکی

زانایانی ئەم ڕێبازە پێیان وایە جیهان لە گەردیلەی مادی نەگۆڕاو ( اتم ) پێك هاتوە ۰ کرد ەوەو د ژی کرد ەوەی و هەڵس و کەوتی ئەوان، شتەکانی سروشتیان خوڵقاندوە ۰ پاشان ویستیان، شێوەکاری سروشت وەك کاری ئۆتۆمبیل د ابنێن ۰ هەرچەندە لەکاتی خۆی دا ڕێبازێکی پێشکەوتوو بوە ، بەڵام بە پێی بۆچوونی ماتریالیستەکان ، سێ لایەنی لاوازی هەیە ۰

۱ــ چەمکی زاتی تەواو بەهێز ، بە پێویست د ەزانێ ۰

۲ــ تێ د ەکۆشێ گشت ئاڵ وگۆڕو پێك هاتن و جێ بەجێ کرد نەکان لە پلەی گەرانێکی کرد ەوەو د ژی کرد ەوەی میکانیکی ، د ابەزێنێ ۰ بەم پێیەش ناتوانێ پێشکەوتن و خوێندنی چەند ی یە تازەکان و جۆرە جێ بەجێ بوونە تازەکان لە سروشت دا ، شی بکاتەوە ۰

۳ــ ناتوانێ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و تێکۆشانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ شی بکاتەوەو رای گەیەنێ و لە ئاکام دا سەر ئەکێشێتە لای چەمکێکی هەڵ مالراو ( انتزاعی ) لە ناوەرۆکی مرۆڤ ۰

لەوەدا کە هەر فەلسەفەیەك ئاگای لە ئاڵ وگۆڕەو ژیان و مرۆڤی لەبەرچاوە ، گومانی تێدا نیە ۰ بەڵام گرنگ و لە هەمان کات دا جێی کێشە ئەوەیە ، سەرچاوەی ئەو ئاڵ وگۆڕە چیە ؟ چۆن د ەتوانین لەوەی بگەین ؟ لە سەرەتاوە د ەکرێ بەشێوەی ئید ئالیستی یان ماتریالیستی لێی حالی بین ۰ ئید ئالیسم پێی وایە سەرچاوەی گشت ئاڵ وگۆڕەکان لەلایەن خواو مرۆڤەوەیە ۰ کەوابوو ئاڵ وگۆڕ لە جیهان دا لەلایەن شتێکەوەیە کە بۆخۆی مادە نیە ( بێجگە لە مرۆڤ ) پێیان وایە ماتریالیسم هەتا گەیشتن بە هۆیە مادی یەکان وەد وای ئاڵ وگۆڕ ئەکەوێ ۰ فیلسوفەکان تێ کۆشاون شتێك پەیدا بکەن ، خۆی ئاڵ وگۆڕی بەسەردا نەیە ۰ شتێکی هەتا هەتایی بێ ، ئەوەی ئاڵ وگۆڕی بەسەردا بێ لە پشت یان د ەرەوەی خود ی ئاڵ وگۆڕدایە ۰ بە

پێی بیروڕای ماتریالیستەکان ، ئەمە بیروبۆچوونی چینی چەوسێنەرە، چونکە ئەوان لە ئاڵ وگۆڕ ترسیان هەیە٠ ماتریالیستەکانی سەرەتاییش بەدوای شتی وادا دەگەڕان ٠ (١)

ئیدیالیستەکان لەسەر زەوی ڕوحەکان دا بۆی دەگەڕان و ماتریالیستەکان لە خودی جیهانی ماددا ٠ هەربۆیە ماتریالیستەکان بە گەردیلەی هەتاهەتایی بێ جیاکردنەوەو دابەشکردن گەیشتن ٠ پێشکەی ئەم باوەڕە لە هیندوستان و یونانە ٠ لە خولی ١٦ و ١٧ دا زانایان و فیلسۆفان دژبە فەلسەفەی کاتولیکی دەرەبەگەکان ، پەنایان بۆ ئەم ڕێبازە برد و تا خولی ١٨ لە برەودابوو ٠

## چەمکی دیالکتیکی گەشەکردن :

لە کاتێك دا فەلسەفە کۆنەکانی تر وایان بیر دەکردەوە کە جیهان هەمیشە بەو شێوەیە کە بوە لە دەورێکی هەتاهەتایی کردەوەو دووپات کردەوە و جێبەجێ کردنی دیاریکراودا ، دەمێنێتەوە ، زانستەکان ڕاستی ئاڵ وگۆڕی جیهانیان نیشان دا ٠ کلیلی تێگەیشتن لە گەشەکردنی سروشت و کۆمەڵ و ڕاپەڕین و ڕاوەستان لە دڕێژەدان دا کە تایبەتمەندی گشت گەشەکردنێکی ڕاستەقینەیە ، وا لە تێگەیشتن لە دژایەتی ( تضاد) ی دەروونی جۆراوجۆرو دژبەیەکە شاردراوەکان دا کە لە گشت ئاڵ وگۆڕ و ئەنجامدانەکان دا ، خەریکەو خۆدەنوێنی ٠ ئەم شێوە بۆچوونە کە شێوەی تێگەیشتن لە جیهان بۆ ئاڵ وگۆڕو پێك هێنان ، لە جیهان دایە ، ئەمڕۆ جێگای خۆی کردۆتەوە ٠ ( هەرچەندە مارکس و ئەنگلس دانەری ئەم ڕێبازەن ، بەڵام ئەوانیش ملکەچی فویرباخ و هیگل و هی ترن ) ٠

## بیروباوەڕی ئاڵ و گۆڕ :

لە ڕاستی دا بەرەوپێش چوونی زانستەکان ، خۆی گشت چەمکی ئەو

---

( ١ ) ــ کۆنفورت پێشوو، ل ٣٨ ٠ بڕوانە اصول مقدماتی فلسفە ، ژورژ پلیستر، ١٠٢ ــ ٩٩

جیهانەی کە ماتریالیسمی میکانیکی باوەڕیان پێبوو، تێکی رووخاند. ئەو بۆچوونە کە پێی وابوو جیهان بە شێوەیەك دەمێنێتەوە، ئۆتۆمبیلێکی گەورەیە کە هەمیشە کارێك ئەنجام ئەدا و ئەو بەرهەمانە دەبێ کە لە پێش دا هەیبۆوە لە دەورو گەڕانێکی هەتاهەتایی دیاریکراودا، دەخولێتەوە، ئەستێرەو چوارچێوە هەتاوی یەکان هەمیشە بەو شێوە کە هەن دەمێنێتەوە، هەروەها زەوی، جێگای خۆی بە چەمکی ئاڵوگۆڕ کە گشت گۆڕانکانی لێکۆڵینەوە ئەگرێتەوە، داوە. زانستەکان لە کۆمەڵ دا بەرەوپێش دەچن و سیستەمی سەرمایەداری بۆخۆی پاڵی بە زانستەکانەوە نا. لەو پێ یەدا گشت پێوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکان و پێوەندی یەکانی بەرهەم هێنان، بەرهەمی شۆڕشی هەمیشەیی سەرمایەدارین.

ئەو ئاڵوگۆڕانە پێشکەوتنێکی گەورەی لە ناسینی زانستی جیهان دا پێك هێنا. ناسینی جیهان بە شێوەی بەرەوپێش چوونی هەتا هەتایی، رێ بەرەوپێش چوون دەگرێتە بەر. ئەستێرەکان لە بێ سەرەتاو هەتا هەتاوە نەبوون و خولقاون و بەهۆی ئاڵوگۆڕ لە چوارچێوەی هەتاوی ( منظومە شمسی ) دا پێك هاتوون و سەریان هەڵداوە. هەروەها زەوی، خۆر، مانگ، پاش سارد بوونەوەی رووماڵی زەوی، تێکەڵاو ( ترکیب )ە شیمایی یەکان کە لە پلەی گەرمای ئەستێرەکان دا، نەدەگونجان، لە زەوی دا، خۆنیشان دەدەن. بەشێوەی ماددەستی کرد بە نیشان دانی تایبەتمەندی یە تازەکان کە لە پێش دا نەی بوو ( تایبەتمەندی یە تێکەڵاوی یە شیمایی یەکان ). پاش ئەوە لە پێوەند و پێکەوە چەسپانی پێچ پێچ وەك گرێ کوێرەی گەردیلەکانی " کاربۆن "، تێکەڵاوی یە "ئالی" یەکان، پێك هاتن و لەوەوە سەرەتای ژینی ئەو لەشانە پەیدابوو، کە دەستیان کرد بە نیشان دانی تایبەتمەندی ژیان و تایبەتمەندی مەوجودی زیندوو. دوای ئەوە تایبەتمەندی یەکی تازە لە ماددەوە، خۆی نواند. واتا تایبەتمەندی بوونەوەری زیندوو...

مەوجودە زیندووەکان، ئاڵوگۆڕێکی درێژخایەنیان بەسەردا هات و لە ئاکام دا بە پلەی مرۆڤ گەیشتن. لەگەڵ سەرهەڵدانی بەرەی ئادەمیزاد، کۆمەڵی مرۆڤایەتی پێك هات. پاشان رووداوی تازەو جموجۆڵی بە پێی یاسا لە کۆمەڵ داو هەروەها لە بیرکردنەوەدا هاتە مەیدان. پاشان

چ دەبێ ؟ بە بڕوای ماتریالیستەکان لە کۆمەڵی سەرمایەداری دا لەوە زۆرتر گەشە ناکاو ناتوانێ گەشە بکا ، چونکە زانستەکانی سەرمایەداری لەوە زیاتر ناچێتە پێش و ناتوانن بیر لە کۆتایی پێ هاتنی ئەو بکەنەوە • بەڵام بە پێی بڕوای ماتریالیستەکان زانستی سۆسیالیستی وا نیشان دەدەن کە مرۆڤ خەریکی دەس پێ کردنی پلەیەکی تازە لە گۆڕانە • واتا بەرەو کۆمۆنیزم دەڕوا • کۆمەڵێك کە تەواوی ئاڵ وگۆڕە کۆمەڵایەتی یەکان لەژێر ڕێنوێنی زانیارانەو خاوەن بەرنامەی مرۆڤ دا ، دەبێ • گشت ئەمانە مێژووی گۆڕانی جیهانن • (١)

## چەمکی ئیدەئالیستی گۆڕان و گەشەکردن :

پتر لە سەد ساڵ ئاوەها بیریان دەکردەوە : هیگل دەی گوت هۆی گشتی جەرەیانی بەرەوپێش چوون کە لە مێژوودا دێتە پێش " ئیدەی مطلق "ە کە خۆی لە تاریخ دا دەسەلمێنی و راستی خۆی دەردەخا • هیربرت ئیسپنسر دەی گوت : بەرەوپێش چوون بریتی یە لە جەرەیانێکی زیاد بوون و یەك خستنی مادە ( توحید مادە ) و هۆیەکەی بە کەسێکەوە پێوەندی دەدا کە پێی دەگوت : " توانای پایەبەرز قادر متعال " و کەس لە زاتی تێ ناگا و لە راستی دا بۆ تێگەیشتن نابێ • برگسن دەی گوت : هەموو شتێك بەهۆی تێکۆشانی " هێزی ژیان " لە حاڵی گۆڕان دایە • لەم دوایی یانەدا ڕێبازێك لەلایەن فیلسوفەکانی ئینگیزی یەوە ، ڕستەی " ئاڵ وگۆڕی سەرهەڵدەرو ئاشکرابوو " ی خۆی نواند • ئەوان دەیان گوت لە دڕێژایی بەرەوپێش چوون دا ، چەند تایبەتمەندی تازە هەمیشە لە مادەوە بەدوای یەك دا ، خۆیان دەنوێنن • هێندێك لەوان ڕستەیەکیان بەکار ئەهێنا کە لەگەڵ وانای خودا ، یەکی دەگرتەوە •

سەرەڕای ئەمانە راستی ئەوەیە کە دڕێژەدان ( تداوم ) یاسای بەرەوپێش چوون نیەو بە پێچەوانە دەورەکانی گەشەکردنی خاوەن ئاڵ وگۆڕ هەمیشە بەهۆی ئاڵ وگۆڕی توند و لەنەکاو دەبڕدرێن • پەیدابوونی پلەی

---

(١) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ٦٥ ـ ٦٤

تازە لە بەرەوپێش چوون دا ، کاتێك ئەنجام دەدرێ کە عەقڵ وەرچ بۆ ئـــەو پێك هاتبێ ٠ بەهۆی بڕین (انقطاع) لە دڕێژەدان دا ، ڕاپەڕین لـــە بارێکەوە بۆ بارێکی تر خۆ دەنوێنێ ٠ هیگڵ یەکەم کەس بوو کە ئەم شتـــەی نیشان دا ٠ ئەو دیتی کە هەر دەورەی تێپەڕکردن وەك لە دایك بوونـــی منداڵێکە ، پاش دەورەیەکی درێژ ،خواردن لە بێدەنگی دا ، درێژەدان بـە بەرەوپێش چوونی پلە بە پلە ،لە ئەندازەدا لە ئاڵ وگۆڕی چەندی دا، لەنەکاو بە یەکەم هەناسە هەڵکێشان ،دەبڕدرێ ٠ ( لەو جووڵانەوەدا بڕینێك پێـك دێ ، ئاڵ وگۆڕێکی چۆنی ) و پاشان منداڵ لەدایك دەبێ ٠ تەنیا مارکـس وەدوای ئەم تێ ڕوانینەی هیگڵ کەوت ٠ ( ١ )

## چەمکی ماتریالیستی دیالکتیکی گەشەکردن ٠

ئەم ڕێبازە وا تەماشای جیهان دەکا کە جیهان گیرۆدەی جەرەیانێکـی گەشەکردنی هەمیشەیی یە ٠ گەشەکردن جەرەیانێك ئەبینێ کە لەودا پلەکانـی گۆڕان ،بەرەوپێش چوونێك کە بەهۆی بڕین لە درێژەدان دا ، بە هـــۆی ڕاپەڕینی لەنەکاو لە بارێکەوە بەرەو بارێکی تر، دەبڕدرێن ٠ هێـــــزی دنەدەری ئەم جموجۆڵە کە لە سەرانسەری جیهان دا هەیە ، لە خـــودی جەرەیانە مادی یەکان دا ، بۆی دەگەڕێ ،لە دژەکانی دەروونی ، لەو مەیلـە جۆراوجۆرە دژانەدا کە لە هەر جەرەیانێکی سروشت و کۆمەڵ دا بە کـردەوە هەن ٠

## بۆچوونە بنەڕەتی یە دیالکتیکی یە ماتریالیستی یەکـان ٠

ناسینی مەیلە دژبە یەکەکان ، بە پێچەوانەی یەك ، لە بەرامبـــــەر یەکترەوە لە گشت شتەکان و جەرەیانە سروشتی یەکان ٠٠٠ ئەمە بە تەنیایـی کلیلی جووڵانەوەی خودی ( ئەوەی هێزی جووڵانەوەی لە خۆی دایـــە ) هەموو شتێك و هەموو مەوجودێك ، ئەداتە دەستەوە ٠ کلیلی ڕاپەڕینەکـان،

---

( ١ ) ــ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕە ٦٦

برینەکان لە دڕێژەدان ،گۆڕان کە بەرامبەرە لەگەڵ لەنێوچوونی کــــۆن و خۆنواندنی نوێ ، ئەداتە دەستەوە · دیالکتیك بەواتای دروستی، بریتی یە لە موتالای دژەکان لە خودی جەوهەری دیاردەکان دا · گەشەکـــــردن بریتی یە لە خەباتی دژەکان و بەرامبەرەکان · لەهەر جێگایەك دژایەتـــی هەبێ ،هێزی گەشەکردن هەیە ( هیگل ) ·

هیگل یەکەم کەس بوو کە باسی ئەم چەمکە فووڵەی کرد · بە پێی بـــڕوای ئەو، گشت جەرەیانەکانی جیهانی مادی لە شوێن و کات دا بریتین لـــە بەدی هاتنی وێنەی بێ‌سنوورو بەرپلاو ( مثال مطلق ) جیا لە شوێـــن و کات · وێنە یان ئیدە لە دەروونی زنجیرەیەکی دژبە یەکتردا ، بەرەو پێـش ئەڕوا وئەم گەشەکردنە یەکەلە جیهانی مادیدا ،خۆی دەنوێنێ · ئەگـــەر دیاردەکان لە شوێن وکات دا ، لەسەریان پێویستەو ئەرکیانە کە لــــە دەروونی زنجیرەیەکی گۆڕان و جموجۆل ، تێپەڕ ببن و یەك بەدوای یـەك‌دا بێنە مەیدان و بەوجوود بێن و لەنێو بچن ، هۆیەکەی ئەوەیە کە ئــــەوان بریتین لە هاتنە قاپۆری لەشی پلەیەکی خاوەن دژ، واتا ( مثال مطلق )·

گەشەکردن لای ئەو، هۆیەکەی دژایەتی چەمکەکان بوو ،لە حاڵێـك دا چەمك خاوەن دژبێ ، هەڵگری چەمك ناتوانێ راوەستێ و بەردەوام بــێ و ناچارە لە ئاکام دا خۆی رەت بکاتەوە ( خۆی نەفی بکا ) و ببێتە شتێکی تر· کەوابوو بە جێگای تەماشاکردنی چەمکەکان ، هەڵگری چەمکەکان کەوتنە بــەر پەیـــی لێکۆڵینەوە ، کە ئەوانیش بریتین لە دابین بوونی چەمکەکان ·

بە پێی تێ ڕوانینی هیگل دیالکتیك بریتی یە لە بەرەوپێش چوونـــــــی خود بەخودی چەمك ، چەمکی بەرپلاو ( مفهوم مطلق ) هەر ئەوە نیە کە لــە سەرەتا وە هەیەو بێ سەرەتایە ، بەڵکوو ڕوحی زیندووی ئێستای جیهانیشە ·

دیالکتیکی چەمکی ، بوو بە رەنگ دانەوەی زانیاریانەی جموجۆڵــــی دیالکتیکی جیهانی راستی دەرەوەی زەین و دیالکتیکی هیگلیش لەســـەر سەری‌یەوە راوەستا · یان ئەوکات لەسەر سەری بوو و خرایەوە سەر لاقەکانی · بە بڕوای ماتریالیستەکان ؛ ئەم شێوە تێگەیشتنە ماتریالیستی دیالکتیکی یــە ؛ کلیلی تێگەیشتنی هێزەکانی بەرەوپێش‌چوون لە خودی جیهانی مــادی ، بێ پەنابردن بە هۆیە خارجی‌یەکان ، ئەداتە دەستەوە · پێیان وایە ئــەم شێوە لێکۆڵینەوە ، سەرچاوەکەی گشت گەشەکردنەکانی زانستەکـــــان و

فەلسەفەیە . ئەم شێوە تێڕوانینە ئەوەشی هەیە مرۆڤی فێرکرد کە شێوەی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیش بخاتە بەرچاو . (١) لێی حاڵی بێ و ڕێگای ڕزگاریش لە چەوسانەوە گەڵاڵە بکا . ئەم دۆزینەوە بوو بە هۆی ئەوە کە فەلسەفە بوو بە زانستی شۆڕشگێڕی . دیالکتیك ( Dialectique ) بە واتای شێوە باسکردنە . لە زمان دا بەواتای هونەری وتووێژە . لە دیالکوی یونانی یەوە وەرگیراوە بە واتای چەقەو باسکردن . بەڵام مارکس بە واتای بەرەولای شتێك ، کەڵکی لێ وەرگرت . (٢)

کانت لەباری فەلسەفی یەوە خستیە پێشەوەو تەواوی کرد . چەمکێکی لە دیالکتیك نیشان دا ،کە چەمکی کۆن و خولە نێوەنجی یەکانیشی دەگەیاند . واتا تەماشاکردنی چەمك و پێوەندی ژیرێژی ئەوان لەگەڵ یەکتر ، تەماشا ـ کردنی زانستی ئەزموونی ، پێوەندی یەکانی بناخەی چەمکەکان لەگەڵ ڕاستی یەکانی دەرەوەی زەین و لێکۆڵینەوە لە ڕاستی یان نیشان دانی ناڕوست بوونیان . دیالکتیك ژیرێژی دیاردەیە . (٣) فیختە قوتابی نادیاری کانت ، لە دیالکتیك بۆتەوجی مەیدانی تەواوی ناسین ، کەڵکی وەرگرت . ئەم دیالکتیکە بناخەکەی " زاتی مرۆڤە " . سێ لایەنی بوونی دیالکتیکی ئەم جارە ، بە جێگای ئەوە لەسەر سروشت دەس پێ بکا ، لەسەر " من " یان زاتی ئینسان ، دانراوە .

"من " دانراو" تز" نۀ من ، لە بەرامبەرەوە ، دانراو( ئانتی تز ) من ونۀ من ، پێکەوە دانراو( سن تز)ە . فیختە بناخەدانەری دیالکتیکی ناسینی زانستی پاش کانتە .

هیگل واتای دیالکتیکی گۆڕی ، چونکە لە ژیرێژی کۆن دا بە واتای ئاشکرابوونی ڕاستی لە ڕێگای بەرەورووبوونی بیروبۆچوونە دژبە یەکەکان بوو ، لە ژیرێژی هیگل دا بریتی یە لە ئاشکرابوونی ڕاستی لە ڕێگای بەرەورووبوونی ئارە دژەیەکان لە ئەندێشەو هۆش دا . ئەو وتی دیالکتیك

---

(١) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ٧٠ ـ ٦٧

(٢) ـ دیالکتیك ، ماتریالیسم دیالکتیك ، علی علمی ئەردەویلی ، مشهد ١٢٩٩ لۆچی ، لاپەڕی ١

(٣) ـ دیالکتیك ، هەر ئەم سەرچاوە ، لاپەڕی ٨

یاسای ئەندێشەو راستی یە ۰ هەر شێوە بیرو راستی ئاکامی پێکەوە بوونی دوو شتی دژەیەکە ۰ ئەندێشەو راستیش بە نۆرەی خۆیان لەگەڵ دژی خۆیان دا تێکەڵاو دەبن و ئەبنە هۆی لەدایك بوونی ئەندێشەوراستی یەکی تر ۰ بەمجۆرە جیهانی ئەندێشەو راستی بریتی یە لە جموجۆڵێکی نامیکانیکی ۰ بەڵام بێ سنوور کە لە تێکەڵ بوونی دژەکان ، بەدی هاتووە ۰ کەوابوو هیچ راوەستان و دیاری کردن و رێك و پێکی یەك لە ئارادا نییە ۰ بڕیارەکان لە یەك کات دا هەم دەتوانن دروست بن هەم نادروست ۰ ئەم دیالکتیکە ئەو توانایەی هەیە تا جەرەیانی گەشەکردنی جیهان و فیکر ، نیشان بدا ، دژایەتی ( تضاد ) یەکەم هێزی دنەدەر لە جیهان دایە ۰ ئەم چەمکەی دژایەتی یە کە هیگل دەرنیشانی کردوە لە ژێر پێی کۆن دا نەبۆوە ۰۰۰ ( ۱ )

جیاوازی دیالکتیکی هیگل و مارکس لەوەدایە کە هیگل پێی وابوو دیالکتیك بریتی یە لە یاسای جموجۆڵی ئەندێشەو هۆشی مرۆڤ و دەنگدانەوەی " وجود "ە ۰ بەڵام مارکس پێی وایە ئەو شێوە جموجۆڵە لە مادە دایەو هۆشمەندیش بریتی یە لە رەنگ دانەوەی مادە ۰۰۰ جموجۆڵی دیالکتیکی هۆشمەندی لای مارکس ، رەنگ دانەوەی جیهانی راستی یە ۰ ئەو یاسا دیالکتیکی یانەی کە بەسەر مێژوو و ئەندێشەدا زاڵن ،لە ئاڵ و گۆڕی شتە سروشتی یەکانیش دا ، کاریگەرن ۰ لای لینین دیالکتیك بە واتای تێگەیشتن لەم دژایەتی یەیە ۰

## رەخنەیەك

بەلای فویرباخەوە وجود بابەتە ( موضوع ) و فیکر ( محصول )ە ۰ کەوابوو ئەندێشە لە ریگای مادە یان وجودەوە بەدی دێ و دیاری دەکرێ ۰ بەڵام وجود لە رێگای خۆی و لەگەڵ خۆی ، بەدی دێ ۰ واتا بناخەو هەوێنی وجودی خۆی لە خۆی دا هەیە ۰ " مطلق " ی هیگل لای فویرباخ جێگای خۆی دا بە مادە ۰۰۰ فویرباخ مرۆڤی لە جێگای خودا داناو

---

( ۱ ) ــ دیالکتیك ،پێشوو ، لاپەرِی ۱۰ ــ ۸

ئەمەش بۆ ماركس و ئەنگلس، گرنگی یەكی خولقێنەری هەبوو. (١) بەهەرحاڵ دیالكتیكی ماركس بناخەكەی لەسەر ڕێگا چارەی راستی شەڕو كێشەیەكە لە نێوان مرۆڤ و سروشت، مرۆڤ و مرۆڤ دا هەیە. هەروەها لەسەر بناخەی ڕێگا چارەی راستی ئەو كێشەیە كە لەنێوان سەرچاوەی وجود و ئەم مەوجودانەی دەوروبەرمان و عەینی و زەینی كردن و پێویست و ئیختیار و هەروەها لەنێوان فەرد و جۆرد ایە. لەم بۆچوونە ئاكام وەرد ەگیرد رێ كەچونكە دیالكتیكی مێژووی ماركس رێ و شوێنێكی بێ ئەملا و ئەولا ( جزمی ) یە، تەنیا بۆئەوە باتە كە پەرد میەك بخاتە سەر دەوچاوی فەلسەفەیەكی مێژووی كە بناخەكەی لەسەر ئاكام ناسین، دانراوە. ئەم دیالكتیكە پەسن وێژە، چونكە لە ئاكام دا دەگاتە كۆمەڵگای بێ چین وتوێژ و نەمانی حكوومەت و هەر شێوە لەهوری و هاوتا هەنگی تەیا و لەسەر زەوی دا و بەم جۆرە پەسنی كۆتایی پێ هاتنی مێژوو ئەخاتە بەرباس، كەوابوو ئەبێتە سەرەنجام ناسین. لە راستی دا شتێك ئەسەلمێنی كە لەپێش دا قبوڵ كراوە. مەبەستی دیالكتیكی مێژوویی، دەوری بروليتاریایە كە بە رزگاری دەری جیهانی مرۆڤی دانا وە... ئەگەر بیبەوێ بە ئاكامەكانی بگا، پێویستە لە هەر شێوە بۆچوون و بریاردان، خۆپاریزی و بەرەو ئەزموونە هەمیشە تازەكان و بەرەو تازەچووەكان، بە ڕێگای خۆی دڕێژە بدا...

وەك وتمان ماركس لەو بوارەدا، قوتابیی هیگلە. بێ فیربوونی بیروڕای ئەو، مرۆڤ لە وتەكانی ماركس تێ ناگا. لەوبوارەدا وەك باسمان كرد ماتریالیسم دەزگای ئیدیئالیزم بەراوەژوو دەكا و مادە لە بنەرەتی سیستەمەكەی دادەنێ و هۆش و مەعنا لە سەرەوە. ماتریالیسم روحی فاعیلی ناسین لە پلەی بەرزی خۆی دێنێتە خوارو جێگاكەی دەدا بە مادە كە بابەتی ناسینە. بەم جۆرە مەوجودە هەڵمالراوە كە ( مادە ) دەبێتە راستی و توێشی هەڵەی ئیدیئالیسم دەبێ كە مادەی دەكردە هەڵمالراو و شتێكی زەینی. بەكورتی هەرد ووك ڕێباز، یەك بوونی گەوهەری هەستیان پەسند كرد وەوهەرد ووكیان ئەیان هەوێ گشت بوونەوەرەكان بخەنەوە سەریەك بناخە. لەلایەك ئەم بناخە ئەندێشەی مرۆڤەو لەلایەك مادەیە. ماتریالیستەكان پێیان وایە خودا،

---

(١) ــ دیالكتیك، پێشوو، لاپەڕ ١٠ ــ ٨

زەمینی مرۆڤ وەك ئەندێشە، خولقاندوویەتی و لەڕاستی دا هیچ بناخەو بەڵگەیەکی نیە. پێویستە بزانن ئەوانی وجودی ڕاستەقینە بە خودا، بەو واتایەیە کە وێژدانی مرۆڤ چ سەرچاوەی مادە بێ و چ نە مادە بێ، جیهانێکە خۆی کاریگەری خۆی هەڵدەسووڕێنێ و ئەمەش جۆرێك پەسەند کردنی "ڕیالیسم"ە. لەم بارەوە ماتریالیسم دەبێتە ئیدیالیسم. واتا ئەوە پەسەند دەکا کە "وجود" لە دەرەوەی ئەندێشەی مرۆڤ یان سەربەخۆ لە ئەندێشەی ئەو، نیە. بەکورتی بە پاڵپشت دان بە قسەکانی تیك گوروپچ و مینار لە کتێبی دیالکتیك وناسین داو هەروەها بە کەڵك وەرگرتن لە وتە دژە یەکترەکانی ماتریالیستەکان نووسەری کتێبی دیالکتیك ماتریالیسم و دیالکتیك، هێرشێکی بەربڵاوی کردوەتە سەر ماتریالیسم کە خوێنەر ئەگەر پێی خۆش بێ، پێویستە چاوێك بەو کتێبەدا بخشێنێ. (١)

## دیالکتیك و میتافیزیك:

ئەم دووە وەك دوو شێوەی بیروبۆچوون لە بەرامبەریەکەوەن. شێوەی بیری مێتافیزیکی شێوەی کەڵك وەرگرتن لە رووت کردنەوە (تجرید) ەکانە. شتەکان جیاجیا و خۆیان لە خۆیان دا ( BjiT Self ) و جیاکراو لە ئاڵوگۆڕەکان و گەشەکردن و بەرەوپێش چوونی ڕاستەقینەی ئەوان، دەبینێ. لە ئاکامدا ڕێوشوێن یان فرمولی وشك دەخولقێنێ و هەمیشە "ئانتی تێزی" سەخت و پتەو گەلاڵە دەکا. بەڵام ئامانجی دیالکتیك بریتی یە لە وشوێن کەوتنی ئاڵوگۆڕەکان و پێوەندی یە ڕاستەقینەکان لە جیهان و بیرکردنەوە لە شتەکان کە هەمیشە لە حاڵی جموجۆڵ و پێوەندی ڕاستەقینەدان. (٢) جموجۆڵ چەند جۆرە:

١ــ بزووتنەوەی میکانیکی کە بریتی یە لە گواستنەوەی لەشە وردەکانی مادە یان گواستنەوەی لەشەکان.

٢ــ بزووتنەوەی فیزیکی: بریتی یە لە کاریگەری وزەی گەرمایی و

---

(١) ــ علی، علمی ئەردەوێلی دیالێکتیك، پێشوو، لاپەڕی ٢١ ــ ٢٨

(٢) ــ کونفورت، پێشوو، لاپەڕی ٧٣

کارەبایی ٠

٣ــ بزووتنەوەی شیمیایی بریتی یە لە یەك گرتن و جیابوونـــــــەوەی شیمیایی ئایۆنەکان ٠

٤ــ بزووتنەوەی بیولۆژی بریتی یە لەو ئاڵوگۆڕانەی لە لەشی زیندوو دا، روو دەدەن ٠

٥ــ بزووتنەوەی کۆمەلایەتی ، واتا ئەو ئاڵوگۆڕانەی لە ژیانــــــــی کۆمەلایەتی دا روو دەدەن ٠ جموجۆڵ و بزووتنەوە ، وشەیەکە لە بزووتنـــەوەی ساکارەوە تا بزووتنەوەی بیرکردنەوە ، دەگرێتەوە. جوولانەوە شێوەی مانـــەوە و بوونی مادەیە ٠ ( ١ )

بەگشتی مێتافیزیك بریتی یە لە شێوە بیروبۆچوونێك کە تێ دەکۆشــــــی ناوەروك و تایبەتمەندی و نێ هاتوویی یەکانی هەموو شتێك بە جارێك و بـــۆ هەمیشە ( وەك تێ گەیشتوون ) ، رابگرێ ٠ کەوابوو لە پێشدا پێی وایە هــــەر شتێکی خاوەن سروشت ، تایبەتمەندی یەکی بێ ئەملا وئەولای هەیە ٠ لەبارەی دیاردەکانەوە بیر ئەکاتەوە ، نەك جەرەیان و هات و چۆو جموجۆڵەکـــان ٠ تێ دەکۆشی هەموو شتێك لە فرمولێك دا کۆ بکاتەوە ٠ ئەویش بریتی یە لەوە کە پێی وایە گشت جیهان یان هەریەشتێك لە جیهان کە ئەکەوێتە بەر لێکۆلینەوەو شی کردنەوە ، بەتەواوی ئەو شتە یان ئەم شتە یان ئەو تایبەتمەندی یە یـــان ئەمی تریان دەگرێتەوە ٠

لە فەلسەفەدا بەزۆریمی بۆ واتای بەش بەشە دواییەکان ( اجـــــزأ غایی ) دەگەرێ و ئەوەی ماتریالیستی میکانیکی پێی دەڵێن " گەردیلـــە= زەرە " و ئیدەئالیستەکان بە " روح " یان ناودەبردن ٠ ( ٢ ) جیهان بەو شێوە ناناسێنن ٠

وەك باسمان کرد دیالکتیك بە واتای باس کردن و وت وێژ هاتــــوە ٠ ئەمە لە سەرەتاوە کاری سوقرات بوو ٠ ئەوەی ئەورۆ زۆر دەولەمەند تــــــــر و بەربلاوترو تازەترە ، واتا شـــێوەیەکی شی کردنەوەیە کە سەبارەت بە سروشت و کۆمەل شیازی ئەلك لێ وەرگرتنە ٠ شێوەیەکی لێ حالی بوونی ماتریالیستی یە کە لە تێگەیشتنی جیهانی خاوەن جموجۆڵ ، سەرچاوە ئەگرێ و لایەنی بـــــەو

---

( ١ ) ــ کورتەباسێکی ... پێشووی ٣٢ ــ ٣١ ( ٢ ) ــ کونفورت ، پێشـــوو ، ل ...

جیهانە دەدا .

## یەك گرتوویی و كێشەی نەیارەكان و دژەكان .

لە زۆر كۆنەوە زانایان بیر لە مەسەلەی ناكۆكی یەكان دەكەنەوە . بـــۆ
موونە میتافیزیسیەنەكان لە گۆشەی ئەو باوەڕەوە كە پێویستە ناكۆكی لـــە
قسەكانمان دا نەبێ ، لافی ئەوەیان لێ داوە كە هەروەها دەبێ لـــە
سروشتیش دا هیچ ناكۆكی و خاسییەت و لایەنێكی دژی یەكتر نەبێ ...
فیلسوفی كۆنی یۆنانی زینوون كە لە چەرخی پێنجەمی پێش لەدایك بوونی
مەسیح دا ژیاوە ، دەڵێ : لە هەرشتێك دا ناكۆكی بدۆزینەوە ، شتێكـــی
راستەقینە نیەو ناراست و بێ مانایە . لەم سەردەمەش دا شتی وا هەیـــە .
بریكلی دەڵێ : لەوانەیە لێ پرسینەوەكان و بەڵگەكان ، ناكۆك بن ، بـــەڵام
ناكۆكی لە دیاردەكان دا نیە . كەچی زانیاری و هەڵسووڕانی بەكـــردەوە
ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ كە لەناو خۆی شتەكان و لەناو سروشـــت دا ،
ناكۆكی و لایەنی دژبەیەكتر هەیە . با تەماشای چوارچێوەی لەشی مـــرۆڤ و
ئاژەڵ بكەین ، ئەوكات دەبینین لە یەك كات دا دوو چەشنە كـــردەوە و
جەرەیانی دژی یەكتر هەیە : شانەكانیان بەخۆدا دێن و پێ دەگەن و هـــەر
لەو كاتەش دا لەناو دەچن . ئەگەر یەك لەم بارانە بوەستێ ، ئەوا ئورگانـــی
لەشیش لەناو دەچێ . ئەمە ناكۆكی خودی سروشتەو ناگونجێ خۆی لـــێ
دەرباز بكا . (١)

كاتێك ئێمە تەماشای پێوەندی نێوان شتەكان دەكەین ، لە شێـــوە
كردەوەكان و پێوەندی یەكانیان ، ئەو جەرەیانەی كە تێی رۆ دەچن ، بیـــر
دەكەینەوەو دەبینین ، بە گشتی هەموو ئەم تایبەتمەندی یانە ، پێوەندی یەكان
و جەرەیانەكان ، بەسەر دژە بنەڕەتی یەكان دا ، دابەش دەكرێن .

بۆ نموونە ئەگەر ئێمە لە ساكارترینی ئەو شێوانە كە دوو جەستە دەتوانن
بەسەر یەكتر كاریكەن بیر بكەینەوە ، بۆمان دەردەكەوێ كە ئەم كردەوە یـــان
ئاڵ پێوەنان ( دفع ) یان راكێشان ( جذب )ە ... بەگشتی هـــەر

(١) ـ كورتەباسێكی ... پێشوو ، لاپەڕە ٦٥ ـ ٦٤

گۆڕمانێکی لێکۆڵینەوە لەبەرچاو بگرین ، بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەم دژو نمیارانەو دژایەتی یە ، بنەڕەتین . ئەم شتە بەشێوەی بیری میتافیزیکی نازاندرێ . بەپێی بیروڕای ماتریالیستەکان ، دژە بنەڕەتی یەکان ، پێویستە بەناوی دژە قوتبی یەکان ( Polarity ) حاڵی بین و تێبگەین .
هەر بابەتێك کە دەکەوێتە بەر لێکۆڵینەوە ، پێویستە بەپێی ئەو شێوە دژایەتی یە کە لەودا هەیە ، دەرك بکرێ . بەم شێوە دەبینین لە فیزیك دا ، پاڵ پێوەنان و راکێشان لە هەر جەرەیانێکی فیزیکی دا ، بەجۆرێك هەیە کە یەکیان ناتوانێ لەوی‌تر جیا بێتەوە یان بەتەنیایی هەبێ .
ئەم یەك بوونەی دژەکان ئەم راستی یە کە لە هەر مەیدانێکی لێکۆڵینەوەدا نە لە جیابوونەوە لە یەکتر بەڵکوو تەنیا لە پێوەندی جیایی هەڵنەگردا ، ئەو توانایە هەیە بزاندرێ ، ئەمە بە شێوەیەکی زەق لە ماتماتیکدا ( ریاضیات ) دا ، کردەوە بنەڕەتی یەکانی دوو دژ خۆ دەنوێنن .
کۆکردنەوەو کەمکردن هێندە لە یەکتر جیاکراوە ، نازاندرێن کە کۆکردنەوە دەتوانێ لە شێوەی کەم کردنەوەدا ، راگەیەندرێ و بە پێچەوانەش هەروایە .
بەم شێوە دەکرێ لە جێگای کەم کردنەوەی ( a - b ) کۆی ( b + a - ) دابندرێ . هەروەها دەکرێ دابەش کردنی $\frac{a}{b}$ بە شێوەی لێکدانی $\frac{1}{b}$ × a رابگەیەندرێ ... یەك بوونی دژەکان واتا پێوەندی بێ پسانەوە و جیانەبووەوەی ئەوان ، نابێ بە جێگای پێوەندییەکی هاوتا هەنگ و بەردەوامی ، حاڵەتێك هەڵسەنگاندن ، بزاندرێ . بەپێچەوانە ، یەك بوونی دژەکان ، بە مەرج ، کاتی ، لە حاڵی رۆیشتن و نیسبی یە . مەلی ملانێی دژەکان و نمیارەکان ، نەگونجەکان بێ سنوورو بەرێلاو " مطلق " ە هەروەك بەرەوپێش چوون و جموجۆڵ بێ سنوورن . ( ١ )

## وەرچەرخان و پێوەندی دوو لایەنە ( متقابل ) و لەبەرامبەریەکتردا

شێوەی دیالکتیکی مارکسیستی دا وا لە ئێمە دەکا کە هەمیشە شتەکان نە بە شێوەی جیاو دوورەپەرێز ، بەڵکوو لە پێوەندی دوو لایەنە لەگەڵ

---

( ١ ) ــ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ٨٦ ــ ٨٤

شتەکانی تردا ، لە پێوەندی لەگەڵ هەلومەرج و بارەکانی ئێستـــای هەر رووداوێك ، تەماشا بکەین · هەروەها داوا دەکا کە شتەکان لە بـــاری ئاڵوگۆڕو جموجوڵ و پەیدابوون و لەنێوچوون دا ، تەماشا بکەین · بـــە تایبەتی لەبەرچاوگرتنی هەمیشەیی شتە تازەکان شتە نەورەسەکـــان و بەرەوپێش چەمەکان ··· ئەم شێوە شی کردنەوە هەموو لایەنەو چکەچکـــە ( جزئی ) ی یەك بچەرمیان لە گشت خوێندنێکی داو ناکام وەرگرتن لەسەر بناخەی ئەم شی کردنەوە ، داوا دەکا ·

دیالکتیك پێی وایە سروشت کۆگایەکە لە شتەکان ، فـــرە زۆرو زەبەند میە · هەرکامەیان بەشێوەی سەربەخۆ و جیالەیەکتر ، نابینێ ، بەڵکـوو بەو شێوە دەیان بینێ کە پێکەوە پێوەندییان هەیەو پاڵیان بە یەکـــەوە داوەتەوەو بەهۆی یەکترەوە دیاری کراون · واتا هیچ شتێك ناتوانێ جیا لـە شتی تر ، چاوی لێ بکرێ · بەڵکوو پێویستە لە حاڵی جموجوڵی هەمیشەیـی ، تازەبوونەوە ، بەرەوپێش چوون ، بارێکی وا کە هەمیشە شتێك پەیدا دەبێ و لەدایك دەبێ و شتێك هەمیشە بەسەر لق و پۆی خۆی دا ، دابـــەش دەکرێ " تجزیە " و پاشان دەمرێ چاو لە شتەکان بکرێ ·

جەرەیانی بەرەوپێش چوون بریتی یە لە گەشەکردنێك کە لە ئاڵ و گـــۆڕە چەندییەکانەوە ، بەرەو ئاڵوگۆڕی روون و بنەرەتی دەچێ و بە ئاڵ وگـــۆڕی چۆنی دەگا · جاری وایە لەنەکاو بەشێوەی تەکانی توند لە بارێکەوە بـــۆ بارێکی تر ، روو دەدا · کەوابوو بەرەوپێش چوون بریتی یە لە جموجوڵـــی بەرەو گەشەکردن و بەرەو سەرکەوتن و بە وێنەی تێپەڕبوونێك لەباری چۆنی کۆن بەرەو بارێکی چلۆنی تازە · بەوێنەی بەرەوپێش چوونێکی ساکارو گۆڕانـــی بەشێکی گرێ و گۆڵدار لە نزمەوە بەرەو پلەی سەرەوە · ئەم جەرەیانە بەشێـوەی ئاشکرا بوونی دژە زانی یەکان لە شتەکان و دیاردەکان دا ··· بەشێـوەی مەیلە دوو لایەنەکان کە لەسەر بناخەی ئەم دژایەتی یانە هەنگـــاو هەڵدەگرێ و دێتە پێش و روو دەدا · کەوابوو بۆچوونی مێتافیزیکی ئەمانـــە ناپێکێ · واتا مێتافیزیك بەشێوەی جیا لە یەکتر ، بێ پێوەندی لەگەڵ یەکتر ، هەڵمالراو و لە بارودۆخێکی تایبەتی دا کە شتەکان تێدا هـــەن ،

تەماشایان دەکا ٠ (١) کاتێك بەراوردی چەند شت دەکەین دەبینیـــن خاسی یەتەکانیان وەك یەك نین و دەتوانین بە هەندێکیان بەرەنگـــاری هەندێکی تریان ببین ٠ لەم کاتەدا دەڵێین دژی یەکترن ٠٠٠ لەبەرئـــەوە دیاردەیەك بە پێچەوانەی ئەوی تر دەوەستێ " نفی " دەکا ، بەرهەڵستـــی ئەوی ترە ٠ دژەکان ئەو دیاردانەن کە هێندێکیان هەندێکی تریان " نفی " دەکەن ٠٠٠ ناکۆکی بریتی یە لە پێوەندی نێوان دژەکان ، بەڵام دژەکـــان بریتین لە هێندێك لایەنی ناکۆکی ٠ ئەگەر دیاردەکان گۆڕانیان بەسەردا نەهاتبایەو هەتاهەتایە وەك خۆیان بمانایەوە ، ئەوا هیچ جـــــــۆرە دژایەتی یەك نەدەبوو ، هیچ لایەنێك نەدەبوو کە هێندێکیان ئەوانی تـــــر " نفی " بکەن ٠ بەڵام ئێـمە ئەزانین کە شت وەك و دیاردەکان لـــــە بزووتن و ئاڵ وگۆڕو پەرەسەندنێکی هەمیشەیـی دان ٠ لەبەرئەوە هەمیشە لـە شتەکان دا لایەنی جۆربەجۆر دەردەکەوێت ، هێندێکیان تافی خۆیـــان دەژین و پیر دەبن ، بەڵام تازەیان تێدا پێ دەگاو پەرەدەستێنێ" ٠

بەکورتی دەتوانین بڵێین لە جیهانی پەرەسەندووەدا هەمیشە لایـەن و هێزی دژی یەکتر دەردەکەون ٠ پێوەندی یان لەگەڵ یەکتردا چی یـــــە ؟ پێوەندی دژەکان زۆر توند و لێك جیا ناکرێتەوە ، بەرادەیەك دژەکان بــــە بێ ئەو پێوەندی یە نابن ٠ ئێمە ئەو پێوەندی یە ناو دەنێین " یەکیەتیـــی دژەکان " ٠٠٠

دژەکان لێرەدا یەك لە تەنیشتی یەکەوە نین ، بەڵکوو یەکیان گرتـــوە ، لەنێو یەك دا تێك چرژاون و تێکرا کۆمەڵێکیان پێك هیناوە کە پێی دەڵێیـن کۆمەڵی بورژوا ٠ لەبەرئەوەی ناتوانرێت لایەنێکی لەناو ببرێت و لایەنێکی تـری بمێنێتەوە ٠٠٠ بەم چەشنە یەکیەتی دژەکان لەوەدایە کە بە چەشنێکـــی وا یەکیان گرتوەو پێکەوە لکاون، ناتوانرێت لێك جیا بکرێتەوەو هەموو پێکەوە یـــەك پرۆجیسی ناکۆکیان دروست کردوە ٠ ئەوەی دەوری کاریگەر لــــــــــە پەرەسەندن دادەگێڕێ ، یەکیەتی دژەکان نیە ، بەڵکوو مل ملانەی دژەکانــە ٠ ئەگەر یەکیەتی دژەکان نیسبی و کاتی و راگوزاربێت ، ئەوا مل ملانەتیـــان بەربڵاو " مطلق " ە ، پەرەسەندن و جووڵانەوەش هەروەهان ٠ ئەمــــەش

---

(١) ــ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕە ٩١ ــ ٨٩

ئەوە دەگمێنێ کە مل ملانەی دژەکان سەرچاوەی پەرەسەندنـــــــی جوولانەوەیە ... لەنێو کۆمەلیشدا هەر بەم جۆرەیە . لەکاتێك داکــە ناکۆکییەکانی نێو کۆمەڵ سەرمایەداری دەبێتە هۆی روودانی شۆرشـــی سوسیالیستی . بەهۆی مل ملانەی دژەکان و چارەسەری ناکۆکییانــەوە کۆمەل هەنگاو دەنێتە پلەیەکی بەرزترو کۆمەڵی تازەی سوسیالیست جێگـــای کۆمەڵی کۆنی بورژوازی دەگرێتەوە . بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوی کـــە مل ملانەی دژەکان و چارەسەرکردنیان ، سەرچاوەی پەرەسەندنی کۆمەڵـە ، بەم جۆرە ناوەرۆکی یاسای یەکیەتی و مل ملانەی دژەکان لەوە دایە کە لــە نێو هەموو شت وەك و پرۆجێسەکان ،هێندێك لایەنی ناکۆکی هەن کە لــە یەکیەتی یەکی بەتین دان . هەرلەوکاتەشدا لە ناکۆکی یەکی بەردەوام دان ئەم مل ملانەی دژانە سەرچاوەی ناوخۆیی و هێزی بزوێنەری پەرەسەندنـە . لینین ئەم یاسایەی ناو ناوەتە " ناوەرۆك و ناوکی دیالکتیك " ( ۱ )

## چۆن ناکۆکی یە دوژمنانەکان چارەســەر دەکرێن .

ئەمانە بریتین لە ناکۆکی ئالۆزی نێوان هێزو بەرژەوەند و ئامانــج و بیروباوەڕە کۆمەلایەتی یەکانی دوژمن بە یەکتر کە دەبنە مایەی ناڕێکـــی و بەگژیەك داچوون و پێك دادان و چارەسەرکردنیشیان لە ڕێگای خەباتــی تەند وتیژەوە پێك دێ ، لەرێگای شۆرشی کۆمەلایەتی یەوە . هەرگیز ناکرێت ئەو ناکۆکی یە دوژمنانەیە لەقەوارەو چوارچێوەی پێوەندی یە کۆمەلایەتی یــــە کۆنەکان دا ، چارەسەربکرێن ، بۆ چارەسەرکردنیان دەبێ بە ڕێگـــای شۆرشگێرانە ئەو پێوەندی یانە لەنێو ببرێن ، بەلام ئایا ئەمە بەواتای ئەوەیە کە شێوەو ڕێگای چارەسەرکردنی ناکۆکی یە دوژمانەکان هەمیشە هەروەك خۆیـان دەمێن ؟ بێ گومان نە" ... چونکە مەسەلەکە لەسەر ئەو هەل و مـــەرج و رۆژگارە وێستاوە کە ناکۆکی دوژمنانەیان تێدا چارەسەر دەکرێ . بۆیـــە دەبینین لەهەر بارێکی مێژوویی جیاوازدا ، شێوەی جۆراوجۆر هەن بـــۆ چارەی ئەو جۆرە ناکۆکی یانە . بۆ نموونە . ژمارەیەك لە ولاتان لــــە

---

( ۱ ) ـ کورتەباسێکی ... پێشوو ، لاپەڕی ۷۰ ـ ٦٥

خەباتێکی چەکدارانەی درێژخایەن دا دژی ئیمپریالیسم سەربەخۆیی نیشتمانی یان وەدەست هێناوە ، بەڵام هێندێکی تر لە خەباتێکی نەبەزانەی درێژی کۆمەڵایەتی دا ئەو ئامانجەیان هێناوەتەدی • بە بێ خەباتی چەکدارانەی راستەوخۆ • بەڵام ناکۆکی ئەو ئاد وزمانەکان جیاوازییان لە ناکۆکی دوزمانە لەوەدایە کە ئەمەی یەکەمیان ناکۆکی نێوان ئەو هێزە کۆمەڵایەتی یانەیە کە هەر لەو کاتەش دا بەرژەوەندی گرنگ و هاوبەشیان پێکەوە هەیە • نموونەی ئەم جۆرە ناکۆکی یانە وەك • ناکۆکی یەکانی نێوان چینی کرێکارو جووتیار ، ناکۆکی نێوان کەسانی پێشکەوتوو و کەسانی دواکەوتووی نێو ئەو کۆمەڵەی کە ژیانی خۆی لەسەر شوێنێکی نوێ پێك دێنێ • • • ( ١ )

## دیالکتیك و رێ و شوێنی زانستی •

بناخەی تێگەیشتن لە شتەکان لە بارودۆخ و پێوەندی یان دا ، هەر چەندە بناخەیەکی زۆر گرنگ لە زانستەکان دا یە ئەگەڵ ئەوەش دا زانایان کە شتەکان تەختە تەختە و ورد دەکەن ، تایبەتمەندی جۆراوجۆریان ئەخەنە بەر لێکۆڵینەوە : زۆر جار لەبیریان دەچێ ئەو شتانەی کە دەگونجێ بەشێوەی وەلانراو تەریك ، تەماشایان بکەن ،بەوجۆرە ، هەرنیین و ئەمە خۆی سەر ئەکێشێتە لای خراپ تێگەیشتنی مەترسی هێنەر • پێوەندی یە راستەقینەکانی شتەکان ، رێ‌وشوێنێك کە لەسەر گشت شتێك شوێن دادەنێن ، لە جموجۆڵیان دا ، خۆ دەنوێنن ، لە چەرەیانی لەدایك بوونیان دا و مردنیان دا ، خۆ نیشان دەدەن • بەرەورووبوونی دیالکتیکی لە گشت جۆرە زانستەکان دا ، بناخەیی یە ، چونکە زانستەکان پێوەندی نێوان شتەکان لە جەرەیانی ئاڵ وگۆڕدا کە لەودا شتەکان چەند تایبەتمەندی تازەیان وەدەست هێناوەو لە تایبەتمەندی یەکانیان دا ، ئاڵ وگۆڕ پێك دێنن، ئاشکرا دەکەن •

بۆ نموونە زانستەکانی " بیولۆژیك " لە تێوری ( بەرنامە دانان )

---

( ١ ) ـ کورتەباسێکی • • • پێشوو ، لاپەڕە ٧٣ ـ ٧٢

گۆڕانی گیاندارە جۆراوجۆرەکان دا ، ئەم شێوە بەرەوڕووبوونە ،
هەڵدەبژێرن . بۆچوونی بنەڕەتی داروین بریتی بوو لە پێوەندی دوو
لایەنەی چوارچێوەی جەستە ( ئۆرگانیسم ) و مەڵبەندی ژیان لە
جەرەیانێکی گۆڕان دا . لە حاڵێک دا بۆچوونە پێشووەکان ، تەنیا
جۆرەکانی گیاندارانیان جیا لە یەکتر تەماشا ئەکرد . ئەویش بە ناوەڕۆکی
بێ جموجۆڵ و نەشیاوی ڕاس و ڕیس کردن ( تعديل ) کە جارێک بۆ
هەمیشە خوڵقاون .

داروین جیاوازییەکان و پێوەندییەکانی نێوان گیاندارە جۆراو-
جۆرەکانی خستە بەرباس ولێکۆڵینەوە و نیشانی دا کە ئەمانە لە جەرەیانی
گۆڕان دا ، پەیدا دەبن . لەم جەرەیانەدا هەڵبژاردنی سروشتی دەبێتە
هۆی مانەوەی ئەو شێوانەی کە ئەوە نیشان دەدەن لەگەڵ شوێنی ژیان دا،
خۆیان ڕێک خستەوە .

زانستەکان لە تەماشاکردنی شێوەی گۆڕان دا ، تێدەکۆشن کە تەنیا
تایبەتمەندییەکانی ئەو پێوەندییانەی کە لەدەرەوەی شتەکان دا دیارن ،
تەماشا نەکەن ، بەڵکوو تێ ڕوانن کە چۆن جەرەیانەکانی دەروونی کە
دیاریکەری ڕواڵەتە دەرەوەییەکانی شتەکانن ، سەریان هەڵداوە و پێکەوە
پێوەندییان هەیە . ( ١ )

ئەم ئەسڵە دووهەمەی دیالکتیک ، نیشان دەدا کە پێویستە مرۆڤ
تەماشای ئەو شتانە بکا کە لە حاڵی پێشکەوتن دان و بەرەوپێش دەچن .

نە تەنیا تەماشای ئەو شتە بکەین کە ئێستا خەریکە دێتە کایەوە . ئەم
بناخەیە ، گرنگییەکی لەرادەبەدەری هەیە بۆ تێگەیشتن و باری شۆڕشگێڕی و
کردەوەکانی . ئێستا لە جیهان دا ئەوەی بەرەوپێش دەچێ ئاشتی و
پێکەوە ژیان و لابردنی گیروگرفتی نێونەتەوەیی و ناوچەیی یە . نەک
بەکارهێنانی چەک و پیلان دژی نەتەوە و چین وتوێژە بندەستەکان .
ئەوەندە هەیە کە جەرەیانی بەرەوپێش چوون چ لە جموجۆڵی مادەدا و چ لە
جەرەیانی ئاڵوگۆڕ لە کۆمەڵ دا ( هەرکامە بە نیسبەتی خۆیەوە ) زۆر تۆند
نیەو ڕەنگە بەتایبەت لە کۆمەڵ دا بەرەیەک یان دوو بەرە ئەو ئاڵ وگۆڕە

---

( ١ ) ـ کونفورت ، لاپەڕی ٩٥ ـ ٩٤

قوولە ، نەبینن . هەرچەندە بیروهۆشی مرۆڤی ساویلکە ئەو بەرەوپێش چوونە نابینێ و نای سەلمێنێ و باروودۆخی بەرچاوی بە یاسایەکی داسەپاو و سەقامگیر دادەنێ و بۆ بەرەوپێش چوون تێ ناکۆشێ ! لەوەش خراپتر بەم بۆچوونەوە ،خاوەن دەسەڵاتەکان هان دەدا کە خۆیان لەم باروودۆخەدا رابگرن و بۆ سەقامگیربوونیان بۆ مانەوەیان ، لە ئەنجامی هیچ جۆرە جیناییەتێك دریغ نەکەن ! ئەو مرۆڤە پێی وایە ، ئەو ئاکارە رەوایەو جیهان لەسەر ئەو بناخەوە دانراوەو مرۆڤ توانای ئەوەی نیە ،ئاڵ وگۆڕی تێدا پێك بێنێ . هەروەها بەم بۆچوونە کۆنەپەرستانەی خۆی ، گاڵتە بەم جموجۆڵە ئازادیخوازانە دەکا کە دەیان ساڵە لە ئارادایەو هێشتا بە ئاکام نەگەیشتوە . چونکە خۆی ئاکامەکەی نابینێ یان چاوەڕوان نیە چاوی پێ بکەوێ ، بە سەرکەوتووی نازانێ ! لەم بڕیەدا دەبێتە هۆی بێ ورەکردنی شۆڕشگێران و تێکۆشەرانی رێگای ئازادی ! لەوە نالەبارتر ،مرۆڤ وا هەیە کە خۆی ساڵەهای ساڵە لە جووڵانەوەیەکی ئازادیخوازانەدا بەشدارە و خاوەنی ئەم بیروباوەڕەیەو دەڵێ ئەگەر من بووکی ئازادی لەباوەش نەگرم ، ئازادبوونی کەسانی ترو گەل و کۆمەڵەکەم کە منی تێدا نەبم ، بێ کەڵکەو پێم هیچ نیە ! ! هەرچەندە تێ روانینی زانستی بۆ ئەفرادی کۆمەڵ بەتایبەت بۆ ئەوانەی ئامادەی لەخۆبوردنن ، لە پێناوی وەدەس هێنانی ئازادی دا ، لە نانی شەو و بەرگی خەو پێویستتره‌و دەبێ مرۆڤی خەباتگێر بیسەلمێنێ ، بە چەکی زانست ،چەکدار بێ و بەورد بینی و بە لەبەرچاوگرتنی باروودۆخی ئەو کۆمەڵەی تێدا دەژی بۆ فێرکردنی پلەکانی زانست و فێربوون بەشێوەی زانستی ، هەروەها بۆ لابردنی بیروباوەڕی چەوت و نازانستی و کۆنەپەرستانە ، هەنگاو هەڵبگرێ . تێگەیشتنی فەلسەفەی زانستی لەم بوارەدا ، یارمەتیدەرێکی بەرخەو پێویستە مرۆڤ بەوردی بۆ فێربوون و فێرکردنی زانستەکان چالاکانە تێ بکۆشێ و بەرهەمی کارەکەشی ، بە بارەگای خەڵك پێش کەش بکا .

لە پێوەندی لەگەڵ خەڵك دا ، پێویستە ئەو شتەی کە لەوان لە حالەتی پەیدابوون دایە ، لە حالی سەرهەڵ دان و جموجۆڵ و بەرەوپێش چوون دایە ،پەروەردە بکرێ و کەڵکی باشی لێ وەربگیردرێ و بەردی بناخەی کۆمەڵێکی بەختەوەر ، لەسەر ئەو شتەو شتە بەرەوگەشەکردنەکانی تر، دابندرێ . ئەم پێ گەیشتن و تێگەیشتنەش بۆ گشت کەسێك دەس نادا ،

چونکە زانیاری و هەڵسووڕانی مرۆڤ بەگشتی ، مەسەلەکە تەنیا لەمەڕادەی هەست پێ کردن و باس‌کردنی هەندێك دیاردەو راستی ورووداودا راگیر ناکەن . بەڵکوو پێویستە یاسای گەوهەری جێ گیری دیاردەکان و هۆیەکان و گشت پێوەندی یەکانی ناوخۆیی یان بدۆزنەوە . یاساکانی سروشت و کۆمەڵ راستەوخۆ بە هەست پێ کردن نازانرێن و لەگەڵ راستی یەکان ناگونجێن .
دۆزینەوەی پەرەسەندنی یاساکان ، بەواتای تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی سروشت و زانیاری زانستانەیە واتا چوونە ناوەوەی شتەکان و گەیشتن بەوەی کە دیاردە جۆراوجۆرەکان پێکەوە دەبەستێتەوەو ئەیان کاتە یەك دۆزینەوەی شتی سەرەکی و بنچینەیی لەناویان دا . پاش جۆربەجۆری ولەمەدوای دیاردەکانەوە " گەوهەر " هەیە کە بریتی یە لە پێوەندی ناوخۆیی و بناخەو یاسای پەرەسەندنیان . بۆ نموونە لە کۆمەڵی سەرمایەداری دا ، هێندێك دیاردە دێنە پێش چاو . وەك تەنگ وچەڵەمەی بێکاری ، هەژاری و رەنج کێشان ، ویران بوونی باری جووتیاران ، مانگرتنەکان و خۆپیشاندان لە دەی زوردار ی مونوپۆلەکان و شتی لەم جۆرە ، لەدوای ئەم دیاردانەوە ، گەوهەری سەرمایەداری هەیە کە ئەویش بریتی یە لەوەی کە سەرمایەداری رێژیمی رەنج خۆری و چەوسانەوەیە .
بەم جۆرە دەبینین گەوهەر دەربڕینی پێوەندی ناوخۆی جیهانی مەوزعی یەو بناخەی جۆراوجۆری دیاردەکانە . بەڵام دیاردەکان دیمەنی گەوهەرن ، شێوەی دەرەوەی دەرکەوتنی گەوهەرن ... لە ژیانی کۆمەڵایەتیش دا ، هێزەکانی کۆنەپەرستی کە بەرەو نەمان دەرۆن ، بە زۆری هەر بە ئارەزوو گەوهەر دەشێوێنن و بەرئاوەژووی دەکەنەوە ( ١ ) هەربۆیە ناسینی قووڵی ناوەڕۆکی دیاردە سروشتی و کۆمەڵایەتی یەکان ، خۆی بڕینی نیوەی رێگای سەرکەوتنە لە بۆزاڵ بوون بەسەر سروشت و تەنگ و چەڵەمەی کۆمەڵایەتی دا ... زانست هێزێکی یەکجار مەزنە ، کەسێك خۆی بە زانست چەکدار بکا ، بەزینی بۆنیە . خۆ ئەگەر نەمان زانیبایە لە جیهان چی روو دەدا ، توانای ئەوەشمان نەدەبوو ، تێیدا بژین و کار بکەین . ئەگەر زانست نەبوایە ، دەسکەوتەکانی بلیمەتی مرۆڤایەتی ،کارێکی نەگونجاو دەبوو .

---

( ١ ) ـ کورتەباسێکی ... پێشوو ، لاپەڕی ١١١ ـ ١٠٩

نەدەتوانرا مانگی دەسکرد و مووشەکی ناوگەردوون و وزەی ئەتۆم و شتی وا بەرهەم بهێنرێت و هەندێ شتی وابکرێ کە بەروالەت یەکجار ساکار دێنە بەرچاو ٠

سەرەرای ئەمە هێشتا کەسانێ وا هەن لافی ئەوە لێدەدەن کە مرۆڤ توانای نیە باری سەرنجێکی راستەقینە سەبارەت بە جیهان پەیدا بکاو بیناسێ !

پێشینیان دەڵێن زانست روناکی یە ، بەڵام هەموو کەس حەزی لە روناکی نیە ٠ روناك کردنەوەی جیهان بە هۆتی مەزنی مرۆڤ بە واتای بینینی زۆر شتە لە جیهان و زانینی زۆر شتە سەبارەت بە جیهان و توانایی ئەنجامدانی زۆر شتە لەو گەردونەدا ٠ ئەوانەش کە تاریکی بڵاو دەکەنەوە و گەل دەچەوسێننەوە ، هەموو تێکرا بەگشت جۆرێکیانەوە لەمە دەترسین ٠ چونکە مرۆڤی ئازاد لە کۆیلەتی کۆمەلایەتی و سیاسی و گشت جۆرە کۆیلەتی یەك ، دەبێتە ئاغای خۆی و لەسەر رێنوێنی زانست بناخەی ژیانی خۆی بنیات دەنێ ٠ ( تەنیا لە بواری ئازادی دایە کە بە تەواوی روو دەکەینە زانست ) مرۆڤ لە جیهان دا تەماشاکەرێك نیەو بەس، بەڵکوو ڕێگەرو خوڵقێنەر ٠٠٠ لە کارکردن دا ،لە پەیرەوکردن دا هەر شتێك لە توانا دابێ و وەدەستی مروڤ بکەوێ ، بۆ سەلماندن و راستی دەرخستنی ئەوەی ئەندامانی هەست پێ کردن بۆمان دەردەخەن بۆ گەیشتنە گەوهەری شتەکەو رۆچوونە ناو قووڵایی دیاردەکانەوە کە لێیان دەکۆڵێتەوە ٠٠٠ زانست بە تاقی کردنەوە پەیدا دەبێ ٠٠٠ ( ١ )

## یاساکانی گەشەکردن ٠

بۆ تێگەیشتن لە گەشەکردن ، پێویستە لە جیاوازی نێوان گۆرانی چەندی ( کەمو زیاد بوون ) و گۆرانی چۆنی ، تێپەربوون بۆ بارێکی تازە ، پەیدابوونی شتێکی تازە ، تێ بگەین ٠

ئاڵوگۆری چەندی هەمیشە لە یەك خاڵی قەیرانی دا ، سەرئەکێشێتە

( ١ ) ـ کورتەباسێکی ٠٠٠ پێشوو ، لاپەڕی ١١٢ ـ ١١١

لای گۆڕانی چۆنی یەوەو بەمجۆرە جیاوازیی یە چۆنی یەکان و گۆڕانە چۆنی یەکان ، هەمیشە لەسەر بناخەی جیاوازی یەکانی چەندی و گۆڕانەکانی چەندی ، سەقامگیر دەبن . هەروەها گەشەکردن ، نەك وەك جەرمیانێکی بەرەوپێش چوون و سەرهەڵدانی ساکار ، بەڵکوو وەك جەرمیانێك کە لە گۆڕانەکانی چەندی بە گۆڕانە ئاشکرا و بنەڕەتی یەکانی چۆنی دەگا ، پێویستە بزاندرێ .

سەرەڕای ئەو جێ بەجێ بوونە ، ئاڵ وگۆڕە چەندی یەکان ، بۆچوونی لە ئاکامی کێشە یان خەباتی مەیلی دوولایەنە کە لەسەر بناخەی دژە زاتی یەکانی گشت شتەکان و ئەوانەی پەیدا دەبوون ( دیاردە ) کار دەکەن ، روو دەدا و بەدی دێ . لە جەرمیانەکانی گەشەکردن بەواتای گۆڕان و جێ گۆڕانەوە ( تبدیل ) ئاڵ وگۆڕە چەندی یەکان بە چۆنی یەکان ، تێ دەگەین . زەمینەو شی کردنەوەی ئەم گەشەکردنە لە یەك بوون و شەڕی دژەکان دا ، بۆی دەگەڕێین . ( ١ )

وەك باس کرا دژەکان لە تەنیشتی یەکەوە نین ، بەڵکوو یەکیان گرتوەو لە ناو یەك دا چڕژاون و تێکرا و پێکرا کۆمەڵێکیان پێك هێناوە . ( ٢ )

## مەبەست لە گەشەکردن چیە ؟

لەکاتێك دا جەرمیانێك ، سروشت یان کۆمەڵ ئەخەینە بەر لێکۆڵینەوە ، تێ دەگەین : " ناز بوونەوەو گەشەکردن هەیە . هەمیشە شتێك دێتە هەوێلی بوونەوەو بەرەوپێش دەچێ و شتێك بە لق و پۆی دابەش دەکرێ و دەمرێ " . ئەوکات شتێك لەباری پشکووتن و گەشەکردن دایە ، بە بەرهەم دەگا . ئەوەی کە بەسەر لقەکانی دا دابەش دەبێ و دەمرێ و لە ئاکام دا لەنێو دەچێ ، شتێکی تازە دێتە جیهانی هەبوونەوە ، چونکە جەرمیانەکان هەمیشە دەورێك گۆڕان دووپات ناکەنەوە ، بەڵکوو لەبەرئەوە هەمیشەو بێ وەستان ، شتێکی تازە خۆی دەنوێنێ ، پلە بە پلە لە جموجۆڵ دان .

---

( ١ ) ــ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٠١

( ٢ ) ــ کورتەباسێکی ... پێشوو ، لاپەڕی ٦٨

ئەمە واتای راستەقینەی وشەی " گەشەکردن "ە · کاتێك باسی بەرەوپێش ــ چوون دەکەین کە پلە بە پلە ، شتێکی تازە خۆی دەنوێنێ ، هەربۆیە لەنێوان ئاڵ وگۆڕی بێ ئەملا و ئەولا و گەشەکردن دا جیاوازی هەیە · بەرەوپێش چــوون گـۆڕانێکە کە بەپێی یاساکانی نێوخۆیی ،خۆی لە پلەیەکەوە بــــــــەرەو پلەیەکی تر ، بەرەوپێش دەچێ ·

هەروەها لەنێوان بەرەوپێش چوون و سەرهەڵدان ( رشد )دا جیاوازی هەیە · سەرهەڵدان بەواتای گەورەبوونەوەیە · تەنیا گۆڕانی چەندی یە · بەڵام بەرەوپێش چوون و گەشەکردن بەو جۆرە نیە ، بەڵکوو بریتی یە لە تێپەڕبوون بە پەیەك لەباری چلۆنی تازەوە · واتا لەباری چۆنی یەوە ، جیاوازی هەیـــە · بۆ نمونە ،کرمێکی ئاوریشمی ، دڕێژترو گەورەتر دەبێ پاشان بەدەوری خــۆی دا تۆڕ ( پیلە) ئەچنی و لە ئاکام دا بەشێوەی پەروانە ، خۆی دەنوێنـــێ · واتا دەبێتە پەروانە · ( ١ )

بازدان بریتی یە لە نوختە وەرچەرخانێکی کاریگەر لە چلۆنایەتی یەکـــی کۆن دا بۆ نوێ ، وەرچەرخانێکی توند وتۆڵ لە پەرەسەندن دا ،جەرەیانــــی پەرەسەندن لە دوو قۆناغ دا تێپەڕ دەبێ ·

ئاڵ وگۆڕی لەسەرخۆ و کەم لە چەندی یەوە بۆ ئاڵ وگۆڕی خێرا و بنەڕەتـــی چلۆنایەتی · ئاڵ وگۆڕی لەسەرەخۆ هەمیشە لە سنووری پێوانە کۆنەکەدا لــــە سنووری چلۆنایەتی یە کۆنەکەدا ، روودەدات · لەمەڕا هێشتا ئاڵ وگــــۆڕی بنچینەیی لە شت وەك و دیاردەکان دا ، روونادات · بەم مانایـــــــــە دەتوانرێ ، بە ئاڵ وگۆڕی بەرەبەرە ناو بردرێ · ئەم بەرەبەرەیـــــــــــــە پەرەسەندنێکی هێواش و لەسەرەخۆ و پلە بە پلەی بێ بازدانی گــــــەورە و وەرچەرخانە بۆ چلۆنایەتی یەکی نوێ · بەڵام ئەو پەرەسەندنەی بەسترا وە بـــە تێکدانی تەواوی کۆنەوە ، بە وەرچەرخانێکی چلۆنایەتی لە پێوەندی یەکانـــی کۆمەلایەتی دا ،لە بیروڕای زانیاری و باری تکنیك و شتی وادا ، پێـــــــی دەگوترێ " پەرەسەندنی شۆڕشگێڕانە " ·

مێتافیزیسیەنەکان واتای " بەرەبەرە " تێك دەدەن · هێندێکیــــــان پێیان وایە · پەرەسەندنی بەرەبەرە ، تەواو دەبێ ، بە بێ هیچ چەشنـــــە

---

( ١ ) ــ کونفورت ، پێشەو ، لاپەڕی ١٠٢

بازدانێك . دەڵێن ئەوەی لە جیهان دا ڕوودەدا ، بەتەنیا ئاڵ وگـــۆڕی چەندایەتی یە . لە سروشت دا هیچ شتێك نیە لە ڕووی چلۆنایەتی یەوە نوێ بێ . (١)

## چەندی وچۆنی و یاسای وەرچەرخانی چەندی یەکان بـــــــەرەو چۆنـی یـــەکـــان

لێرەدا دوو تایبەتمەندی شێوەی دیالکتیکی بەناوی " یاســــــای دیالکتیك " ناو براوە :

یەکەم ــ یاسای گۆڕانی چەندی بە گۆڕانی چلۆنی . واتا گشت گۆڕانێــك لایەنی چەندی هەیە . واتا لایەنێکی تەنیا زیادبوون یان کەم بوونـــەوە ، ناوەرۆکی شتێك کە گۆڕانی بەسەردادێ ، ناگۆڕێ . گۆڕانی چەندی زیـــاد بوون و کەم بوونەوە ناتوانێ هەتاهەتایە ، درێژەی هەبێ ، لە حاڵێکـــــی دیاریکراودا هەمیشە سەر ئەکێشێتە لای گۆڕانێکی چلۆنی یەوە . لەو کاتـــە خاوەن قەیرانـــەدا ،گۆڕانی چۆنی بەنیسبەت بەشێوەی لەنەکاووەك ئەوە ببێ بە ڕاپەڕینێك ، بەدی دێ .

بۆ نموونە ئەگەر هەتاهەتایە بە ئاو گەرما بدرێ ، بەرەو گەرم و گەرمتـــر ناچێ ،لە گەرمایەکی قەیرانی دیاریکراودا ، دەس دەکا بە کوڵین بە هەڵمو تووشی ئاڵ وگۆڕی لە تەڕایەوە ( ئاوەکی ) بەرەو گازبوون ، دەبێ .

ئەم یاسایە لە کۆمەڵیش دا دەبینین . پێش ئەوەی سیستەمـــــــی سەرمایەداری سەنعەتی پەیدابێ ، جەرمیانێك لە کۆبوونەوەی سامان بـــە شێوەی پوڵ ، لەژێر دەسەڵاتی تاقمێك دا ،دەمێنێ . کۆمەڵێکـــــــی زەحمەتکێش و کرێکاری هەژاریێك دێ . لە حاڵ و بوارێکی دیاریکراودا ، لەم جەرمیانەدا ،ئەوکات کە پوڵی پێویست و تەواو بۆ ئامادەکردنـــــی سەرمایە بە مەبەستی جێبەجێ کردنی کارە سەنعەتی یەکان ، کۆ ببێتەوە ، ئەوکات ژمارەیەکی زۆر خەڵك بۆ ئامادەکردنی کاری پێویست بـــــەرەو کرێکاری ڕاستەقینە چوون ، هەلومەرجەکان بۆ بەرەوپێش چوون و گەشەکردنی

---

(١) ــ کورتەباسێکی . . .پێشوو ، لاپەڕە ٦٢

سەرمایەداری سەنعەتی ، ئامادە بێ . لەم بوارەدا کۆبوونەوەیەك لە ئاڵ وگۆڕە چەندی یەکان ، دەبێتە هۆی پەیدابوونی ، پلەیەکی چۆنی تازە لە گەشەکردنی کۆمەڵ دا .

گشت جیاوازی یە چۆنی یەکان لە سروشت دا لەسەر بناخەی جیاوازی یەکانی تێکەڵاوە شیمیایی یەکان چەندی یە جۆرا وجۆرەکان یان شێوەکانی جم وجۆڵ یان بەو جۆرە کە هەمیشە هەیە لەسەر هەرد ووکیان دانراون . هەربۆیە شتی ئاوەها ناگونجێ کە بتوانین چۆنیەتی جەستەیەك بێ ئەوەی زیاد یان کەم کردنی مادە یان جم وجۆڵ هەبێ واتا بێ گۆڕانی چەندی جەستەی لە بەرچاو گیراو ، بگۆڕین . لە زانستەکان دا نموونە زۆرن کە ئاڵ وگۆڕە چەندی یەکان لە بوارێکی دیاری کراودا ، جێی خۆیان بە ئاڵ وگۆڕی چۆنی دەدەن ، جیاوازی یە چۆنی یەکان ، لەسەر بناخەی جیاوازی یە چەندی یەکان دانراون . ئەمە تایبەتمەندی جیهان داگری بەرەوپێش چوونە . چ شتێك ئەبێتە هۆی ئەم بەرەوپێش چوونە ؟ (١)

## چەندایەتی و چلۆنایەتی چۆن بناسین ؟

بۆ دروست کردنی فڕۆکەیەکی تێژڕەو کە لە خێرایی دەنگ تێژڕەوتر بێت ، هێندێك کەرەسەی وا پێویستن کە لە سروشت دا نین . لە کوێ ئەو کەرەسەمان بەدەست دەکەوێ ؟ بۆ نموونە لەکوێ جۆرە میتالیکمان دەست دەکەوێ کە لە پۆڵا پتەوتر بێ ؟ یان لە شووشە روونتر و پاك تر بێ ؟ زانستی کیمیا کلیلی ئەم مەسەلەی دابەدەستەوە . زاناکان فێربوون چۆن پولیمێرەکان دەبیننەوە . واتا ئەو مادانەی بە شێوەکاکانیان لە ژمارەیەکی یەکجار زۆر ئەتۆم پێك هاتوون . زاناکانی شیمی بە گۆڕینی پێك هاتنی چەندایەتی ئەو بەشۆکانە ، چلۆنایەتی تازەیان دروست دەکرد ، خاسییەتی نوێی مادەکانیان دەهێنا ناوەوە . چلۆنایەتی و چەندایەتی چین ؟ لەهەر شتێك دا جۆرە شتێکی وا هەیە کە ئەو شتەی پێ دەناسێنن . ئەگەر سەرنجی دەورو پشتی خۆمان بدەین گەلێك شت دەبینین ، بۆ نموونە

(١) ــ کۆنفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٠٦ ــ ١٠٣

شووشەی مەرەکەب، دارو ئاژەڵ دەبینین، چەشنە نیشانەو لایەن و خاسی یەتێکی وای هەیە کە پێی دەناسرێ و لە شتەکانی تر جیاکرێتەوە. بە ناسینی خاسی یەتە سەرەکی یەکانی پێناوس، دەتوانین لە داری جیا بکەینەوە. ئەمەش چلۆنایەتی یەکەیە بەم چەشنە چلۆنایەتی بریتی یە لە چۆنیەتی ناوخۆیی ئەو شتە، کە لکاوە بە شتەکە خۆیەوە، سەرجەمی خاسییەتە بنەرەتی یەکانی شتەکە بە هۆیەکیانەوە، بە چەشنێکی نیسبی جێگیر بۆەو لە شتەکانی تری پێ جودا دەکرێتەوە. ئەی چۆن چلۆنایەتی دەناسین ؟ بۆنموونە، مندالێك شووشەیەك شیری کڕی لەسەر جادە لە دەستی کەوتە خوارەوە، بەڵام شووشەکە نەشکا، لێرەدا ئێمە لەبەردەم چلۆنایەتی یەکی تازە داین، کە ئەویش " جۆرە شووشەیەکە ناشکێ " . لەمەوە دەگەینە ئەنجامێك کە ئەویش چلۆنایەتی یەکی تازەیە. (١)

لەباری تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی دا کەسێك ٥٠٠ دەنگی بۆ رۆیشتن بە مەجلیس پێویستە. ئەگەر ٤٩٩ دەنگی پێ بدەن، هەڵنابژێردرێ. وەك باری پێشوو کە ناودێرە ئەمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر یەك دەنگی پێ زیاد بکرێ، ئەم گۆڕانە چەندی یە ( زیادکردنی تاقە دەنگێك ) لە گۆڕانی چلۆنایەتی دا خۆ دەنوێنێ. واتا کەسێك کە ناودێر بوو، دەبێتە نوێنەر. (٢)

## گەشەکردن لە رێگای یەك بوون و کێشەی دژەکانەوە بە ئەنجام دەگا.

بەگشتی هۆی ئەوە کە لەهەر بوارێکی تایبەتی دا، گۆڕانی چەندی سەر ئەکێشێتە لای گۆڕانی چلۆنی یەوە، لە خۆدی نێوەرۆکی جەرەیانی تایبەتی دایە کە لەکاردا، شاراوەیە. بۆچی بەزانیاری یەوە دەتوانین نیشان بدەین کە بۆچی گۆڕانێکی چۆنی پێویستە ئەنجام بدرێ و بۆچی لە بوار و خالێك دا، جێ بەجێ دەبێ کە پێویستە ببێ ؟

ناتوانین تەنیا بە یارمەتی دیالکتیك پەسێك بخولقێنین، تێگەیشتن

---

(١) ــ کورتەباسێکی ... پێشوو، لاپەڕی ٥٧ ــ ٥٦

(٢) ــ اصول مقدماتی فلسفه، پێشوو، لاپەڕی ١٨٧

لە دیالێکتیك لەو شوێنەدا یاریدەدەدا، کلیلێك بەدەستمانەوە بدا کە بزانین لە چ شوێنێك تەماشای بکەین. لە بابەتێکی تایبەتیدا دەگونجێ کە نەزانین هۆی گۆڕان چیەو چۆنیەتی ئەنجامدانی چۆنە؟ لەو بوارەدا ئەرکی ئێمە شی کردنەوەی ڕاستی یەکانی بابەتەکەو مەسەلە چارەسەر کراوەکەیە. چونکە هیچ شتێك وانیە کە نەزاندرێ. هیچ نارازیەك بنەڕەتی یان ڕەمزی و نهێنی گەشەکردن سەبارەت بە پەیدابوونی ئەو شتانەوە کە بەشێوەی جۆری خۆ دەنوێنێ، لە ئارادا نیە... لەهەر جێگایەك جەرەیانی بەرەوپێش چوون، لەگەڵ ئاڵوگۆڕی، گۆڕانە چەندییەکان بە گۆڕانە جۆری یەکان، بێتە پێش، هەمیشە لەودا شەڕی دژەکان ( مەیلە دوو لایەنەکان ) هێزە بەرامبەرەکان ( متقابل ) لە دەروونی ئەو شتە کە کەوتۆتە بەر لێکۆڵینەوەوە، خۆ دەنوێنن. واتا هەمن. بەم شێوە بەم یاسا کە گۆڕانەکانی چەندی جێی خۆیان بە گۆڕانە جۆری یەکان دەدەن و ئەوە کە جیاوازی لە چۆنیەتیدا لەسەر بناخەی جیاوازی چەندییەتی، دانراوە، ئێمە بە یاسای یەکیەتی ( وحدت ) و شەڕی دژەکان، دەگەینێ.

دیالێکتیك بەپێچەوانەی میتافیزیك، پێی وایە کە دژایەتی یەکانی دەروونی زاتی گشت شتەکانی سروشتن، چونکە گشت ئەوانە لایەنەکانی " مثبت و منفی " ڕابردوو و داهاتووی شتێکی بەرەو مەرگ چوو و شتێکی بەرەوپێش چوویان هەیەو ئەوە کە شەڕ لەنێوان ئەم دژانەدا بریتی یە لە، تێك ـ هەڵچوون لەنێوان کۆنەو نوێ یان لەنێوان ئەو شتەی کە دەمرێ و ئەوەی کە لەدایك دەبێ، لەنێوان ئەو شتەی ون دەبێ و ئەو شتەی کە بەرەوپێش دەچێ. نێوەڕۆکی دەروونی جەرەیانی بەرەوپێش چوون، بریتی یە لە نێوەڕۆکی گۆڕانی ئاڵوگۆڕە چەندییەکان بە چەند ئاڵوگۆڕی جۆری.

هەربۆیە شێوەی دیالێکتیك پێی وایە، جەرەیانی گەشەکردن لە پەستەوە بۆ سەرەوە و بەرەو بەرزتر، نە بە شێوەی کرانەوەیەکی هاوئاهەنگی دیاردەکان، بەڵکوو بەشێوەی کرانەوەی دژە زاتی یەکان لە دیاردەکان دا و بە چەشنی خەباتی مەیلە دوو لایەنەکان لەسەر بناخەی ئەم دژانە هەڵگا و هەڵ دەگرن، بەدی دێ. بۆ تێگەیشتن لە بەرەوپێش چوون و لەوە کە چۆن و بۆچی ئاڵوگۆڕە چەندییەکان، سەر ئەکێشێتە لای ئاڵوگۆڕەکانی جۆری یەوە. بۆئەوەی تێ بگەین چۆن و بۆچی تێپەڕبوون لەبارێکی جۆری کۆنەوە بە بارێکی

چۆنی تازەوە ، بەدی دێ ، پێویستە لە دژە زاتی یەکانی هەرشتێك و هەر جەرمیانێك کە ئەکەوێتە بەرچاومان و چۆنیەتی خەباتی مەیلە لە بەرامبەر یەکەکان کە لەم بناخەوە سەر هەڵ دەدا ، حاڵی بین •

پێویستە بەروونی لەهەر شتێك دا لەم دیاردە تێ بگەین ، چونکە دانراو ( تز) ی بنەرەتی دیالکتیك ئەمەیە کە • راستی هەمیشە دیاری کراوە • لە ئەسڵە گشتی یەکانی دیالکتیك یاساکانی وەك ئاکام وەربگرین • پێویستە بە شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی راستەقینەی دیاردەیەك ئەوانە بدۆزینەوەو دیالکتیك پێمان دەڵێ • بەدوای چی دابگەڕێین • ( ١ )

بەشی پێنجەم •

## دژەکـــــان •

لە دەروونی هەر جەرمیانێك دا ، یەکیەتی و خەتی مەیلە دژبەیەکان ، هەیە • ئەم دژایەتی یە زاتی جەرمیانەکانەو جێ بەجێ کردنی دژە زاتی یەکان لە جەرمیانەکانی سروشت و کۆمەڵ دا سەر ئەکێشێتە لای ئاڵ وگۆڕی چلۆنی یەوەو هێزی دنەدەری ئەم گۆڕانمیە • دژایەتی لە گشت شتەکانی جیهان دا ، سەرانسەری جیهان دەگرێتەوە • بەڵام یاساکانی هەر جەرمیانێك تەنیا بەهۆی لێکۆڵینەوەو تێ ڕوانینی بنەڕەتی تایبەتی ئەو جەرمیانە، شێوازە تایبەتی یەکانی لە بوارە تایبەتی یەکان دا ، ئەو شتانە بە خۆیانەوە ... کرێ ، دەزاند رێ • ( ٢ )

## دژایەتی زاتی لـــە جەرمیانەکـــان دا •

نیشانمان دا کە چۆن گۆڕانی چەندی بەهۆی خەباتی هێزە دژبەیەکان ، پێك دێ • ئەم شتە لە گۆڕانی باری لەشێك دا لە تەڕەمەنی یەوە بەرەو وشك یان بەرەو هەڵم و گاز ( گۆڕانی ئاو بەگازو هەڵم ) هەروەها لـــە

---

( ١ ) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٠٨ ـ ١٠٦

( ٢ ) ـ هەر ئەم سەرچاوە ، لاپەڕی ١٢

گۆڕانی کۆمەڵ لە بوارێکەوە بۆ بوارێکی تر، دەرنیشان دەکرێ. لە هەر شتێك دا مەیلە دژییەکان لە ئاراداین، خەباتی ئەوان سەر ئەکێشێتە لای گۆڕانێکی شێوازی بنەڕەتی گۆڕانێکی چلۆنی یەوە...

ئەم کێشەو خەباتە دەروونی یان رواڵەتی بەشێوەی زوو نەمان (عرضی) نیە. خەباتی دەروونی و پێویستە، چونکە لە نێوەرۆکی دیاردەدا کە بە شێوەیەکی گشتی رادەپەڕێ و جەرەیان پەیدا دەکا، جیا لە یەکتر نیەسن، بەڵکوو جیایی قبووڵ ناکەن واتا بەشێوەی بەتەکانی یەك شت لێك جیا نابنەوە، پێکەوە پێوەندییان هەیە. ئەوانە بەشێوەی دژ زاتی یەکان لە جەرەیان دان بەشێوەی یەك گشت (کل) کاردەکەن و بەرەوروود ەبن. (۱)

ناکۆکی و ناتەبایی بریتی یەلە پێوەندی نێوان دژەکان. دژەکان بریتین لە هێندێك لایەنی ناکۆکی... (۲) دژەکان لە پێوەندی نێوان یەکتردان. ئەم پێوەندییەش زۆر تونده و لێك جوێ ناکرێتەوە، بەرادەیەك کە بە بێی ئەو پێوەندییە نابن، کە ناوی ئەم پێوەندییە "یەکیەتی دژەکان"ە. یەکیەتی دژەکان لەوەدایە کە بە چەشنێکی وا یەکیان گرتووە و پێکەوە لکاون، ناتوانرێت لێك جیا بکرێنەوە هەموو پێکەوە یەك پراتیکی ناکۆکیان، دروست کردوە. مل ملانی دژەکان سەرچاوەی پەرەسەندنی جوولانەوەیە. لەمێژ هەموو شت وەك و کردەوەکان دا، هێندێك لایەنی ناکۆکی هەیە کە لە یەکیەتی یەکی بەتین دان، هەرلەوکاتەش دا لە ناکۆکی یەکی بەردەوام دان. ئەم مل ملانەی دژەکان سەرچاوەی نێوخۆیی و هێزی بزوێنەری پەرەسەندنە، ئەمە ناوکی دیالکتیکە. (۳)

جموجۆڵ و گۆڕان لە هۆیە زاتی یەکان لە دیاردەو جەرەیانەکان، لە دژایەتی یە دەروونی یەکان دا، پەیدا دەبن. بۆ نموونە چەمکی میکانیکی کۆنەی جموجۆڵ، ئەوەبوو کە جموجۆڵ تەنیا کاتێك دەتوانێ خۆی بنوێنێ کە جەستەیەك لە جەستەیەکی تر بکەوێ. هۆیە دەروونی یەکانی جموجۆڵ لە ئارادا نەبوون. واتا خۆ جموجۆڵی نەبوو، بەڵکوو تەنیا هۆیە

---

(۱) ـ کونفورت، پێشوو، لاپەڕی ۱۱۳ ـ ۱۱۲

(۲) ـ کورتەباسێکی ... پێشوو، لاپەڕی ٦٦

(۳) ـ ئەم سەرچاوە، لاپەڕی ۷۰ ـ ٦٦.

دەرەوەیی یەکان هەبوون ، بەڵام بەپێچەوانەی مەیلە دژمیەکەکان کە لە جەرمیانی گۆڕانی باری جەستەیەك دا کارد ەکەن ،لەسەربنا خەی یەك بوونی خاوەن دژی هێزەکانی راکێشان و پاڵ پێوەنەری زاتی لە گشت شتە فیزیکی یەکان دا ، کارد ەکەن ۰۰۰ (۱)

## دژایەتی ، یەکیەتی وکێشەی دژەکان دەگرێتەوە ۰

هێزی دنەدەری عاڵ وگۆڕی چۆنی لەو دژانەدا کە لە دەروونی گشت جەرمیانەکانی سروشت، وکۆمەڵ دا هەیە ،شارد راوەتەوە ۰ هەربۆیە لەبەرئەوە لە کرد ەوەدا لە دیارد ەکان حاڵی بین و بیان خەینە ژێرچاوەدێری و بەسەریان دا زاڵ بین ، پێویستە لە لێك دانەوەی دیاریکراوی ئەوانەوە ،بە رێگای خۆمان دڕێژە بدەین ۰ مەبەستمان بەوردی لە دژایەتی چیە ؟ وەك لەپێش دا بەوردی باسمان کرد ۰

بە پێی چەمکی ناسراو و ساکاری میتافیزیکی ، دژلە بیروباوەڕەکانی ئێمەدا سەبارەت بە دیارد ەکان هەیە ، نە لە خودی شتەکان دا ۰ ئەم شێوە دیتنە بریتی یە لە تەماشاکردنی شتەکان بەشێوەی راوەستاو و یەك و بێ لەبەرچاوگرتنی جموجۆڵ و پێوەندی لە تێکۆشانی شتەکان دا ۰۰۰

دژایەتی یەکی راستەقینە بریتی یە لە یەك بوونێکی دژەکان ، یەك دژی راستەقینەی زاتی ۰ لە کاتێك دا لە خودی ناوەرۆکی یەك شت یان جەرمیان یان پێوەندی' هەیە کە لەوانەدا مەیلە دژمیەکەکان پێکەوە بەشێوەی یەك تێکەڵاو بوون کە هیچ کام لەوانە بێ ئەوی‌تر ناتوانی هەبێ ، لە یەك بوونی دژەکان ، دژمیەکتر لە پێوەندی یەکی پاڵ پێوەدەربە یەکتردا ، هەن ، کە لەودا هەرکام مەرجی بوونی ئەوی‌ترە ۰۰۰

بۆ نموونە ، لەبەرئەوە چینە دژمیەکەکان لە کۆمەڵی سەرمایەداری دا یەکن " وحدت "تیان هەیە ، بەرەوپێش چوونی ئەو کۆمەڵە بەشێوەی، خەباتێکی چینایەتی جەرمیان پەیدا دەکا و بێجگەلە جێ بەجێ بوونی ئەو جەرەیانە ، چارەیەکی نیە ۰

---

(۱) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ۱۱٤ ـ ۱۰۱

## چارەسەرکردنی ناکۆکی یە دژەکان : ( working out )

ئێمە تەنیا دەتوانین جەریانەکانی سروشت و کۆمەڵ بەهۆی حاڵی بوونە دژەکانی ئەوان و داهاتووی ئەوان ( ڕێگایەک کە ئەوانە خۆیان جێبەجێی دەکەن ) بزانین ، بیان خەینە ژێرچاوەدێری و بەسەریان دا زاڵ بین . دژبەریتی یە لە هێزی دنەدەر ، هەربۆیە ئەگەر ئێمە بمانەوێ تێبگەین کە دیاردەکان چۆن ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێ و ئاڵوگۆڕەکانیان بخەینە ژێرچاوەدێری و کەڵکیان لێ وەرگرین ، پێویستە ، لە دژایەتی یەکانیان ئاگادار بین .

بۆ دەبێ بڵێین دژایەتی هێزی گۆڕانە ؟ چونکە تەنیا بوونی دژایەتی لە یەک جەریان دایە کە هەل ومەرجی دەروونی کە بۆخۆی گۆڕان ئەکاتە شتێکی پێویست ، دەرەخسێنێ . جەریانێک کە دژایەتی تێدا نەبێ ، هەر بەوجۆرە کە هەیە دڕێژە ( بەرەوتی خۆی ) دەدا ، تا هێزێکی دەرەوەیی ڕای بگرێ یان ڕاس و ڕێسی بکا . جموجۆڵێک بێ دژایەتی ، دەبێتە دووپات کردنەوەی جموجۆڵێک . بوونی دژەکان واتا مەیلە دژیەکانی جموجۆڵ یان یەک بوون و کێشەی دژەکانە ، کە ئەبێتە هۆی گۆڕانی جموجۆڵ لە جێبەجێ کردنی جەریانێک دا . ئەگەر بتوانین کۆمەڵێکی بێ کێشە لە پێش چاو بگرین . ئەوە کۆمەڵێکە کە خەڵک بە درێژەدانی کارەکانیان بە شێوەی پێشوو ، نیازەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن . ئەم کۆمەڵگایە هیچ کات گۆڕانی بەسەردا نایە . لەو ڕوانگەوە کە خەڵک لە گشت کاتێک دا ئەو کۆمەڵگایە کاردەکەن ، هەڵبەتە لە جموجۆڵ دان ، بەڵام هەمیشە یەک جموجۆڵە . یەک جەریانە و دووپات دەبێتەوە ، بەڵام کۆمەڵگای ئاوەها لە ئارادانیە و ناشتوانێ هەبێ ، چونکە بەهۆی خودی سیرەوکی بارودۆخی ژیانی مرۆڤەوە ، پێویستە لە کۆمەڵ دا دژایەتی و کێشە هەبێ . خەڵک بە ڕازی کردنی نیازەکانیان و گەیشتن بە ئارەزووەکانیان داخوازی تازە دەخوڵقێنن و لەگەڵ گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانیان ، هەل ومەرجێک پێک دێنن ، پێویست دەبێ ئەوان پێوەندی و بنکەو بنیاتە کۆمەڵایەتی یەکانیان بە پێی ئەو هەل ومەرجە ، بگۆڕن . چونکە لە کۆمەڵ دا ئاڵوگۆڕ پێک دێ . جەریانی کۆمەڵایەتی ، جەریانێکی دووپات بووەوە نیە ، بەڵکوو

جەرمیانێکە کە لەودا شتی تازە دێنە مەیدانەوە ...

ئەم راستی یە نیشان دەدا لە شوێنێك دژایەتی هەبێ ، چارسەر ـ کردنیان بەدوای دادێ . حەللی کێشەی دژەکان کە لە یەك بوونیانەوە سەرچاوە دەگرێ ، جەرمیانێك ، بریتی یە لە حەللی دژە بنەڕەتی یەکانی خۆی . (١)

ژیان بریتی یە لە دژایەتی یەك کە لە خۆدی دیاردەوکارەکسان دا هەیەو هەمیشە خۆی دەنوێنی و ئاڵوگۆڕی بەسەردادێ . لەو جێگایە کە دژایەتی لەنێو بچێ ، ژیانیش کۆتایی پێدێ و مەرگ خۆی دەنوێنی و سەر هەڵدەدا . لەم ڕوانگەوە تەنیا کارەکان بە یەکتر دەگۆڕدرێن ، بەڵکوو هیچ کارێك بەتەنی و بەو جۆرە هەیە ، نامێنێ و بریتی یە لە شتێك کە د ... خۆیشی دەگرێتەوە . هەرشتێك بە دژی خۆیەوە سکی پڕە . لە ژ... دا چەند هێز هەن کە ژیانیان تێدایەو مەیلیان وایە کە هێزی ژیان رابنێرن . لەلایەکی تر لە لاشەو جەستەی زیندووەدا چەند هێز هەن کە مەیلیان ئەوەیە هێزەکانی ژیان رانەگرن . لە هەر شتێك دا چەند هێزی لایەنگر و دژ هەیە . دژایەتی وا لەنێوان راگرتن و رانەگرتن ، دانان و هەڵگرتن ( اثبات ونفی ) دا . (٢)

## جیهان وەبەرگروگشتی بوون و تایبەتمەند بوونی دژەکان .

ـ دژایەتی تایبەتمەندییەکی جیهانی و جیهان وەبەرگری گشت جەرمیانەکانە . بەڵام هەرجۆرێکی تایبەتی ، دژایەتی یە تایبەتی یەکانی خۆی هەیە کە هی خۆیەتی و لە هی ئەوانی تر جیاوازە ... هەر جۆرە جەرمیان خاوەنی دیالکتیکی خۆیەتی کە دەتوانێ تەنیا بە لێکۆڵینەوەی لێ و پۆی ئەو جەرمیانە بزاندرێ . دیالکتیکی جیهانی ژێر گەردیلە لەگەڵ دیالکتیکی ئەولەشانەدا کە راستەوخۆ بەهۆی هەستەکانمانەوە لێی حالی دەبین ، جیاوازی هەیە . هی چوارچێوەی لەشی زیندوو لەگەڵ هی

(١) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١١٨ ـ ١١٧

(٢) ـ اصول مقدماتی فلسفه ، پێشوو ، لاپەڕی ١٦٥ ـ ١٦٤

نازبند وو ، داڕوبەرد ،جیاوازە • هی کۆمەڵی مرۆڤایەتی بریتی یە لـــــە یاسایەکی جموجوڵی تازە : هەرپلەیەك لە پلەکانی کۆمەڵایەتی خاوەنــــی دیالکتیکی تایبەت بەخۆیەتی • بۆ نموونە کێشەو دژایەتی لەنێوان مەیلەکانی باڵ پێوەژەنان و ڕاکێشان لە جموجوڵی فیزیکی دا و کێشە لەنێوان قازانجە چینایەتی یەکان لە کۆمەڵ دا ، هەردووکیان کێشەو دژایەتین • ئەمــــە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو ڕەوتە جیهانی یە ، بەڵام هەرکامیان تایبەتمەندی و شێوازی خۆی هەیەو ئەمەش نیشانەی تایبەتمەندی دژایەتی یە • ئەگـــەر تێبگەین کە یاساکانی فیزیك یان کۆمەڵ لە بیروباوەڕی جیهان وەبەرگــری دژەکان ،بەشێوەی دیگەری ( استقرأ ) ؛ بیان ناسین ، ناتوانین فێریـــان بین • تەنیا لە ڕێگای لێکۆڵینەوەی جەرمیانە فیزیکی و کۆمەڵایەتی یەکانـــەوە ، دەتوانین فێریان بین • جموجوڵی فیزیکی و جموجوڵی کۆمەڵایەتـــی ، دوو شێوازی بە تەواوی جیاوازن ، هەروەها ئەو دژانەی کە بەهۆی زانستـــە کۆمەڵایەتی یەکانەوە ئەکەونە بەر لێکۆڵینەوە ، لەگەڵ ئەوان دا ، جیـــاوازن ، ئەوانەی کە بەهۆی فیزیکەوە ئەکەونە بەر لێکۆڵینەوە ، بە شێوەیەکی جیـــاواز ، چارەسەر دەکرێن •

جەرمیانە کۆمەڵایەتی و فیزیکی یەکان ، لەو بارەوە وەك یەکن ، کە هـــەر کامیان ، دژایەتی یان تێدایە ، بەڵام لەو بارەوە کە هەرکامە چەنــــــد دژایەتی یان هەیە ،جیاوازن • دژایەتی هەرجۆرە جەرمیانێك دەکرێ نـــاوی بنرێتە " دژە بنەڕەتی یەکانی ئەو جۆرە " • دژایەتی یەکانی نێوان هێزەکانی ڕاکێشان و پاڵ پێوەنان ،بریتین لە دژایەتی بنەڕەتی جەرمیانەکانی فیزیکی و دژایەتی یەکانی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنان و پێوەندی یەکانی بەرهـــەم **هێنان** ، بریتین لە دژایەتی یە بنەڕەتی یەکانی جەرمیانەکانـــــــــی **کۆمەڵایەتی** • • • ( ١ )

## کێشـــەی تـــازەوکـــۆن •

گۆڕانی چۆنی کاتێك دێتە پێش کە یەکیەتی یەکی دژە کۆنەکان کــــــە

---

( ١ ) ـ کرنفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٢٠ ـ ١١٨

لەودا لایەنێك زاڵ بێ ، بەهۆی یەك یەكیەتی دژە تازەكان ، كە لـــــەودا پێوەندی زاڵ بوون گۆڕاوە ، جێگا گۆڕینەوە بەدی دێ • نێوەڕۆكی ئـــــەم ئاڵ وگۆڕە بەهۆی نێوەڕۆكی ئەم دژە دەروونی یانە كە خۆی ئاكامی ئەوانـــــە ، دیاری دەكرێ • لە هەمان كات دا دەكرێ ، بە كەڵك وەرگرتن لە هۆیـــــە دەروونی یەكان ، راس و ریس بكرێ و هەمیشە بەوانەوە ، بەسراوە ( بـــــە مەرجی بوونیان خۆ دەنوێنێ ) •

پەیدابوونی چۆنی یەكی تازە ، هەمیشە لەنەكاوە • لە حاڵێـــــــكدا تەواوكردنی گۆڕانی تازە ،تەواوبوونی گۆڕانی چۆنی ، لە جێگادانانـــــی چۆنیەتی كۆنە بەهۆی چۆنیەتی تازەوە ، جەرەیانێكی لەسەر ستۆنگەو پلە بـــــە پلەیە كە بە پێی نێوەڕۆكی ئەو هێزانەی كە لەكاردان و عەل ومەرجێك كـــــە ئەوان لەودا كاردەكەن ، دەتوانێ كاتی كەمتریان زیادتر ، بگرن •

هەر ئەو خەباتەی كەبەهۆی ئەوەوە گۆڕان پێك دێ ، شێوازی جۆراوجۆر بەخۆیەوە دەگرێ و لە كۆمەڵ دا لەنێوان شێوازە دژمیەكەكـــــــــــانو ناتەبایی یەكانی خەبات لە یەك دژایەتی دا ، جیاوازی پەیدا دەبێ • ئـــەو جووڵانەوەی كە بەرەوپێش چووبێ ، لە حاڵی بەرەوپێش چوون دا ، كاتێـــــك بەدی دێ كە جێ بەجێ كردنی زنجیرەیەك لە دژەكان لە یەك جەرەیان دا ، ئەو جەرەیانە لە پلەیەكەوە بەرەو پلەیەكی تر دەباتە بەرەوە • ئەم بەرەوپێـــــش چوونە ، پلەبەپلە دەچێتە پێشەوەو تازە لە جێگای كۆنە دادەنیشێ و بـــــە سەی دا زاڵ دەبێ • بۆ تێگەیشتن پێویستە ئێمە دژایەتی بنەڕەتی لە هەر جەرەیان و لە هەرپلەیەك دا و هەروەها بەو شتەی كە هێزی بنەڕەتی بــــۆ چارەسەركردنی دژایەتی بنیاتی و بەرەوپێش بردنی جەرەیان بـــــــەرەو پلەیەكی تر دانراوە ، بزانین • گەشەكردنی بەرەوپێش چوو ، تەنیا دەتوانێ بە لابردنی كۆنە بەهۆی تازەوە ، نەك بە راگرتنی ،دڕێژە پەیدا بكـــــاو بڕوا • (١)

لە شی كردنەوەی دژەكان و لە شەڕی كۆنەو نوێ دا ، ئەم گومانە پەیــدا دەبێ كە كاتێك دووژلە بەرەبەرەكانی و ململانی دان و لە ئاكـــــام دا شتێكی نوێ كە نەك كۆنە بەڵكوو بەتەواوی تازەیە ، پەیدا دەبێ • واتـــــا

---

(١)ــ كونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٢٢ــ ١٢١

زنجیرەی ( تز ،ئانتی تز ، سەنتز = دانراو ، لە بەرامبەر دانراو و ئاکامی ئەو دووە ) کە بە وتەیەکی تر پێی دەڵێن " ترپاد " پێویستە گشت گەشـــــە ـ کردنەکان لەم چوار رچێوەدا تێپەڕ بن . بەڵام لینین لەم بۆچوونە رەخنـــەی گرتووە دەڵێ : ئەوە کە بۆ نموونە هەمیشە چەند دیاردە هاترونەتە کایەوە کە ئەو سێ بارەیان تێدابۆ ، پاشماوەی بیروباوەڕی هیگەو ئەنگلس لەسەر ئەو باوەڕە نیە . گەشەکردنی باری کۆمەڵایەتی بەشێوەی جەرەیانێکی سروشتـــی مێژوویی گەشەکردن ، لەبەرچاو گیراوە .

ئەوەی کە مارکس و ئەنگلس ناویان ناوەتە شێوەی دیالکتیکی ، شتێـــك زۆرتر یان کەمتر لە شێوەی زاستی کۆمەڵناسی کە تێ روانینی کۆمـــەڵ وەك چوارچێوەی لەشێکی زیندوو کە هەمیشە لە حالی بەرەوپێش چـــــوون و گەشەکردن دایە ، نیە کە لێکۆڵینەوەی بریتی بێ لە شیکردنەوەیەك لـــە پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان و دروستکەری کۆمەڵێکی ( فراماسیـــون ) کۆمەڵایەتی دیاری کرێ و لێکۆڵینەوە لە هۆیەکانی کارکردن و گەشەکردنی ئەو بە پێویست دادەنێ .

لە سۆڤیەتی پێش شۆڕشی ئوکتوبردا بلشویکەکان بەم بۆیە دەیان وت : پێش گەیشتن بە سوسیالیزم ، پێویستە لەپێشدا سەرمایەداری ، بگاتـــە ئەوپەڕی سنووری خۆی ، ئینجا سوسیالیزم بەرپابێ . لینین ئەمـــەی رەت کردەوەو بەکردەوەش لە شۆڕشی ئوکتوبردا ئەمەی سەلماند . ( ١ ) کەوابـــوو ترپاد شتێکی گشتی و بێ ئەملا و ئەولا نیەو دەکرێ بەسەر پلەیەکیـــاندا تێپەڕ ببین .

## ئاکامـــی بەرهەمـی دژایەتییـەکـان :

یەك بوونی دژەکان لە یەك دژدا بەهۆی پێوەندییەکی دیاریکراو لـــە سەرەوەی پەست تریان زاڵ بوون ، لەنێوان دژەکان دا ،دیاری دەکـــرێ . بۆ نموونە لە یەك بوونێکی فیزیکی دا ، راکێشان و پاڵ پێوەنانی چەنـــد عونسوری دیاریکراو لەم یان لەو ، دەگونجێ لە پێوەندی لەگەڵ غەیـــری

---

( ١ ) ـ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ٩٩ ـ ٩٨

ئەوان دا ، زاڵ بێ • یەك بوون وایە کە لایەنێك بەسەر لایەنێکی تردا ، زاڵە یان لە چەند جێگای دیاریکراودا دەتوانن وەك یەك بن •
هەر حاڵەتێکی چۆنی بریتی یە لە یەك جەرمیان ، کە پێوەندی زاڵ بوونی دیاریکراو ،دەگرێتەوە • بەم شێوە حاڵەتەکانی وشکی ( جەمود ) شل بوونەوە ( میعان ) و گازی جەستەکان ، بەسەر پێوەندییە زاڵ بوە جۆرا وجۆرەکان لە یەك بوونی راکێشان و پاڵ پێوەنانێك کە تایبەتمەندی " ملوکولە " کانە ،ئەو جیسمەیە دەگرێتەوە • هەروەها لە کێشە و دژەکانی کۆمەڵی سەرمایەداری ، عونسوری خاوەن مڵکایەتی تایبەتی لە پێوەندی نەگەڵ دژەکەی خۆی واتا بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتی ، دەورێکی زاڵ دەگێرێ و چینی سەرمایەدار زاڵە بەسەر چینی کرێکاردا • ئەگەر ئەم پێوەندی زاڵ بوونە پێچەوانە ببێتەوە ، لەو کاتەدا ئەمە نیشانەی گۆڕانێکی چۆنی یە ، کۆتایی هاتنی باری سەرمایەداری کۆمەڵ ؛ دەس پێ کردنی حاڵەتی تازەیە • ئەم پێوەندییانە لەبەر نێوەرۆکیان ،دەوری هەمیشەییان نیەو مەیلیان بە ئاڵ وگۆڕە ؛تەنانەت ئەگەر لە هێندێك بواردا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ، بێ گۆڕان بمێننەوە ، هەر هەمیشەیی نین • • • بۆ نموونە ئەگەر پارەئاسنێکی رەش بە رەنگ ، سووری بکەین و رەنگی سووری لێ بدەین ، ئەمە ئاڵ وگۆڕێکی دەرەوەیی یە ، بەڵام ئەگەر ئاسنەکە بەهۆی گەرماوە بتوێنینەوە ، ئەمە ئەبێتە گۆڕانی چۆنی • • • ئاسن لە حاڵەتی وشکی بە حاڵەتی شلەمەنی و تەڕی دەگا • شل بوونەوە ( میعان ) تایبەتمەندی دەروونی و یاساکانی جم وجۆڵی بەشێوازێکی دیاریکراو ، جۆرا وجۆر ئەبێ ، لەودا ئاڵ وگۆڕێکی چۆنی پەیدا دەبێ • گۆڕانی چۆنی هەڵبژێرد راوی گۆڕانێکە لە هاوکێشی دژەکانەوەیە • ئەم گۆڕانە بەهۆی زنجیرە ئاڵ وگۆڕێکی چەندی کە شوێن لەسەر پێوەندی زاڵ بوون لە یەك بوونی دژەکان ، دادەنێن ، ئامادە دەبێ • کاتێك کە پێوەندی زاڵ بوون تاڵ وگۆڕی بەسەر دادێ ، گۆڕانی چەندی ، ئەبێتە گۆڕانی چلۆنی •
ئەوکات کە گۆڕانێکی ئاوەها بنەڕەتی یان چۆنی لە ئاکامی هەڵوەشاندنەوەی شێوازێکی کۆنەی یەك بوونی دژەکان و پێك هاتنی شێوازێکی تازە ، پەیدا بوو ،لەوبارەدا ،خودی دژەکان دەگۆڕدرێن و لایەنی ترمن هەروایە کە لەبارێکی زاڵ بەرەو بارێکی تێشکاو ،دەگۆڕدرێ•

لێرەدا لە بارێکی چۆنی تازە، هەر ئەو دژە کۆنانە، لە پێوەندی‌یەکـــــی
ئاڵ وگۆڕەسەردا هاتوو، لەئارادانین .بەڵکوو چونکە پێوەندی‌یەکە گـــۆڕاوە
ئەو دژانەش کە لەو پێوەندی‌یەدا پێکەوە بەسترابوونەوە، ئاڵ وگۆڕیـــــان
بەسەرداد ێ ·
یەک یەک بوونی دژە تازەکان، یەک، دی تازە بەوجـــــــــــود
دێنێ ··· (١)

## هۆیە دەرەوەیی و دەروونی‌یەکانـی گۆڕانی چۆنی ·

تا چ ئەندازە تێپەڕبوون لە گۆڕانی چەندی بۆچۆنی بەهۆی چارەسەر ــ
کردنی دژە زاتی‌یەکان لەخودی پرۆسەدا یان بە کەڵک وەرگرتن لە هۆیـــە
دەروونی‌یەکان، دیاری دەکرێ و چ ئەندازە بە کەڵک وەرگرتن لە هۆیـــە
دەرەوەیی‌یەکان و لاوەکی و دژخایەن و نەگەوهەری، دیاری دەکـــرێ؟
وەڵام ئەوەیە کە بەهۆی هەردووکیان، بەڵام لەرێگای جۆراوجۆرەوە دیـــاری
دەکرێ · هەم لە سروشت و هەم لە کۆمەڵ دا، دیاردە جۆراوجۆرەکـــان
هەمیشە لەسەریەک کار دەکەن و شوێن لەسەر یەکتر دادەنێن · هەرچیـــە
هۆیە دەرەوەیی‌یەکان، پێویستە هەمیشە لەو ئاڵ وگۆڕانەدا کە لــــــە
دیاردەکان دا پێک دێن، دەورێکیان هەبێ · لە هەمان کات دا تایبـــە ــ
تمەندی ئاڵ وگۆڕەکان، هەمیشە پێوەندی هەیە بە هۆیە دەروونی‌یەکانـەوە ·
بۆ نموونە ڕووداوێک وەک دروست بوونی جوجەڵە لە هێلکە لەبـــــــاری
لایەنەکەیەوە ئاکامە دوایی‌یەکەی بەهۆی دژایەتی زاتی لە کۆمەڵــــــی
سەرمایەداری دا دیاری دەکرێن · (٢) بۆباشترفێربوونی باسەکانی دوایی،
شەڕی کۆنەو نوێ و ئەو پلانەی تێپەڕی دەکەن، بە کورتی ئەخەینە بـــــەر
باس (٣) پلەکانی ئەم کێشە چوارن ١٠ ـ فریشک بەستنی بێ‌ناو و لــــە
دایک بوونی پڕ هەرا، لەو بێ‌ناوی‌یەدا، لە چاڵە ڕەشەکانی مێـــژووەوە،

---

(١) ـ کونفورت، پێشوو، لاپەڕە ١٢٤ ـ ١٢٢
(٢) ـ کونفورت پێشوو، لاپەڕە ١٢٥ ـ ١٢٤
(٣) ـ تازە واتا عونسوری تازە پەیدابوو، چلۆنی‌یەکی تازە لـــە ـــە

سەر هەڵدێنێ • لەگەڵ ڕاگەیاندنی کێشە لەگەڵ کۆنەدا ، لەدایک بوونی خوی ڕادەگەیەنێ •

۲ ـ سەرهەڵدانی بەرەبەرەی تازەو دەس پێکردنی شەڕ لەگەڵ کۆن دا لە حاڵەتی زاڵ بوونی هێزی کۆن • کۆنە لەو کێشەدا ، هۆیە سازگارەکانی بەڕێـوە دەسەڵاتدایە • وەك داب و نەریت ، ئەزموون ، خاوەن پایـەی دەسەڵاتداریەتی و ئەوەی کە پێوانەی کاری پرنەبوەو دەوری هەر مـاوە • دژی تازەش چەند هۆلە ئارادایە کەم بوونی داب و نەریت ، کەم بوونـی ئەزموون ، ئەوەی کە خاوەنی پێگەی گرنگی کێشە نیە ، لە دەوری خـۆی ئاگادار نیەو جێی خۆی نەکردوەتەوە • ئەم ماوەیە ماوەی ڕۆژەرەشی کێشـەی کۆنەو نوێیە ، چونکە کاتی شکستە خوێنا وییەکانی تازە ، دەوری ڕاپەڕینـی بەرەوەدواو کۆنەپەرستانەو زاڵ بوونی کۆنە • لەم دەورە دا تازە بـە تەڵەك وەرگرتن لە ڕامیاری بڕلە حەماسەو خوێن ، دڕاندن و ڕاماڵینی عادەت ، بڕین ، گیان فیداکردن وقارەمانی تواندنی سەرسوڕهێنەر ، نیازی هەیـە ، تا وردەوردە ، ڕەخنە بکاتە دیواری کۆن و سروسیاڵی تێکەوە پێچـێ و کەسایەتی خۆی بسەلمێنێ • ئەم دەورانە ، یەك لە دەورەکانی مەترسـی هێنەری کێشەیە و وەك ڕەسمە تازە لە کۆمەڵ دا خوازیاری پشتیوانانی دلێر و ورد بین و نەترس وقارەمانە • لەم دەورانەدا کۆنە لە سەرەتاوە بە هـارت و پۆرت و دادو فەریادی خۆپەسندانەوە ، پاشان بە فەریادی دڕندانـەو پاشان بە هاوار و ناڵەناڵەوە تێکەڵ لەگەڵ ترس و دڕندەیی دا ، دێتـە مەیدان و بناوی نەزمو هێمنی مەوجوود ، جۆگەلەی خوێن وەڕێ دەخا •

۳ ـ کێشەی کۆنەو نوێ لە بیاری یەکسانی هێزەکانیان دا • نوێ لـە خەباتەکان و تێك شکانە خوێنا وییەکان دا ، دەرس وەرد ەگرێ ، داب ونەریت و ئەزموون وەدەس دێنێ ، لە نەخشی خۆی ، ئاگادار دەبێ ، کەسایەتی پەیدا دەکا ، پێگەو جێگای جۆراوجۆر وەچنگی دەکەوێ ، دەورانی کێشـە و

---

جەرمیانی گەشەکردنی کۆن دا • هەر تازەیەك کە لە زنجیـرەی کـاتدا خۆ بنوێنێ ، تازە نیە • تازە ئەوەیە لەسەرهەڵدانی دوایی دا ، وردەوردە ، جێگای خۆی پتر دەکاتەوە • نووسراوە فەلسەفی و کۆمەلایەتییەکانی احسان طبری ، پێشوو ، لاپەڕی ۲۷ •

دژواڕەکان، جێگای خۆیان بە سازان دەدەن و دەورەکانی هاوکێشی و ئاگرەس و شەڕنەکردنی کاتی و ناسەقامگیر دێتە پێش. دەورەکانی هاوکێشی هێزەکان و شەڕی شاراوەو نهێنی هەردووکیان هەرکامە بۆ ئامانجی خۆی، سەرهەڵدەدا. نوێ بۆ تەفروتوونا کردنی کۆن و کۆنیش بۆ لەنێبردنی تازە. ئەم دەورەیە، دەورەی هەرە بەرزی رامیاری بازنەیە.

٤ـ کێشەی نوێ و کۆنە لەگەڵ زاڵ بوونی نوێ بەسەر کۆنەدا، نوێ جێگاو پێگەکانی خۆی پتەودەکا، داب و نەریت و ئەزموونی فرە، فێرد مبێ، کۆنە دەوری کۆمەڵایەتی خۆی کۆتایی پێدێ و پێگەکانی خۆی لە دەست دەدا. ئەم دەورانە، دۆخی ئاڵوگۆڕو راپەرینی چلونی یە تازە دەبێتە جێگری کۆنە، هاوسەنگی و سازانەکان، تێک دەچن و شەڕەکە بەزاڵ بوونی نوێ بەسەر کۆنەدا، کۆتایی پێدێ و تازە بە جموجۆڵی سەرکەوتوانە، مەیدانی تێکۆشانی کۆنە، داگیر دەکا. (١) دژەکان هەم تایبەتن و هەم گشتی، گشتی بوونی دژواتایەکی دوورالەی هەیە، یەکەم ئەوە کە دژەکان لە جەرەیانی گەشەکردنی هەموو دیاردەکان داهەن، دووەم ئەوە جموجۆڵی دژەکان لە سەرەتاوە تا کۆتایی پێهاتنی جەرەیانی گەشەکردنی هەر دیاردەیەك، ئەبیندرێ.

بەوتەی ئەنگلس جموجۆڵ بۆخۆی دژایەتی یەکە. لینین پێی وایە یاسای یەك بوونی دژەکان بریتی یە لە، دۆزینەوەی مەیلە دژیەکەکان، راکێشەری یەکترو دوژمنی یەکتر لە دیاردەو جەرەیانەکانی سروشتدا لەوانە روح و کۆمەڵ... بێ دژایەتی جیهانێك لە ئارادا نیە، بناخەی شێوازەکانی جموجۆڵەو هەروەها بناخەی جموجۆڵی گڕێ وگۆلداره. بەوتەی ئەنگلس گشتی بوونی دژایەتی ئاوایە، کاتێك جموجۆڵی میکانیکی ساکار، دژایەتی تێدابێ، بە شێوەیەکی واتر لە شێوازە بەرزترەکانی جموجۆڵی ماددەدا بە تایبەت ژیانی گیاوگیان لەبەران وگەشەکردنی داهەیە... ژیان ئەوەیکە هەر مەوجوودیك لە چرکەیەك دا خۆی و شتێکی ترە. بە نەمانی دژایەتی (وەك وتمان) ژیانیش کۆتایی پێدێ. (٢)

---

(١) ـ نووسراوەفەلسەفی وکۆمەڵایەتی یەکانی احسان طبری، ل ٢٨ ـ ٢٧

(٢) ـ چوار ریسالەی فەلسەفی، تسەدون، لاپەڕی ٥٠ ـ ٤٦

دژەکان تایبەتن . لەهەر شێوازێکی جموجۆڵی مادەدا تایبەتمەندی خۆی هەیە . بەبڕوای ماتریالیستەکان لە جیهاندا هیچ شتێك بێجگە لە مادەی خاوەن جموجۆڵ ، لە ئارادانیەو پێویستە جموجۆڵی ئەم مادە ، هەمیشە چەند شێوازی دیاریکراوی هەبێ . پێویستە سەرنجی تایبەتمەندی ئەم شێوازەی جموجۆڵی مادە بدەین ... هەرشێوە جموجۆڵ و هەڵگر و وەبەرگری دژە تایبەتی یەکانی خۆیەتی کە ناوەرۆکی تایبەتی ئەو دیاردەیە ، ئەخولقێنن . ئەمە هۆی دەروونی یان بناخەی جۆرا وجۆربوونی بێ سنوور و بێ سەرەنجامی شتەکان و دیاردەکان لە جیهاندایە . ناوەرۆکی تایبەتی هەرکامە لە جموجۆڵی مادە بەهۆی دژە تایبەتی یە زاتی یەکانی ئەم شێوازانەی جموجۆڵ دیاری دەکرێ . ( ۱ )

ماتۆتسەدون لەم پێوەندی یەدا پێی وایە ، ناسینی مرۆڤ هەمیشە لە ڕێگای ئاگاداربوون لە شتەکان و دیاردە تایبەتی یەکانەوە ، بەرەبەرە ، لە شت و دیاردە گشتی یەکان ئاگادار دەبێ . مرۆڤ پاش ئەوەی ناوەرۆکی تایبەتی دیاردە جۆرا وجۆرە فراوانەکانی ناسی ، دەتوانێ بەرەوگشتی کردن بڕوا و لە ناوەرۆکی هاوبەش و گشتی شتەکان و دیاردەکان ، ئاگاداربێ ، لە ناسینی ئەم ناوەرۆکە گشتی یە دایە کە مرۆڤ ئەمە دەکاتە ڕێنوێنی خۆی و دەس دەکا بە لێکۆڵینەوەی دیاردە تایبەتی و جۆرا وجۆرەکان ، ئەوانەی کە تا ئێستا لێیان نەکۆڵدراوەتەوە یان بەئەندازەی پێویست شی نەکراونەتەوە . ئەوکات ناوەرۆکی تایبەتی یان پەیدا دەکا . تەنیا لەم بارەدایە کە دەکرێ ناسینی ناوەرۆکی هاوبەشی شت و دیاردەکان ، تەواو بکاو بەرەوپێشی بەرێ و بەرفراوانی بکاو لە وەستانی و مەرگی ئەم ناسینە پێشگیری بکا و نەهێڵێ بمرێ . کەوابوو جەرەیانی ناسین بریتی یە لە : ۱ـ جموجۆڵ لە تایبەتەوە بەرەو گشتی ۲ـ جموجۆڵ لە گشتی یەوە بەرەو تایبەت . ( ۲ )

سەبارەت بەتایبەتمەندی تایبەتی دژ دوو خاڵی تر هەن کە پێویستی یان بە شی کردنەوەیە ، یەکەم دژی گرنگ و گەورە دووەم ـ لایەنی گەورەی دژ . لە دژە زۆرەکانی هەرجەرەیانێك دا یەکیان گەورەو بەرچاوە ، سەرهەڵدان و

---

( ۱ ) ـ چوار ڕیسالەی فەلسەفی ، تسەدون ، لاپەڕی ٥٥ ـ ٥٤
( ۲ ) ـ هەرئەم سەرچاوە ، ٥٨ ـ ٥٧

بوونەکەی ؛ سەرهەڵدان بوونی دژەکانی تر دیاری دەکا و شوێن لەبەریان دادەنێ . ( ۱ )

وەك باس کرا دژایەتی هۆی گۆڕانەکانە . ئەم گۆڕانانە ، بە لێکۆڵینەوەی رووەیی لە دیاردەکان ناژانرێن و پێویستە بە ئامرازی زانستی و تی کردنەوەی قووڵ بچینە مەیدانی ناسینیانەوە . جاری وایە ئەم گۆڕانە بەرەبەرە نیەولەنەکاو ئاڵ وگۆڕ لە دیاردەکان دا ، دێتە ئێش با بزانین چۆن و لە چ بارێك دا وایە ؟

## لەنەکاو و پلە بە پلە بوونی گۆڕانی چۆنی .

لەبەرئەوە گۆڕانی چۆنی ئاکام و بەرهەمی چارەسەرکردنی دژەکانە کەوابوو دەکرێ گشت جەرەیانی خەباتی دژەکان وەك یەك جەرەیانی لەجێگا دانرانی چۆنیەتی یەك بە کۆمەڵ وەرگرتن لەوی تر ، چۆنیەتی یەکی کۆن بەهۆی چۆنیەتی یەکی تازەوە ؛ ببیندرێ . چۆنیەتی کۆن ، زاڵ بوون بەسەر عونسورێك لە یەکیەتی دژەکان ؛ دەگرێتەوە . بەرئاوەژووبوونی ئەم زاڵ بوونە ، ئەبێتە هۆی لەجێدانانی کۆن بەهۆی نوێوە . بەم واتایە کە هەرعونسورێك لە یەکیەتی یەکی دژەکان دا ، خاوەنی تایبەتمەندی یەکی دیاری کراوە . شەری یەکێك بۆ راگرتنی زاڵ بوونەکەی ، شتێکە کە چۆنیەتی کۆنەکە ، رادەگرێ . خەبات و ململانێ ئەوی تر بۆ بەرئاوەژووکردنی ئەم زاڵ بوونە ، شتێکە کە چۆنیەتی یەکی تازەکە دەبێتە جێگری جێنشینایەتی کۆن ، لە دایك دەبێ .

بۆ نموونە گشت ژیان بریتی یە لە یەکیەتی یەکی تازەی دژەکان ، جەرەیانەکانی دروست بوون و لێك جیابوون ( تجزیە ) ی مادەی زیندووە ، تا ئەوکات دروست بوون و خولقاندن خۆی لەم یەکیەتی یە دا رادەگرێ ، ژیان دەمێنێتەوە ، بەڵام ئەوکات کە دژی ئەو دەستی بە زاڵ بوون کرد ،لەوکاتەدا ، مەرگ دەس پێ دەکا .

هەربەو جۆرە ئەگەر تەماشای دژایەتی یەکانی کۆمەڵی سەرمایەداری

---

( ۱ ) ــ چوار ریسالە . . . پێشوو ، لاپەڕی ۹۷

بکەین ، دەردەکەوێ کە حاڵەتی سەرمایەداری کۆمەڵ پاڵی داوە بە زاڵ بوونی خاوەن مڵکایەتی تایبەتی لەسەر بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی و زاڵ بوونی چینی سەرمایەدار ، بەسەر چینی کرێکاردا · ئەمە خەباتی چینی کرێکار دژی چینی سەرمایەدارەو خەبات بۆ ئازاد کردنی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی لە زنجیری مڵکداری تایبەتی یە · کە ئەوکات حاڵەتی کۆن بەرەوژوور دەچێ ، بارێکی سۆسیالیستی تازە بەدی دێ ·

جووجەڵە لەنێو پێستەکەی دا گەشە ناکا ، مەگەر ئەوە لەدەرەوە گەرمای پێ بگا · ئەوەی لە هێلکەدا بەرەوپێش ئەچێ ؛ئەو شتەی دێتە دەرەوە ، پێوەندی بەو شتەوە هەیە کە لەنێو هێلکەکەدا یە ( هێلکەیەك لە گەرمایەکی لەباردا ،دەبێتە جووجەڵە ، بەڵام هیچ گەرمایەك ناتوانێ بەرد بکاتە جووجەڵە ،چونکە لە بناخەدا جیاوازن ) هەرەوجۆرە لە کۆمەڵدا، شۆرشێك بێ دەمرتێ وەردانی هۆیە دەرەوەیی یەکان : ناکەوێتە حەرمیان · بەڵام تایبەتمەندی و ئاکامەکەی و لەراستی دا ئەوە کە بەدی دێ ، پالی بە بناخەی هۆیە دەروونی یەکانەوە داوەتەوە ·

شەڕی ئیمپریالیستی وەك هۆی دەرەوەیی و دژایەتی یەکانی دەروونی کۆمەڵی سوڤیەت ،بوون بەهۆی پێك هاتنی شۆڕشی ئوکتۆبەری ١٩١٧ ی زایینی ·

بەگشتی ئەگەر ئاڵوگۆڕە چۆنی یەکان لەبەرچاو بگرین ، دەبینین کە تایبەتمەندی چۆنیان تەنیا بەهۆی کارکردنەکانی هێزە دەروونی یەکان ، دەتواند ڕێ شی بکرێتەوە · دژایەتی یە تایبەتی یەکان کە چۆنیەتی کۆن لەسەر ئەوان دانراوەو پاڵی پێوانەوە داوە ، دیاری دەکا کە چ چۆنیەتی تازەیەك ، ئاشکرا دەبێ · هۆیە دەرەوەیی یەکان ، تەنیا دەبنە هۆی ئاڵ و گۆڕە چەندی یەکانی شتەکان ( ئات و شێپێنی دەس پێ کردنیان و ئاهەنگی جەرەیانەکانیان ) ·

هۆیە رووتە دەرەوەیی یەکان تەنیا ئەتوانن سەرکێشنە لای ئەو ئاڵوگۆڕانە لە ئەندازەو چەندی دا ، بەڵام ناتوانن شی بکەنەوە کە بۆچی دیاردەکان لە هەزارو یەك لایەنەوە ، لەگەڵ یەکتر جیاوازن ، بۆچی

جێگایان بە یەکتر دەدەن و جێ دەگۆڕنەوە؟ (١)
بەم شێوە بۆ نموونە خەباتی چینایەتی لەکۆمەڵی سەرمایەداری دا ، دەتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لە هێندێك هۆی دەرەوەی تایبەتی ، توند یان شل بێت . بەڵام بوونی ئەو خەباتە دژەدان بەو خەباتە (پێوەندی بەو هۆیە دەرەوەیەکانەوە هەیە) . ئەو دژایەتییانەی کە لەباری چۆنییەوە جیاوازن ، تەنیا دەتوانن بەو شێوانەی کە بە جۆری چۆنی جیاوازن ، چارەسەر ببن . بۆ نموونە کێشەی کرێکاران و سەرمایەداران بە شێوەی شۆڕشی سۆسیالیستی چارەسەر دەکرێ . دژایەتی نێوان کۆمەڵانی خەڵك و دەرەبەگایەتی بەشێوەی شۆڕشی دێموکراتیك چارەسەر دەکرێ . دژایەتی نێوان " مستعمرات " و ئیمپریالیسم بەشێوەی شەڕی شۆڕشگێڕانەی نەتەوایەتی ، چارەسەر دەکرێ . دژایەتی نێوان چینی کرێکار و جووتیار لە کۆمەڵگای سۆسیالیستی دا ، بەشێوەی گشتی کردن و مکانیزە کردنی کشت و کاڵ ، چارەسەر دەکرێ . کێشە لەنێوان حیزبی کۆمۆنیست دا بەشێوەی بەرەوپێش چوونی هێزە بەرهەمهێنەرەکان ، چارەسەر دەکرێ . (٢)
ئەو شێوەیە کە بەهۆی ئەوەوە ، دژایەتییە جۆراوجۆرەکان چارەسەر دەکرێن ، هەرجۆرێك بێ هەمیشە دەگاتە خاڵێك کە لایەنی چەندیی خەباتی دژەکان لە دەروونی دژایەتی دا ، بە ئەندازەی پێویست بۆ سەرهەڵدانی چۆنیەتی تازە ، شیاوی بووبێ . ئەمە خاڵ و کەوشەنێکە کە گۆڕانی لەوێ دا دەست پێ دەکا . چۆنیەتی دژەدانی بەتەواوی بە تایبەتمەندی تایبەتی دژایەتییەکەوە پێوەندی هەیە کە ئەم ، ئاکامی ئەوە بەشێوەیەکی تایبەتی کە خەباتی دژەکان دژە پەیدا بکا .
ئاڵوگۆڕی چۆنی هەمیشە لەنەکاوەوە بێجگە لەوە ناتوانێ شتێکی تر بێ . بەم واتایە نە خاڵێکی دیاریکراودا لە ئاڵوگۆڕی چەندی ، چۆنی یەکی تازە کە لەپێش دا نەبوە ، خۆ دەنوێنێ . واتا لەم پلەدا شتێکی تازە دەست پێ دەکا کە خۆی نیشان بدا . چەند هۆی تازە ئەکەونە کار و چەند خاوەن هۆیان هۆوەرگر و ئەنجام ( معلول ) دێنە مەیدان . چەند

---

(١) ــ مائۆتسەدون ، کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٢٦ ــ ١٢٥
(٢) ــ مائۆتسەدون ، پێشوو ، واتا باس لەسەر دژایەتی .

یاسای جموجۆڵێکی تازە ، دێتە باری کردەوەوە • ئەم بەنا و راپەرینــــە ، چۆنیە ، سەرەتای خوێندنی شتێکی تازەیە کە لەپێش دانەبۆە • بەم جــۆرە ئاڵ وگۆڕی چۆنی بەدوای جەرمیانێکی چارەسەکردن واتا خوێندنـــــی چۆنیەتی یەکی تازە ، دێتە کایەوە • لەماوەی ئەم جەرمیانەدا،دژایەتی یەکـان بەشێوەی بەناوناد یاری ( بێ خوێنیشان دان لە ئاڵ وگۆڕی چۆنـــی دا ) چارەسەر دەبن • ( ۱ )

لە کولانی ئاودا و لەدایك بوونی مندال دا ،ئەو بارە دەبیند رێ و لــە یەك خاڵ دا ئاو دێتە کوڵ و ئەمیش لەدایك دەبێ • هەروەها لــــە کۆمەڵ دا لەنێو چینەکان دا جموجۆڵ بەدی دی ،بەرەورووبوونەکان تونــد دەبن ، بیروباوەڕەکان پوختە دەبن و پێ دەگەن و لەمەکاو ئاڵ وگـــــۆڕی شۆڕشگێرانەی چارەنووس دیاری کەر ، دەس پێ دەکا • دیارە هەڵ ومــــەرج و نێوەرۆکی جەرمیانێك کە ئەو ئاڵ وگۆڕەی تێدا بەدی دێ ( هاتنی تازە لــە جێگای کۆن دا ) لێرەدا دەوریان هەیە •

لە هێند ێك شۆڕشی چینایەتی و گەشەکردنی کۆمەڵ دا ،جاری وابـــوو دەس بەجێ ، تازە خۆی نواند ەو کۆنەی وەلاناوەو لە گشت ئۆرگانەکانـــی حکومەت و دەسەلاتی کۆن دا ، نەرمانی تازەی بەد ەستەوە گرتووە جـــاری وایش بۆە ، هێواش هێواش و لە ماوەی دەیان ساڵ دا ،ئەو کــــارە روزی داوە • وەك هاتنی سیستەمی سەرمایەداری لەجێگای سیستەمی فئودالـی و دەرەبەگایەتی • هەروەها ئاڵ وگۆڕی ئابووریش جموجۆڵی توند نیەو پلە بــە پلە دەچێتە پێش • ئەم نموونانە نیشان دەدەن کە لە ئاڵ وگۆڕی چۆنـــی دا، لایەنێکی چەندی هەیە • واتا هەنگاو بەهەنگاو و بەپلە ریشتێك هەن کە لەوان دا ئاڵ وگۆڕی چەندی خۆ نەوا و دەکا • ماتریالیسم دیالێکتیك گشت ئاڵ وگـــۆڕە چۆنی یەکان بە " دەس بەجێ " دادەنێ ( ۲ )

## ساتمایی و تەبایی لە دژایەتی یەکان دا •

---

( ۱ ) ــ کونفورت ،لاپەڕی ۱۲۸ ــ ۱۲۵ ( ۲ ) ــ بۆئاڵ وگۆڕی لەمەکاو لــە چەندیەوە بۆچۆنی ،اصول مقد ماتی فلسفە، ژۆرژپلیستزەل ۱۸۷ ــ ۱۸۶ تە ــ ماشا بکەن •

چارەسەرکردنی دژایەتی یەکان ، هەمیشە کێشەو زاڵ بوونی لایەنێـــك بەسەر لایەنێکی تردا ،دەگرێتەبەر · بەڵام ئەم شتە ناتوانێ بەپێی نێوەرۆکـــی دژ،بە چەند جۆر ئەنجام بدرێ • یەکەم ئەو دژایەتی یانەی کە بەشێوەی زۆر زاڵ بوونی لایەنێك بەسەر ئەوی‌تردا ، چارەسەر دەکرێ · دووەم ئەوانەی کە بۆ چارەسەرکردنیان ، بەم شێوانە نیازمان هەیە · بە قسەی سوسیالیستەکان رووخانی سیستەمی سەرمایەداری بەهۆی کرێکارەوە نیازی بەزۆرو زاڵ بـــوون هەیە · بەڵام لە سوسیالیسمەوە بۆ کومونیسم ،بەو شتە نیازمان نیە · واتا ئـەو ناتەبـایی یە ( تناقض ) لە ئارادانیە · بەگشتی دژایەتی یەکۆمەڵایەتی یەکان کاتێك یەکتر ناگرنەوەو ناتەبان ( متناقض )ن کە بەرەوروو‌بوونی ئابووری‌یـان تێدا هەبێ · لێرەدا تاقمێك قازانجی خۆیان بەزۆر دادەسەپێنـــــن و گرۆیەکی تر بە ملهوری ئەوکارە دەکەن · لە نەبوونی ئەم بارەدا " تناقـض" نابێ ، کەوابوو نیازێك بە ملهوڕی و زۆر نیە · ئەوکات کە ناتەبایی یــــــە چینایەتی یەکان لە سوسیالیسمدا ،نەمان ،گشت مسئلە کۆمەڵایەتی یەکان بە هۆی وت وو‌ێژو رەخنەگرتن و رەخنە لەخۆگرتن و دنەدان و رازی کردن و بە یەك گەیشتن ، چارەسەردەکرێن · کەوابوو ناتەبایی بەواتای دژایەتی نیە · ئەری دژەکان تایبەتمەندی یەکی جیهان ،بەرگری هەیەو جیهانی یـــــە و پێپسنی هەر دژایەتی یەکە ·

لینین دەڵێ : لە سوسیالیزم دا " تناقض " لادەچێ و دژایەتـــی دەمێنێتەوە ( ۱ ) ناتەبایی یەکێك لە شەری دوو دژەکانەو جیهانی‌نیە ( ۲ ) جیاوازی ناتەبایی و تەبابوونی دژایەتی یەکان لە کۆمەڵ دا گرنگی یەکـــــی گەورەی هەیە · زۆر دژایەتی لەکۆمەڵ دا هەن و لەباری کردەوەشــــــەوە گرنگن · پێویستە تێ بگەین کامەیان " تناقض "ەوکامەیان نیە ،تا شێـــوەی بەرەوروو‌بوون لەگەڵیان دا پەیدابکەین · ئەگەر جۆرە دژایەتی یەك لەگـــەڵ جۆرێکی تر ،لێمان تێکەڵ بێ ، لەوکاتەدا ، کردەوەی هەڵەمان دەبێ وناکامی خوازراو بەدەس نایە ( ۳ ) بە بروای مائۆتسەدۆن یاسای ناتەبایی لـــــە

---

( ۱ ) ــ یادداشتە رەخنەگرانەکان ، نووسراوی بوخارین
( ۲ ) ــ مائۆتسەدون ، سەرچاوەی پێشوو
( ۳ ) ــ کونفورت ، پێشوو ، لاپەری ۱۳۲ ــ ۱۳۰

دیاردەکان دا ، بریتی یە لە یاسای یەك بوونی دژەکان . لنین دەڵێ : دیالکتیك بەواتای وردی وشە بریتی یە لە لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی " تناقض " واتا ناتەبایی لە دەروونی شتەکان . یاسای ناتەبایی گەوهەری دیالکتیك یان کورتەو پوختەیەتی . هراکلیت ئەم یاسایەی بنیات نا . ئەو وتی کێشەی مادە وا لەبەرەوپێش چوون دا . هیگل تەوازی کرد و وتی ، دژایەتی هەر مسلمیەك دەباتە پێشەوە . ( ١ )

## جموجۆڵ بەرەو گەشەکردن .

لە زۆربەی جەرەیانەکان دا ، چارەسەرکردنیان ، سەرئەکێشێتە لای جموجۆڵی خاوەن لایەن یان بەرەوپێش چوو لەودا هەروەك ئەنگلس دەڵێ ، سەرەرای رووداوە رواڵەتی یەکان و پاشەکشەکاتی یەکان ، گەشەکردنێکی بەرەوپێش چوو ، لەد واکاتەکان دا ، خۆی نیشان دەدا . جەرەیان واتا بەرەوپێش چوون لە پلەیەکەوە بەرەو پلەیەکی تر ،دەچێتە پێشەوەو هەرکامیان خۆی بەرەوپێش چوونێکە بەرەوشتێکی تازە . . . بەڵام جەرەیانەکانی تر بەهۆی جموجونێکی ئاوەها بەرەوپێش چوو ، دیاری ناکرێن . بزوتی ئاوبەسەهۆڵ یان هەڵمو بە پێچەوانە ، جموجۆڵێکی خاوەن لایەن نیە . بەڵام جموجۆڵی کۆمەڵ وانیە ، چونکە گەشەکردنی کۆمەڵ خاوەن لایەن بوونی نیشان دەدا .

بەم پێیە بناخەی جەرەیانەکان یان بەرەوپێش چوونەکان ، هەروەها هۆیە دەروونی یەکانی جموجۆڵی گەشەکردن چیە ؟ وەڵام ئەوەیە کە دەبێ لە بوونی گردەوەی دژخایەنی دژایەتی یە بنەرەتی یەکانی ئەو جەرەیانانە کە بە هۆی یەك زنجیرە شێوازی تایبەتی ، چارەسەر دەکرێن ، بۆی بکەرێن .ئەمە شتێکە دەبێتە هۆی پەیدابوونی یەك زنجیرە پلەی خاوەن لایەن ، جەرەیانێکی بەرەوپێش چوونی دژخایەن لە لایەنێکەوە دیاری دەکرێ .

بەم جۆرە ئەگەر بەرەوپێش چوونی کۆمەڵایەتی خاوەنی لایەنێکە لەبەرئەوەیە کە مرۆڤ لە پێوەندی یەکی لەباری دژایەتی هەمیشەیی دا لەگەڵ سروشت ، ژیان بەسەردەبا . بوونی هەمیشەیی ئەم دژایەتی یە ئەبێتە هۆی

---

( ١ ) ــ دیالکتیك ،ماتریالیسم دیالکتیك،علی علمی ، پێشووئل ٥٠ ــ ٤٩

پەیدابوونی میلێکی هەمیشەیی مرۆڤ بە باشتربوونی هێزی بەرهەم هێنەر. هەربەوجۆرە کە ئەم میلە لە کاردایە، هەربەوجۆرە پلە بە پلە چەند دژایەتی لەنێوان هێزەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی و پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان، پەیدادەبن. لایەنی گۆڕانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ لەسەر ئاغایەتی ئەو بەسەر سروشتدا و جموجۆڵی کۆمەڵ، بە تەنیایی لەبەر هەلومەرجی سروشتی ژیانی مرۆڤ، هۆیەکانی ئاڵوگۆڕو گەشەکردن کە خەڵک بەهۆی پێویست بۆ دابینکردنی ساز ەکانیان هەستی پێدەکەن، ئەم لایەنە بەخێرە دەگرێ...

بەرەوپێش چوون لە دژایەتییە تایبەتییەکانی دیاردە تایبەتییەکان، سەرچاوە دەگرێ و دەڕوا، شتە تایبەتییەکان بەهۆی دژایەتی یە تایبەتییەکانەوە، دیاری دەکرێن کە لە ئاکامی ئەوانەدا جموجۆڵ یان لایەنێکی تایبەتی پەیدا دەکەن. (۱)

## دژایەتی نێوان کۆن و نوێ، رابردوو و داهاتوو.

لە کاتێکدا جموجۆڵێکی گەشەکردنی بەرەوپێش چوو، لەجەرەیانێکدا هەیە ئەو حاڵەدا پلەبەپلە تێپەڕبوونێک لە حاڵەتێکی چۆنی کۆنەوە بەرەو حاڵەتێکی چۆنی تازە، لەجێ دانیشتنی چۆنیەتییەکی کۆن بە هۆی تازەوە، روودەدا. پلەی بەرەوپێش چوونی تازە بەهۆی چارەسەرکردنی دژایەتییەکانی پلەی بەرەوپێش چوونی کۆنە، لەدایک دەبێ و خودی پلەی تازەش دژایەتییەکی تازەی تێدایە، چونکە ئەوکاتەکە لەدایک دەبێ، شتێکی لە رابردووکە لە خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەگەڵ دایەو هەروەها شتێکی لە داهاتووی لەگەڵ دایەکە سەر ئەکێشێتە لای ئەو شتەوە. هەربۆیە ئەو لایەنە "مثبت و منفی" یەی رابردوو و داهاتوو، شتێکی بەرەو مەرگ چوو شتێکی بەرەوپێش چووی تێدایە. لەسەر ئەم بناخەیە، جارێکی تر لە دەروونی دا، کێشە لەنێوان کۆن و نوێ دا، لەنێوان بەرەومەرگ چوو و ئەوەی دێتە بەرەوە، لەنێوان ئەوەی نامێنێ و ئەوەی بەرەوگەشەکردن دەچێ

(۱) ـ کونفورت، پێشوو، لاپەڕی ۱۳۰ ـ ۱۳٤

پەیدا دەبێ . بەم جۆرە جموجۆڵی بەرەوپێش چووی گەشەکردن بریتی یە لە چارەسەرکردنی هەمیشەیی زنجیرەی چەند دژایەتی . بەرەوپێش چوون هەمیشە بەرەوگەشەکردنێکی تازە ، دەچێتە پێشەوە . گشت جەرمیان لەهەر پلەیەك دا ، لە زات و ناوەڕۆك دا ، بریتی یە لەو خەباتە .

نابێ یەکجەرمیان بریتی بێ لە یەك دژایەتی ، بەڵکوو پێویستە چەند دژایەتی تێدابێ . واتا کۆمەڵێکە لە دژەکان . هەربۆیە بۆ تێگەیشتن لە جەرمیانێك پێویستە لە دژەکانی ،پێوەندی یە دوولایەنەکانی ئاگادار بین . ئەمە بەو مانایەیە کە بەر لە هەموو شتێك پێویستە لە دژایەتی یە بنەڕەتی یەکانی جەرمیانێك لە تایبەتمەندی گشتی خۆی دا و لەو شێوازە تایبەتی یەدا کە لە هەر پلەیەك دا ، خۆی بەوە دەنوێنێ تێ بگەین . دژایەتی بنەڕەتی بریتی یە لە دژایەتی زاتی خودی ناوەڕۆکی جەرمیانەکە ، کە لایەنەکەی دیاری . بۆ نموونە لە کۆمەڵ دا دژایەتی بنەڕەتی بریتی یە لە دژایەتی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنان و پێوەندی یەکانی بەرهەمهێنان . ئەمش و هەر پلەیەك لە کۆمەڵ شێوازی تایبەتی بەخۆوە دەگرێ . لە کۆمەڵــــــی سەرمایەداری دا ئەم دژایەتی یە لەنێوان بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی وخاوەن مڵکایەتی تایبەتی دایە . . .

ئەم دژایەتی یە بنەڕەتی یە ، شتێکە لایەنی بەرەوپێش چوون دیاری دەکا . واتا لە سەرمایەدارییەوە بەرەو سوسیالیزم . بەرەو خاوەن مڵکایەتی کۆمەڵایەتی لە پێوەندی لەگەڵ بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی دا . بەبوونی دژایەتی بنەڕەتی ، ئەوکات جەرەیان بەهۆی ژمارەیەك لە دژە پەیرەوە گەورەو چوکەکان کە تایبەتمەندی شوێنەوارەکانی هەرکامیان بەهۆی دژایەتی بنەڕەتی یەوە ، دەبێتە خاوەن مەرج ،ئاشکرا دەبێ . کردەوە و چارەسەرکردنی ئەمانە ، گشت پرۆسەی چارەسەرکردنی دژایەتی یەتی بنەڕەتی بەرەو پەیدابوونی پلەیەکی نوێ جەرمیان ، چۆنیەتی یەکی نوێ ، دەگرێتەبەر . لە دژایەتی بنەڕەتی کە بەهۆی گشت ئەو خەباتە پێڕەوانە ، هەڵدەستێ ،چارەسەر دەکرێ . بەڵام لێرەدا دژایەتی یەکی تایبەتی بەپێی ڕەواڵ ، دەوری کلیلی و سەرەکی یان بنەڕەتی هەیە . . . بۆ نموونە لە هەر وڵاتێکی سەرمایەداری دا ،دژایەتی زۆر هەیە . بێجگە لە دژایەتی نێوان کرێکارو سەرمایەدار ، دژایەتی زۆر لەنێوان وردەبورژوازی شارنشین و

دانیشتووی شار، جووتیارو خاوەن زەوی و هی تردا هەیە. هەروەها لە نێوان چینی سەرمایەداریش دا دژایەتی هەیە. دژایەتی لە جۆری نێونەتەوەیی و هتد... (١) بەڵام لێرەدا خەباتی چینایەتی و دژایەتی لەو چەشنە بنەڕەتی یەو گرنگە. ئەمە خەباتی چینی کرێکارو سەرمایەدارە کە لە وەلاتێکی دیاری کراودا دەوری گلیلی هەیەو کۆمەڵ لە سەرمایەداری یەوە بەرەو سۆسیالیزم دەبا، چونکە ئەمە دژایەتی یەکە سەر ئەکێشێتە لای ئاڵ وگۆڕی فوڵ و ئاڵ وگۆڕێکی وا لە زاڵ بوونی یەك لایەن بەسەرئەوی تردا، پێك دێنێ کە ئاڵ وگۆڕی بنەرەتی لە چلۆنایەتی گشت دا، بەوجوود دێنی. بەم جۆرە لە دژایەتی نێوان سەرمایەدارە گەورەکان و وردە بورژوادا، هەمیشە بورژوازی گەورە زاڵ دەبێ و بەهێزتر دەبێ. هەربۆیە وردە بورژوازی ناتوانێ هێزێکی شۆرشگێڕی بەرچاو و گەورە لە وەلاتێکی سەرمایەداری دابێ، چونکە دژایەتی یەکەیان بنەرەتی نیە. لەلایەکی ترەوە چینی کرێکار لەگەڵ گەشەکردنی سەرمایەداری دا، بەهێزتر دەبێ. هێزێکە کە لە بەرامبەر سەرمایەدارانەوە مل کەچەو سەرمایەدار بەسەری دا زاڵە. بەڵام سەرەنجام ئەم زاڵ بوونە لەفرتوونا دەکا. بەم هۆیەوەیە کە چینی کرێکار هێزی شۆرشگێڕی بنەڕەتی یە و دژایەتی ئەو لەگەڵ سەرمایەداردا، دژایەتی بنەرەتی یە.

بۆ تێگەیشتن لە یاساکانی گەشەکردنی جەرەیانێك نابێ تەنیا لە دژی بنەرەتی جەرەیانەکە لەهەر پلەیەك بگەین و ئاگادار بین، بەڵکوو پێویستە لە هێزە بنەرەتی یەکانی چارەسەرکردنی دژایەتی و بنەرەتی و بەرەوپێش بردنی جەرەیان بەرەو پلەیەکی تر، ئاگادار بین. پێویستە لە لێکۆڵینەوەی هەر جەرەیانێك دا ئەمەری تێکۆشانمان بۆ دۆزینەوەی دژایەتی بنەرەتی هەبێ. ئەوەش دەبێ بزانین شتێك لە حالێکی دیاری کراودا، دەگونجێ دژایەتی بنەرەتی بێ و لەبارێکی تردا نەبێ. ئەوکات کە دژایەتی بنەرەتی دۆزرایەوە، چارەسەرکردنی هەر مەسەلەیەك هاسان دەبێ... ئەوەش دەبێ لەبەرچاو بگرین کە لە هەل ومەرجێك دا، دەگونجێ شتێك دژایەتی بنەرەتی بێ و لە هەل ومەرجێکی تردا نەبێ، هەربۆیە دۆزینەوەی دژایەتی کارێکی دژوارە.

---

(١) ـ کونفورت، پێشوو، لاپەڕە ١٣٦ ـ ١٣٥

## دەوری نەفی لە گەشەکردن دا :

جموجۆڵی گەشەکردن هەرچەندە لەهەر شتێکی تایبەتی دا گەرێ و گۆلداربێ ، هەمیشە لەرێگای خەباتی کۆن و نوێیەوە و زاڵ بوونی نوێ بەسەرکۆن و بەرەومەرگ چوودا ، بەدی دێ . بەم جۆرە لە گەشەکردنی کۆمەڵ دا، لە تێپەربوون لە سەرمایەداری بەرەو سۆسیالیزم ، ئەوەی لە کۆمەڵی سەرمایەداری دا تازەیە ،بریتی یە لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی لە بەرامبەر پاشماوە و کۆنەوە کە بریتی یە لە خاوەن مڵکایەتی تایبەتی ، کە تازە لەگەڵ کۆنەکەدا دژایەتی هەیەو بەم جۆرە هێزی تازەی کرێکار ، پەیدا دەبێ کە خەباتەکەی بۆ گەیشتن بە پلەیەکی تازە لە ژیان و پێوەندە کۆمەڵایەتی یە ـ کانە دژ بە پارێزەرانی کۆنە . ئەم چەمکە دیالکتیکی یەی گەشەکردن لەگەڵ چەمکی لیبرالی جیاوازی هەیە . ئەوان هەموو ئەمانە پەسند دەکەن . بەلام نوێ لە جێگای کۆن داناێن وبۆ راگرتنی کۆن تێدەکۆشن تاخۆی درووست بکا ببێتە مەوجودێکی بەرزتر .

بەم شێوە دەتوانین بلێین : کەسێك دەوری نەفی لە بەرەوپێش چوون دا دوزیوەتەوەو ئەوی‌تر نەی دوزیوەتەوە . دیالکتیك ئێمە حالی دەکا بزانین پێویستە تازە لەگەڵ کۆنە خەبات بکا و بەسەری دا زاڵ بێ وکۆنیش پێویستە بە تازە رێگابدا . بەم جۆرە نوێ لە جێگای کۆن دادەنیشێ . واتا پێویستە کۆنە بەهۆی نوێوە " نفی " بکرێ . لیبرال میتافیزیکی بیردەکاتەوەو نەفی بە " نەء " وتن لێك دەداتەوە . پێی وایە نەفی کۆتایی پێ هاتنی شتێکە . بە واتای باشەکشەیە ، نەك بەرەوپێش چوون . لای ئەو بریتی یە لە دۆڕانـدن ، نەك بردن . بەلام دیالکتیك دەڵێ : لە نەفی نەترسێن ، بەڵکوو پێویستە بزانین چۆن بریتی یە لە مەرجێکی گەشەکردن و هۆیەك بۆ گەشەکردنی " مثبت ". (١)

## نەفی نەفی یان یاسای نەفی کردنی نەفی :

---

(١) ـ کونفورت، پێشوو، لاپەڕی ١٤٠ـ ١٣٦

هەموو دەزانین کە لە جیهانی دەوروبەرمان دا ، هەندێك دیاردەی بەك پەیوەن ،لەناوچوون و مردن تووش دەبین و ئاشکرایە کە هەموو شتێك سەرەتا ، بەخۆدا هاتن و پێگەیشتن و پەیوون و لەناوچوونی هەیە ۰ بەم چەشنە دەبینین ناوەرۆکی نەفی لەوەدایە کە هەموو شتێك تازە نەبێتەوە و پاشان پەکی دەکەوێت ، دیاردەی کۆن لەناودەچێ و دیاردەی تازە جێگای دەگرێتەوە و بەکورتی " نەفی " ئەوەیە کە دیاردەکە پەرە دەستێنێ و دەگاتە پلەیەکی نوێی بەرزتر ۰ ئینجا بۆئەوەی بەباشی لەمە تێبگەین ، پێویستە ئەوەش بزانین کە " نەفی " واتە بەك کەوتنی دیاردەکان کە باوییان نەماوە ، بە زۆر چەشنە شێوە پێك دێ ۰ بۆ نموونە ئامرازێك کۆن دەبێ و دەبێتە پارچە شکاو ۰ ئەمەش نموونەیەکە بۆ نەفی کردن ۰ بەرمانایە کە رۆژانە تووشی دەبین و باسی لێ دەکەین ، خۆ ئەگەر خۆمان ئەو ئامرازە تێك شکێنین ،هیچ هەڵ و مەرجێکی وا نە روست نابێ کە بە رێگای کاری نەفی ، شتێکی نوێ پەرە بستێنێ ۰ ئەم چەشنە نەفی کردنەش لە ژیانی رۆژانەدا ، تووشمان ئەبێ و هێندێك جار ئەبێتە ئاریێی پێویست ۰ بەلام ئاشکرایە کە هێلی سەرەکی جووڵانەوەی مێژوو بریتی یە لە دروست کردن ۰۰ یاسای نەفی کردنی نەفی بەکورتی ئەمەیە : لە کردەوەو جەرەیانی پەرەسەندن ، هەر پلەیەکی بەرزتر ،پلەی رابردووی نەفی دەکاتەوە و وەلای دەنێ ، هەرلەوکاتەش دا بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەیەکی نوێ و هەموو ناوەرۆکێکی باشی لە پەرەسەندنێك دا ، دەپارێزێ ۰ ( ۱ )

چەمکی دیالکتیکی بەرەوپێش چوون ، لە رێگای نەفی یەوە ، دژی چەمکی لیبرالی بەرەوپێش چوونە ۰ بۆ لیبرال نەفی لێکدانێکە کە شتێك لەنێو دەبا ۰ بەلام بەپێچەوانە نەفی بۆ بەرەوپێش چوونی " مثبت " ە کە کۆن تەنیا کاتێك چەند مەرج بۆ تێپەربوونی نوێ بەدی بێنێ ، ئەو مەرجانەی کە لەودا تەواوی دەسکەوتە " مثبت " ەکانی ، ئەوانەی کە پێوەندی بە پلەی کۆنەوە هەیە بە پلەی نوێ خۆی رادەگێرێ ، تەفروتوونا دەبێ ۰ بێجگە لەوە پلەیەك کە تێپەریوە لە ناکامی نەفی دووبارەوە دەتوانێ لە پلەیەکی بەرزتردا ، دووبارە وجوود پەیدا بکا ۰ دووبات بوونەوەی پلەی کۆن لە پلەیەکی

---

( ۱ ) ـ کورتەباسێکی ۰۰۰ پێشوو ، لاپەڕی ۷٦ ـ ۷٥

بەرزتردا لە لەرێگای نەفی دەوبارەوەیە، ئەنجام دەدرێ، بریتی یە لە بناغەیەکی وەبەرگرو گشتی و گرنگی گەشەکردن کە کرداری لە زۆربەی جەرمیانەکانی سروشت و مێژوو و بیروباوەردا، خۆدەنوێنێ. (١)

## تایبەتمەندی تایبەتی "مثبت"ی نەفی :

نەفی دیالێکتیک بەواتای "نەء" وتن نیە. ئەوکات کە لە جەرەیانی بەرەوپێش چوون دا کۆن بەسەری تەرێوە، نەفی ئەبێتەوە وەلا دەنرێ، یەکەم- پلەی تازە بێجگە لەوەکە لەکۆنەوە هەستابێ ولە بەرەبەرەکانی لەگەل کۆن دا، وجوود پەیدا بکا، مەرج بۆ وجوودی تازە لەکۆندا بە وجوود دێ و پێ دەگا. نەفی گەشەکردنێکی "مثبت"ە کە تەنیا بەهۆی بەرەوپێش چوونی شتێك کە نەفی دەبێ، وجوود پەیدا دەکا. کۆن بە تەواوی هەل نا وەشێتەوەو شتەکان بەشێوەی هەرگیز نەبوون، وێل ناکا، تەنیا پاش ئەوە خۆی بوو بەهۆی پەیدابوونی چەند مەرج بۆ پلەی بەرەوپێش چوون و گەشەکردن، ئەوجار هەل دەوەشێتەوە.

دووەم- پلەی کۆن کە نەفی دەکرێ، خۆی بەگشت ئەم کردەوانە دا، پلەیەکی بەرەوپێش چوونە لە جەرمیانی بەرەوپێش چوونی گەشەکردن دا. ئەو نەفی ئەبێ بەلام ئەو گەشەکردنەی کە بەدی دێ، نەفی نابێتەوە. بە پێچەوانەوە ئەم بەرەوپێش چوونە بەرەو پلەی تازە کە گشت دەسکەوتەکانی رابردووی لە خۆی دا راگرتوە و دەچێتە پێشەوە، ئەنجام دەدرێ.

بۆ نموونە سوسیالیزم لە جێگای سەرمایەداری دادەنیشێ و نەفی ئەکانەوە، بەلام هەل ومەرج بۆ پەیدابوون و سەرکەوتنی سوسیالیزم، لە دەروونی خودی سەرمایەداری دا، بەدی هاتوە. هەر دەسکەوتێك، هەر بەرەوپێش چوونێك لە هێزە بەرهەمهێنەرەکان دا، هەروەها هەر دەسکەوتێکی فەرهەنگی کە لە سیستەمی سەرمایەداری دا هاتبێتە دی، ئەوکات کە سەرمایەداری نەفروتونا دەبێ، ئەو دەسکەوتانە دەمێنن وە پارێزراون و بەهێز دەکرین ...

---

(١) ـ کۆنفورت، پێشوو، لاپەڕی ١٤٠

لەسەر پلەیەك لە چەرمەی گەشەكردن دا ؛ كێشە لەنێوان نـــوێ و كۆن دا ، پەیدا دەبێ · تازە لە دەروونی هەل ومەرجەكانی كۆنەدا پەیـــدا دەبێ و سەرمەل دەدا و لەوكات كە بە تەندازەی پێویست بەهێز بوو ، كـۆن دەڕووخێنێ و تەفروتوونای دەكا · ئەمە نەفی پلەی گەشەكردنی رابـــردووە ، باری پێشی كۆنە · ئەمە بەواتای بەوجوود هاتنی پلەی گەشەكردنی نـــوێ و بەرزترە ، باری چونی تازەیە · (١)

نموونە ، لەكاتی چاندنی كشت وكاڵ دا ، تۆوەكە دەڕوێت ، پێ دەگا و گەورە دەبێت و بەرهەم دەدات · لەكاتی چاندن دا ، ئەو تۆوەی تاو گڵەكە لەنێو دەچێ لە تۆوی دەكەوێ و تووشی " نفی " دەبێت · لەم تـــــۆوە رووەكی تازە پێ دەگا كە لە ئەنجام دا بەرهەم و تۆوی نوێ دەدا · كشت ئەم پێگەیشتنی بەرهەمە ،خۆی لە خۆی دا نەفی كردنی نەفی یە · راستە ئێمە لـە ئەنجام دا دەگەینەوە ئەوەی كە چاند ووما نە ؛ بەلام ئەم دووبارە بوونەوەیـــە لەسەر بنچینەیەكی تازەیەو بەرزترە · · · لێرەدا پەرەسەندن لە نزمەوە بـــۆ بەرز دەڕوا · (٢)

## نـــەفیـــــی نەفـــــی :

ئەمە ئێمە بە لایەنێكی تری دیالكتیكی گەشەكردن ( نفی نفـــــــــی) دەگەیەنێ · بۆ نموونە كۆمەڵ لە ژیانی هاوبەشی سەرەتایی یەوە ، گەشە دەكا بۆ سیستەمی كۆیلەداری ،ئەوەوە بۆ دەرەبەگایەتی ، پاشان سەرمایەداری · هەرپلەیەك لە پلەكانی پێشوو بەوجوود هاتۆەو پلەی پێش خۆی نەفـــــی كردوەتەوە · تا ئێرە بەدوا هاتنێكی پلەكان دەبیند رێت كە یەكێك نەفـــــی ئەوی تر و وەك پلەی گەشەكردنی بەرزترە · بەلام پاش ئەو چ دێ ؟ كومونیسم · لێرەدا گەڕانەوە بۆ سەرەتایە · بەلام لە پلەیەكی گەشەكردنی بەرزتـــــردا ، خۆی نیشان دەدا · بە جێگای كومونیسمی سەرەتایی كە پاڵی بە هێـــــزە بەرهەم مێنەرە سەرەتایی یەكانەوە دابوو ، كومونیسمێك دێت كە بناخەی لەسەر

---

(١) ـ كونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٤٢ ـ ١٤٠

(٢) ـ كورتەباسێكی · · · پێشوو ، لاپەڕی ٧٦

هێزە بەرهەمهێنەرە زۆر بەرەوپێش چووەکان ، ئیمکاناتی گەشەکردنێکی جێی سەرسوڕمانی تێدایە . کۆمەڵگای بێ چینی سەرەتایی کۆن ، جێگای خۆی داوە بە کۆمەڵگایەکی بێ چینی نوێ و بەرزتر . وەک ئەوەیە کە بە هێزێکی بەرزتر گەیشتۆتەوە و دووبارە لە پلەیەکی بەرزتردا ، خۆی نواندوە . بەڵام هۆی ئەمە تەنیا ئەوە بوو کە کۆمەڵگای بێ چینی رابردوو ، بەهۆی پەیدابوونی چینەکان و گەشەکردنی کۆمەڵگای چینایەتی " نفی " بوو . بەم هۆیە لە ئاکام دا ، کۆمەڵگای چینایەتی ، ئەوکاتە کە بە گشت گەشەکردنەکەی گەیشتوە ، خۆی بەهۆی دەسەڵاتدارەتی چینی کرێکار ، دوایی هاتنی چەوسانەوەی مرۆڤ بەهۆی مرۆڤەوەو دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی بێ چین لە سەر بناخەی تەواوی دەسکەوتەکانی گشت گەشەکردنەکانی پێشوو ، نەفی کراوە .

ئەمە نەفیی نەفی یە . بەڵام ئەمە ( بەپێچەوانەی رای لیبراڵەکان ) ئێمە بەرەو خاڵی سەرەتا ناگێڕێتەوە . ئەمە ئێمە بە خاڵێکی دەس پێکردنی تازە کە خاڵی دەس پێ کردنی سەرەتایە کە لە رێگای نەفی یەوە ، هەروەها لە رێگای نەفیی نەفی یەوە ، بە پلەیەکی بەرزتر گەیشتوە ، بەرەوپێش دەبا .

بەم جۆرە ئەبینین کە لە جەرەیانی گەشەکردن ، لە ئاکامی نەفی دووبارەوە ، پلەیەکی دوایی دەتوانێ ، پلەیەکی سەرەتایی تر ، دووپات بکاتەوە ، بەڵام لە پلەیەکی بەرزتردا .

گەشەکردنێک هەیە کە بەرواڵەت ، پلەکانی پێشوو دووپات دەکاتەوە ، بەڵام ئەوانە بەجۆرێکی تر دووپات دەکاتەوە ( بەشێوەیەکی تازە ) . لەسەر بناخەیەکی بەرزتر . . . گەشەکردن بەشێوەی پێچ پێچ ( مارپێچی ) نە لەسەر هێڵێکی راست . . . ( ۱ )

## مەبەست لە " اثبات " و " نفی " شتەکان چی یە ؟

وەک وتمان لە ژیان دا چەند هێز هەن بنەمای ژیانیان تێدایەو هەروەها لە بەرامبەر ئەمانە لە لەشی مرۆڤ دا چەند هێز هەن میلیان بۆ

---

( ۱ ) ــ کۆنفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ۱٤٤ ــ ۱٤٢

وەلانانەو لێرەدا دژایەتی خۆدەنوێنێ • هیچ شتێك لەگەڵ خـــۆی دا، ناسازێ،چونکە هێزەکانی دەرووی لەکێشەدان ( سێهەم یاســــــای دیالکتیك ) • ئاڵوگۆری دیاردەکان لەبەرروونی دژایەتی •••

اثبات ، نفی ، نەفی لە نەفی (Negation in the Negation

••• ستێك كە لە نەفی بێتـە دەرێ ( Affirmation Negation

باری " اثبات " پەیدا دەکا • جوجەڵە " اثبات " یکە کە لە " نفی " تۆو، هاتۆتە دەرێ • ئەمە یەکێك لە پلەکانی گەشەکردنە • مریشك لە گۆرانـــــی شێوازی جوجەڵە ،لە دایك بۆە • لەماوەی ئەم گۆرانەدا لەنێوان ئـــــەو هێزانەدا کە ویستوویانە ، جوجەڵە وەك هەیە رای‌بگرن و ئەو هێزانەی کـــە ویستوویانە بیکەن بە مریشك ، کێشە هەبۆە •

مریشك بریتی‌یە لە " نفی " جوجەڵە ، جوجەڵەش بەرهەمی " نفـــی " هێلکەیە • کەوابوو مریشك نەفیی لە نەفی‌یە • ئەمە شێوەی گشتی گەشەکردنی دیالکتیکی‌یە •

١ـ " اثبات " کە پێی‌دەڵێن • تز ( بڕیار )

٢ـ " نفی " کە پێی‌دەڵێن • ئانتی تز ( دژی بڕیار) نەفی لـــــە نەفی‌یەکیان دەبێتە " سەنتز " ئەمەیە کاکڵە خۆشەی دیالکتیـــــك ••• تێك رووخان ناوی نەفی‌یە • جوجەڵە ، نەفی هێلکەیە ••• (١)

## یاسایەکی وەبەرگـرو گرنگی گەشەکـردن •

دیالکتیك ئێمە فێردەکا کە پێویستە یاسای گەشەکردنی هـــــــەر جەرمیانێکی تایبەتی بەهۆی لێکۆڵینەوەی خودی جەرمیانەکە لــــــە گەشەکردنی‌دا ، بناسین • بەڵام کاتێ خەریکی ئەم کارەین ، ئێمـــــە دووبات کردنەوەی پلەیەکی کۆن لە پلەیەکی بەرزتردا کە لە رێگای نەفیـــی نەفی‌یەوە ، بەدی دێ ، ئەدۆزینەوە •

نەفیی نەفی چی‌یە؟ بریتی‌یە لە یاسای بێ‌سنووری گشتی و بەم هۆیـــە ( بێ‌سنوورو وەبەرگرو گرنگە ) گەشەکردنی سروشت ، مێژوو و بیـروڕا •••

---

(١) ـ اصول مقدماتی فلسفه ، پێشوو ، لاپەڕی ١٦٨ ـ ١٦٥

ئاشکرایە کە ئێمە بە ناوبردنی پەسن و سیفەتی هەرکام لەم جەرەیانانە بەرەو گۆڕان و گەشەکردن چووە ، لەژێر ناوی " نفی نفی " شتێک سەبارەت بە شتێک لە جەرەیانی تایبەتی گەشەکردن نائێین . ئەوکات کە دەڵێین ، گشت ئەم جەرەیانانە " نفی نفی " ن ، هەموویان دەخەینە ژێر ڕێنفی ئەم تاقە یاسایەی جموجۆڵ . دیالکتیک تەنیا بریتی یە لە زانستی یاسا گشتی یەکانی جموجۆڵ و گەشەکردنی سروشت و کۆمەڵی مرۆڤایەتی ...

ئەم یاسایە لە گەشەکردنی کۆمەڵ ، خاوەن مڵکایەتی تایبەتی و هەروەها لە مێژووی بیرکردنەوەش دا ، نموونەیان هەیەو بەرێوە دەچێ . بۆ نموونە ماتریالیسمی سەرەتایی و ڕەمەکی سروشتی فیلسوفەکانی سەرەتا ، بە هۆی فەلسەفەی ئید ەئالیستی یەوە ، نەفی کرایەوە . و ماتریالیسمی نوێ وەک نەفی ئەو ئید ەئالیسمە لەدایک بوو . ئەمە تەنیا سەغامگیربوونی دووبارەی ماتریالیسمی کۆن نیە ، بەڵکوو بریتی یە لە گشت ناوەرۆکی بیروباوەڕی دووهەزارساڵی گەشەکردنی فەلسەفەو زانستە سروشتی یەکان لەسەر بناخەی ئەم ماتریالیسمە کۆنە ، زیاد دەکا ...

بەم جۆرە بناخەی نەفیی نەفی بریتی یە لە ڕاگەیاندنی ئەم ڕاستی یە پێ خەوشە کە ناتوانین ڕەورەوەی مێژوو بەرەو پاشەوە بەرین و ڕابردوو دووبارە بێنینەوە کایەوە ، تەنیا ئەتوانین بەرەوپێش و داهاتوو لە ڕێگای چارەسەکردنی گشت دژایەتی یەکانی پلەیەکی دیاریکراوی گەشەکردن و لە ڕێگای نەفی یەوە کە بەدوایان دا دێ ، جموجۆڵ بکەین و هەنگاو هەڵ بگرین . ( ١ )

## ڕەخنەو ڕەخنە لە خۆگرتن :

بە پێی بۆچوونی ماتریالیستەکان گەشەکردن لە ڕێگای دژایەتی یەوە کێشە لەنێوان کۆن و نوێ دا ، ئەمێنە کۆنەکەی گەشەکردنی داهاتووی کۆمەڵی کومونیستی . بەڵام بەکۆتایی پێ هاتنی هەرجۆرە چەوسانەوەی مرۆڤ ،

---

( ١ ) _ کونفورت ، پێشوو ، لاپەڕی ١٤٨ _ ١٤٤

لە مرۆڤ، ئەم گەشەکردنە ئیتر لەرێگای تێك هەڵچوونی کۆمەڵایەتی زۆرەملی و سەرهەڵدانی نافەرمانی و ئانتۆزی پێك نایە . بەڵکوو لەرێگای شێوەی ژیریێتی و رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن، کە دەبێتە پلەی تازەی گەشەکردن، ئەنجام دەدرێ . بەپێی هەرئەو بیروبۆچوونە مارکسیزم زانستیکی خولقێنەرە کە پێویستە هەمیشە بەکەلك لێوەرگرتنی لە هەلومەرجی تازەی گەشەکردن دا، بەرەوپێش بچێ . رەخنەگرتن و رەخنە لەخۆگرتن، بە راستی لە دڵی شێوە دیالکتیکی مارکسیستی دایە .

## جۆرێك گەشەکردنی تازە .

لە پلەی کومونیستی کۆمەڵ دا، ئەم شێوە گەشەکردنە هەیە یان نا ؟ دیارە گەشەکردن کۆتایی پێنایەت . بەپێچەوانە تەنیا بە گەیشتن بە کومونیسمە کە گەشەکردنی مرۆڤ بەواتای دروستی گەشەکردنێك کە زانیارانە بەهۆی خودی مرۆڤەوە، بەرنامەی بۆ دانرابێ و خرابێتە ژێر چاوەدێری یەوە، لەراستی دا دەس پێدەکا . دیاردەکانی تر لە راستی دا بریتی بوون لە ئامادەکردنێکی دەرهێنەر بۆ ئەم پلەیە . واتا ئیشی لەدایك بوونی مرۆڤ .

ئەوکات کە گشت ئامرازی بەرهەمهێنان کەوتە ژێر رێبەری کۆمەڵایەتی خاوەن بەرنامە، لەوکاتەدا دەگونجێ چاوەڕوانی بکرێ کە ئاغایەتی مرۆڤ بەسەر سروشت دا، یەکجار زۆرو بەشێوەی هەتاهەتایی و بێسنوور، زیاتر دەبێ و سەرکەوتن و گۆڕانی سروشت بەهۆی مرۆڤەوە، بەجۆرەی خۆی بەواتای پەیدابوونی ئاڵ وگۆڕی قوڵ لە شێوەی ژیانی مرۆڤ دایە .

بۆ نموونە، شیاوی بەرهەم هێنانی بەرهەمەکان بە ئەندازەی فراوانی بەربڵاو، بەکەمترین کاری مرۆڤ لەنێو بردنی " ئانتی تز " ەکانی نارۆکەند، واتا جیاوازی یەکانیان، هەروەها هی کاری دەستی و کاری بیری، بە ئاشکرا بەواتای پێك هاتنی ئاڵ وگۆڕی قوڵ لە چوارچێوەی کۆمەڵ، لە بۆچوون، خۆوخەدەو بەگشتی لەشێوەی ژیان دایە . بەڵام ئەنجام دانی ئەو ئاڵ وگۆڕانە لە هەرپلەیەك دا، رێگایەکی بێجگە لە نووشی شکان کردنی شێوازە کۆمەڵایەتی یەکان، بۆچوونەکان، ئەو خووورەوشتانە کە پێوەندی بە

رابرد ووەوه هەیه ،نیه. هەرچێه گەشەکردن لەرێگای دەرخستنی
دژایەتی یەکان ، کێشه لەنێوان کۆن و نوێ دا ،دا هاتوو و رابرد وو ،
دڕێژەی دەبێ . بۆ جموجۆڵی بەرەوپێش چ چاوەروانی یەکی دیکه هەیه ؟
مەیلە تازەکان له هەل ومەرجی مەوجوود و له هەرپلەیەک که سەر هەڵ دەدا ،
لەگەڵ هەل ومەرجی مەوجوود دا دژایەتی پەیدا بکەن ، بەم جۆره سەر
ئەکێشێته لای ئەمانی ئەوان و رێگادان به هەل و مەرجی نوێ . هەروەک
وتمان ئەم گەشەکردنه له رێگای زۆرەوە ئەنجام نادرێ . لەگەڵ کومونیسم دا
راپەرینی مرۆڤایەتی له سنووری پێویست بوون ( ضرورت ) به سنووری
ئازادی ئەنجام دەدرێ و بەو واتایەیه که بەرەورووبوونه ریشەیی یەکان که
تایبەتن به سنووری پێویستی یەوە جێگای خۆیان بەو گۆرانەی که لەژێر
چاوەدێری دان و به بەرنامه ، دەدەن .

یاساکانی تێکوشانی مرۆڤ که تا ئەم کاته له چوارچێوەی یاسا
دەرەوەیی یەکانی زاڵ بەسەر سروشت دا ، لەگەڵی بەرەوروو دەبوون ، لەم
بارەدا بەهۆی خودی خۆی ،به زانینی تەواوەوە ، کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ
بەم بۆنەوه ، دەکەونه ژێر رکێفی مرۆڤەوه . رێکخراوی کۆمەڵایەتی خودی مرۆڤ
که تا ئێستا تاوەکا له بەرامبەری یەوه رادەوەستا وەک ئەوه بڵێی سروشت و
مێژوو ، ئەوی داسەپاندوە ، لەمەو بەدوا جێی خۆیان به هەنگاوهەلگرتنی
داخوازانه دەدەن . مرۆڤ به زانیاری تەواوەوه ، مێژووی خۆی دەخولقێنێ .
ئەوکات که مرۆڤ یاساکانی رێکخراوە کۆمەڵایەتی یەکانی خۆی ، دادەنێ و
ئەویش ئەخاته ژێر چاوەدێری هاوبەشی خۆی ، ئەوکات چەوسانەوەی مرۆڤ
بەهۆی مرۆڤەوە ، نامێنێ . ئەوکات ئەوەی نوێ و راپەرەوو دژایەتی یەکەی
لەگەڵ کۆن زاندراوه ، لەوکاتەدا دەکۆنجێ که هەل ومەرجی کۆن
وەلابندرێ و هەل ومەرجێکی نوێ لەگەڵ قوڵ بیرکردنەوەو بەرنامە ،
بێ بەرەورووبوونەکان و سەرکێشی یەکان ،بخولقێندرێ . نەمێنێتەوە دژایەتی
تازه لەگەڵ کۆن و زاڵ بوون بەسەری دا . بەڵام عونسوری ناتەبایی و
تێک هەڵچوون لەنێوان مرۆڤەکان له کۆمەڵ دا ، نامێنی و جێگای خۆی
دەدا بەشێوەی بەواتای دروستی مرۆڤایەتی بریاردان سەبارەت به
چارەسەرکردنی کارەکان ، بەهۆی ژیرێتی و رەخنەگرتن و رەخنەلەخۆگرتن .
له ئەدەبیاتی مارکسیستی لینینیستی دا له چوارچێوەی تێئوری

سیستەمی کۆمۆنیستی دا ، بۆ داهاتووی دووری ژیانی مرۆڤ پێش بینی کراوە کە مرۆڤ ئەوکات کە سۆسیالیزم بەجێ دێڵێ و بەرەو کۆمۆنیسم دەڕوا ، دژبە بیروبۆچوونی کۆنی سەرمایەداری هەمیشە لە کێشە دایە . پاش رامالینی سروشتیانی سەرمایەداری حیزب و دەسەلات نامێنێ . ئاڵ وگۆڕی بەرفراوان بەوجود دێ . خەتاك یان ئاغاکانی سروشت ، ئەوانەی کە هیچ جۆرە چەوسانەوەیەك ناناسن ، بە باشی دەتوانن لە چارەنووسی خۆیان پارێزگاری بکەن . بەهەرحاڵ بەرەوپێش چوونی زانست و زاڵ بوونی مرۆڤ بەسەر سروشت دا ( لەم بارەوە سروشتی خۆمان ) ئەتوانێ سەربکێشێتە لای چەند گەشەکردنی گرنگەوە کە ژیانی ئینسانەکان بە قووڵی دەگۆڕێ . ئێمە ناتوانین بۆ هێزی دەسکەوتەکانی سروشت سنوورێك دابنێین . ئەتوانین بسەلمێنین ، داهاتووانی ئێمە ، چەند سەدە بەرە پاش ئێمە ، ژیانیان لەگەڵ ژیانی ئێمە کەم وەك یەك دەچێ ، هەروەك ژیانی ئیستای ئێمە لەگەڵ ژیانی سەرەتامان دا کەمتر وەك یەك دەچێ . ( ١ )

## ئاکامە گرنگەکانی دیالکتیك .

١ ـ دیالکتیك سەبارەت بە پێوەندی دوولایەنە .

٢ ـ گۆڕان و گەشەکردن . لەم شێوە زانینەدا ، پێویستە بگوترێ ، دیالکتیك بریتی یە لە زانستی یاسا گشتی یەکانی جموجۆڵ و گەشەکردنی سروشت ، کۆمەڵی مرۆڤایەتی و بیروڕا . دیالکتیك شێوەیە ، بە ئێمە یارمەتی دەدا بۆ ناسینی شتەکان و گۆڕانیان . ئەم زانستە خۆی گەشە دەکا و دەوڵەمەند دەبێ . هەر گەشەکردنێکی کۆمەلایەتی نوێ و هەر بەرەوپێش چوونێکی نوێ ، زانستەکان و هونەر پلەیەك بۆ دەوڵەمەند کردن و پەرە پێدانی فێربوونی دیالکتیك و شێوەکەی ، ئامادە دەکا . لەژێر تیشکی مەسەلە تازەکان و ئەزموونە نوێ یەکان ، زۆرتر فێر دەبین ، ئێمە دە بۆچوونەکانی خۆمان ، پەرە پێ دەدەین و راس و ریس و دەوڵەمەندیان دەکەین . ماتریالیسمی دیالکتیك بریتی یە لە تێڕوانینی جیهان بەشێوەی

( ١ ) ـ کۆنفورت پێشوو ، لاپەڕی ١٥١ ـ ١٤٩

زانستی ، زانستی کۆمەڵ ناسی دەخولقێنیٚ یان شوێنەوار و پێوەندی یەکانی کۆمەڵ ئەدۆزێتەوەو پیشان دەدا کە چۆن گشت زانستەکان دەتوانن لە خزمەت مرۆڤایەتی دا گەشە بکەن • بناخەی چەمکە جیهانی یەکانی خۆی لەسەر دۆزینەوەکانی زانستی دادەنێ •

بەداخێکی گرانەوە شوێنەوارەکانی دۆزینەوەی پێوەندی یەکانی سروشت و خولقێنەرانی ئامرازە سەرسورهێنەرەکان ، سەبارەت بەوەکە ئەورۆ دەسکەوتەکانی زانست ، گۆیاڵی دەستی چەوسێنەرانن و ئامرازی سەرکوت کردنی ئازادیخوازانن ، پێویستە لەجیاتی شانازی کردن بەو سەرکەوتنانە ، قسور بپێون ! کاریگەربوونی دەسکەوتەکانی زانست وای لە زەحمەتکێشان کرد و دەڵێن بریا زانست گەشەی نەکردبایەو زانا لە هۆشی پشکێنەری کەلکی وەرنەگرتبایەو گورزو گۆپاڵ و کوتەکی جاران کەرەسەی شەڕ بایان ، چونکە ئەوەی ئەوان بە سەدان ساڵ دۆزیانەوە ، چەوسێنەران بە رۆژێك مرۆڤایەتی یان پێ بنەبڕ کرد !

بەبڕوای من تا هونەر و عاتیفە و مرۆڤ دۆستی و کەرامەتی مرۆڤایەتی بەسەر زانست و دەسکەوتەکانی دا زاڵ نەبێ ،هەتا دەسکەوتەکانی زانست بەخۆی زاڵ بوونی هونەر بەسەر زانست دا لە بوارەکانی خزمەت بەمرۆڤ دا، کەلکی یان لێ وەرنەگیردرێ ، هەتا زۆردار خاوەنی دەسکەوتی زانستەکان بێ، زیانی زانست لە قازانجی پترە ! تەنیا خودی مرۆڤ بە تێکۆشانی دەتوانێ ئەو مەترسی یە لەسەر خۆی لابەرێ و مێژووی خۆی بخولقێنێ و بارودۆخی کۆمەڵ بگۆڕێ و داهاتووی خۆ دیاری بکا و دەسکەوتەکانی زانست بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بە قازانجی گەشەکردنی کۆمەڵ ، کەلکی یان لێ وەربگرێ و لەم قەیرانەی ئەورۆی جیهان ، خۆی رزگار بکا • کۆمەڵ ناسی بە هێزی مرۆڤ دەتوانێ مرۆڤایەتی لە ئاکامی تاڵی دەسکەوتە مەرگ هێنەرە -کانی زانست ، رزگار بکا • هەرچەند لە چاوی سەرەتای ژیانی هاوبەشی مرۆڤ ، شێوەی ژیان و پێوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکان و مەسەلەی ئازادی و رزگاربوونی گەلان لەبن دەستی ،کۆمەڵگای مرۆڤایەتی،گەلێك بەرەوپێش چووە ، بەڵام لە خولی بیستەم دا هێشتا ، هێندێك لە گەلانی جیهان لە بن دەستی رزگار نەبوون ! زۆر لە زەحمەتکێشان لە ژیانێکی شیاوی مرۆڤ ، بێ بەرین و بەنیسبەتی ژیانی خاوەن سامان و دەسەڵاتدارەکانەوە ،گەلێك

نماشن و بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی دەژین !

هەرچەند کۆڕو کۆمەڵی بشەردۆست لە جیهان دا کەم نین ، بەڵام قازانج پەرستی حکومەتە خاوەن دەسەڵاتەکان ، کەمتر لەوانەوە پشتیوانی دەکەن و لەراستی دا زۆرتر ناهێڵن دەنگی زەحمەتکێشان و بێ دەستان بە گوێی خەڵکی جیهان بگا . لەگەڵ ئەمەش دا ، گومان لەوەدا نیە کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەرەوتێپەڕکردنی ئەو پێوەندییە ناپیرۆزە هەنگاو هەڵدەگرێ . لە داهاتوودا ، دەنگی دلێری چەوساوەکان گوێی چەوسێنەران کەر دەکا و لە جیهان دا ، دەنگ دەداتەوە . بەڵام باسەکەی ئێمە لەسەر گەشەکردنی زانست و هاتنە مەیدانی زانیارەکان و بەرهەمو دەستەوتەکانی لێکۆڵینەوەی زانستییە کە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی قازانجی چەندەو زیانی کەڵک لێ وەرگرتنی خراپی ئەلایەن چەوسێنەرانەوە چۆنە؟

وەڵامی ئەم پرسیارەمان داوەتەوەو لەو باسە کورتەدا بۆ ئەو خوێنەوارانەی لە ناوەڕۆکی بابەتەکە گەیشتبن ، ئەوەندە بەسە . بەکورتی هەر زانست و فێربوون و فێرکردنێک لە جیهانی مرۆڤایەتی دا ، ئەگەر بە قازانجی گەشەکردنی کۆمەڵ و ئامادەکردنی ئامرازی بەکەڵکی ژیان و گەیشتن بە ئازادی و پساندنی زنجیری کۆیلەتی زەحمەتکێشان و گەلان و کۆمەڵانی بەرینی خەڵک نەبێ ، هەرچەند ناتوانین بڵێین بێ کەڵکن ، بەڵام کەڵک لێ وەرگرتنیان بەو شێوە ، جێی داخە . بەو هیوایە بە پەرەسەندنی دیموکراسی و هەنگاوهەڵگرتنی وڵاتان بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نێونەتەوەیی و ناوچەیی ، دیموکراسی بەواتای راستەقینەی خۆی ، لە جیهان دا ، جێ بگرێ و مرۆڤ لە چەوسانەوە رزگار بێ و هاوژیانی هاوبەش دامەزرێ و تێکۆشان لە پێناوی دابین کردنی ژیانێکی بەختەوەرانە بۆ گشت دانیشتوانی سەر زەوی ، زیاتر بێ . هەموو گەلانی جیهان لە ئاسایش دا بژین ، مرۆڤ ، مرۆڤ نەچەوسێنێتەوەو تاقە دوژمنی مرۆڤ سروشت بێ و بەزاڵ بوون بەسەر ئەویش دا ، ژیانی باشتر بۆخۆیان دابین بکەن .

ئەورۆ ئەگەر بەرهەمی زانست لە پێناوی کاروباری جەنگی دا ، کەڵکی لێ وەرنەگیردرێ ، لەوانەیە زانست گەشە نەکا . چونکە لە باری دیکەدا، سەرمایەی بۆ دانادرێ ! ئێستا زانست لە رێگای راستەقینە لای داوە !لە

ئاکام دا پێویستە تێ بکۆشین بێتەوە سەرباری خۆی . زانست دەتوانێ بێجگە لە ئاشناکردنی مرۆڤ بە یاساکانی دەروونی دیاردەکان ، لەباری تەندروستی و بەهێزکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و هی تردا ، خزمەتی بێوێنە بە مرۆڤ بکا .

بەبڕوای لایەنگرانی سۆسیالیزم ، رێگای پێشگیری لە لادانی زانستەکان ، بریتی یە لە بەرەوپێش چوون بۆلای سۆسیالیزم ، تەنیا ئەم جموجۆڵەیە کە خزمەتی زانست لەپێناوی ئاسایش و هێمنایەتی مرۆڤ دا دەستەبەر دەکا .

جەرمیانەکان و رووداوەکانی ئەم دوایی یانەی یەکیەتی سۆڤیەت ، ئەو راستی یەیان سەلماند کە سۆسیالیزمی مەوجوود یش نەی توانیوە ئەو ئەرکە بە ئەنجام بگەیەنێ ! تا مرۆڤ بە بیروڕای بەشەردۆستانە تەیار نەبێ ، پێش بە سەرەڕۆیی نەگرێ و بەسەر دەسکەوتەکانی زانستدا زاڵ نەبێ ، ناتوانێ پێش بە ملهوڕی زۆرداران بگرێ . ئێستا پرسیاری سەرەکی ئەوەیە چۆن دەتوانین هەژاری خاشەبڕ بکەین و بە کێشەی زۆرداروبێ زۆرو پەرەسەندنی جەنگ کۆتایی بێنین ؟ چۆن لە بەرهەم هێنان و پەیوەندی یەکانی بە قازانجی گشتی کەڵک وەربگرین ؟ چۆن نەتوانین ستەمی گەل یان دەسەڵات دارێک بەسەر گەلێکی تردا ، ریشەکێش بکەین ؟ چۆن نەهێڵین مرۆڤ مرۆڤ بچەوسێنێتەوە ؟ چۆن برایەتی لەنێوان ئینسانەکان دا ، بەوجوود بێنین ؟ رێبازە فەلسەفی یەکان هەرکامە وەڵامێکیان بەم پرسیارانە داوەتەوە . ئیدەئالیسم میتافیزیک ، رێبازە ئایینی یەکان ، هەرکامە وەڵامێکی جیاوازیان داوەتەوە . هێندێکیان ئەو رێک و پێکی و بێ ئازاری و یەکسانی یەیان بۆ جیهانێکی دیکە داناوە !

هێندێک ئەو بارەیان بەستۆوە بە ئیرادەی خواوەو پێیان وایە مرۆڤ ناتوانێ لەو بوارەدا ، نەقشی هەبێ . هێندێک بەخت و نەسیب و شتی لەم بابەتانە ، بە هۆ دەزانن ! بەڵام زانستەکانی ئەورۆ فەلسەفەیەک دەناسێنن کە بە پێی ئەو فەلسەفە کە فەلسەفەی کاروکردەوەیەو لە ئاکامی جموجۆڵی بێ وچانی مرۆڤ دا لە دایک بۆوە ، فەلسەفەی ئەو هۆشمەندانە کە ئامرازی ژیان بۆ هەموو خەلکی جیهان ، دەخوڵقێنن ، بە کەڵک وەرگرتن لە رێوشوێنەکانی ، بەرەو ئەو ئامانجە هەنگاو هەڵدەگرین . تا بچینە پێشەوە ،

ئەم دەسکەوتانە زۆرتر دەچنە خزمەتی مرۆڤ، ڤاڵ وکۆرو ئەزموونەکانی ئـــەم دوایی یانە ئێمە بۆ ئەولایە دنە دەدەن • پەرمێدان بە خوێنـــدەواری و فێرکردنی ئەو فەلسەفە کە خۆناسین و سروشت ناسین بێ پەنا بردن بـــەو، ناگونجێ ،پێویستە • کەوابوو پێویستە کرێکارەکان ،سپاهـ ، زەحمەتکێشانـــی شاروێ ، مووچەخۆران و پیشەسازەکان لەم فەلسەفە حالی بن ، بیخوێنن و بیکەنە ئامرازی خەبات بۆ رزگاری لە هەر چەشنە چەوسانەوەیەك •

## ئـــاکامـــە گشتـــی یـــەکان •

کە باسی فەلسەفە دەکرێ ، سروشت ،مرۆڤ ، خولقێنەر ، نێوەرۆکـــی سروشت ، شعووروچارەنووسی مرۆڤ و ئامرازەکانی ناسین و رادەی هێـــزی ناسین ،لە سەرەتاوە خۆ نیشان دەدەن • لەم باسە کورتەی کە کرا دیتمان ، رۆڤ لەهەردووك باری جەستەیی و فیکری یەوە گەشەی کردوە • لە جەرەیانی نفس وکەوتی کۆمەڵایەتی دا بەسۆی کەڵك وەرگرتن لە دەستەکانی و پاشـــان ید راك و چەمك دروست کردن ز گەمارێدانی پەسنەکانی دیاردەکـــان ، ەرەوناخی شتەکان چۆتە پێشەوە • بۆتە خاوەن هۆش و خولقێنـــەری مرازی بەکەڵك • وەك مرۆڤـی خاوەن بیرو ئامرازخولقێن ، دەکـــرێ ێین ،خۆی خۆی خولقاندوە •

وەڵامی دروستی ئەو پرسیارانەی مرۆڤ گەلاڵەی کردوون ، زۆرتـــر لایەن ئەو کەسانەوە دراوەتەوە کە توانیویانە بە کەڵك وەرگرتن لە میراتـــی رەهەنگی کۆمەڵی خۆیان و مەندەران ، بەشێوەیەك رێك بەرەو ناسینـــی اڵەتی و گەوهەری دیاردەکان ، هەنگاویان هەڵ گرتبێ • لـــــــەو ملانێ یەدا ،هێندێك بەرەولای شتێکی نە مادی و بە تەواوی رووحـــی ون و بە خولقێنەری گەردونیان زانیوە • هێندێکی تر جم وجۆڵی مـــادە و وکۆرە رواڵەتی یەکانیان بەشێوەیەکی مادی چارەسەر کردوە • هێنـــد و ان پێشەکەی فەلسەفەن • ئید ەئالیستەکان کە بیرویاوەڕیان زاڵ بۆوە لـــەو ولاتەوە سەریان هەڵ داوە • بەراشکاویش لە سەد ساڵ پێـــش ینی بەوە بیرویاوەڕی مادی هەبوە و بێجگە لە مادە هیچیان پەسنـــد ردوە ( چارواکەی هیند ) بروای بە چەند خودا ،دوو خـــودا وەك

سانکیەی هیند و زەردەشت، هەبوو. تواسیویانە بناخەی ژیریێتی داڕێژن و بیکەنە ئامرازی ناسین. بۆ بەرەرچ دانەوەی بەڵگەی لایەنی تر لە دیالکتیک کەڵکیان وەرگرتوە. ناسینیان بە دروست و نادروست دابەش کرد. تێ روانین، لێکۆڵینەوە، هەڵسەنگاندن، پێوانە، جیهان ناسین و شی کردنەوەی جیهان لەرێگای جۆراوجۆرەوە، باسی کات وشوێن و هی تر یونانی یەکان،هیندی یەکان بناخەدانەری زانستی ئەمرۆن. نرخ دانان بۆ ئەزمێر، ئەخلاق، ئیدارەی وەڵات و خاوخێزان و لە پلەی ناسین دا باسی عین و زەین نەکارە سەرەتایی یەکانیانە. فەلسەفەی ئەوکات لە مەیدانی میزیك و ژیریێتی و ئەخلاق و سیاسەت و سروشت ناسی دا، چالاکی هەبوو. لە جیهان ناسیی دا ونیان ماکەی جیهان توخمەکان، ئاو و هەوا ر خاك وئاگرە. (ژمارە) وەك بناخەی جیهان دانرا. لە مەیدانی ناسین و بروا بە هەستەکان، پشتیوانی لە هۆش و لاوازبوونی ئامرازی ناسین بۆ خود اناسین، بە شێوەی جۆراوجۆر خرایە بەرباس. وجوود بوو بە سەرچاوەی بوونی جیهان. جیهانی تازە پەیدابوو، کۆن بوونی جیهان. بێ سەرەوتی جیهان، نکوولی لە "خلق" لە هیچ و بێ جم وجۆڵی جیهان و یازی بەهۆی دەرەوەی بۆ جووڵانەوە، هاتە مەیدانی فەلسەفەوە. گەردیلە جم وجۆڵ بە جیهان ئەدا. شتێکی وەك تاریکی دنەدەری گەردیلەکانە. لە پێك هاتنی فەلسەفەی رووحی ئاناکساگوراس دا، رووح دنەدەری جیهانە. "مُثل" وەك چەمکێکی گشتی و وەك جیهانێکی تر، لای ئەفلاتوون خۆی نواند.

ئەرەستوو ئید راکی هەستی و بیری بۆ ناسین پەسند کرد و ئەزموونی وپاڵیان خست تا مرۆڤ بتوانی بچێتە ناخی شتەکانەوە تێ روانین، حکم و استنتاج پاش بەرەوروبوون لەگەل دیاردەکان و رەنگ دانەوەیان، خۆخستنە ناو سەرەتای ژیریێتی یەوە، دێن. جم وجۆڵی زاتی بۆ گەردیلەکان پەسند کرا. لەگەڵ ئەمەش دا لە ئیمکانی ناسینی قووڵ نکوڵی کراوە. خودا بۆتە خوڵقێنەری جیهان و گوتراوە هۆش نایێگێ. بە بیرکردنەوە لە خۆی "فیض" ی خوڵقاندوە، ئەویش جیهانی خوڵقاند، چونکە یەك هە یەك ئەخوڵقێنی. لای فیلسوفە موسوڵمانەکان، هەست و هۆش بوونەتە ئامرازی ناسین. خوا جیهانی خوڵقاندوە، یەکەم هۆیە، بایەخ بە ژیریێتی

وەك ئامرازی ناسین ،دراوە . چەمت جارێك لەپێش بەش بەشەکاندا هەمو جارێك پاش ئەوان ! جیهان و خالقی کۆنن بەلاّم جیهان بە زات نەك بە کات ، کۆنە . ئامادەبوونی شت لای هۆش تەبێتە ناسین . هۆش نەزەری لە گەوهەری دەروونی ، زانیاری وەردەگرێ . هۆش لە چوار پلە تێپەڕ دەبێ ، زانستەکان رێك و پێك دەکرێن و بناخەی فەلسەفە دادەندرێ ، بە هونەر بایەخ دەدرێ . ابن سینا دێتە مەیدان . بۆ ئەزموون ، ژیرێتی و لێکۆلینەوە لە سروشت ، مەتماتیك و خواناسین بە ئەرك دادەنێ و جموجۆڵ و وەستان و گۆڕان دەکاتە بابەتی زانستی سروشتی و چەمکە رووتەکان بابەتی خواناسین و وێنە زەینی یەکان ،بابەتی ژیریێتی ،چەندی رووت بابەتی ماتماتیك جێگای چەمکی گشتی هۆشە ، " جزئیات " وان لە دەرەوەی زەین دا . جیهان خوڵقاوی ناراستەوخۆی خوایە . جیهانی هۆش وا لەنێوان جیهانی مادەو خودادا . گەشەکردن لە ساکارەوە بەرەو هەوراز دەست پێ دەکا . بۆ هۆشیش وایە . ئرخ بە دەروون ناسی دراوە ، بۆیە مرۆڤ رووح و جیسمە . جموجۆڵی گەردوون ، لەش دەخوڵقێنێ . هەر جیسمێك لەلایەن هۆشی تێکۆشەرەوە ،عەقڵێکی پێ دراوە . دەروون گەوهەری سەربەخۆیە . ابن سینا حێلەکانی مێشك بە جێگای هەست پێ کراوەکان و ئید راك و هۆش دەزانێ . . . ئەویش زانستەکانی رێك و پێك کرد و بابەتەکا نی نی ناساند ، منطق ، سروشت ، " الـهیات " ئەخلاق ، سیاسەت ، مەتماتیك . . . ابن مسکویەو بیرۆرای گەشەکردنی مادە بەرەو گیاندارەکان و مرۆڤ لەگەڵ رێك وپێك کردنی زانستەکان وناسینی هەست و هۆش وەك ئامرازی ناسین کە لە وێنە زەینی یەکانەوە بەرەو گەیشتن بە شعوور دەڕوا و دەروون بە هۆشمەند دادەنێ . ئەم شێوە بۆچوونە :هەر بەردەوامە ، هۆش هەروەك ئامرازی ناسینە ئەبێتە بناخەی سەربەرزی و ئەخلاقی کۆمەلاّیەتی . . . غەزالی بێجگە لە بوونی خودا نە بواری ناسین ،گومان لە هەموو شت دەکا و پاسان دێنەوە سەر هێنێ ئەوانی تر . جیهان لای ئەو کۆنە . فیلسوف بە بەڵگەو لێکۆڵینەوە دەچێتە ناخی شتەکانەوە . دژی گشت ماتریالیستەکان بۆوە پێی وایە سەرچاوەی ئەخلاق و سیاسەت ، کتێبە ئاسمانی یەکانە . لەبەر بوونی ئاڵ وگۆڕ لە بەش بەشەکانی جیهان دا ،بای داوەتەوە سەر ناکۆن بوونی . وەل کانت بای دایەوە ، ئەوەندە چۆوە پێشەوە ، کە هۆش بە یەکەم خوڵقاو

دەزانی ولەپێش مادەدایە . پاش هۆش دەروون . رووح یان دەروون بنەڕەتە .
ئەگاتە ابن رشد ، جیهان دەبێتە بێ سەرەتا . باسی داستانی ئادەم و
خێزانی ئەبێتە شتێکی ناراست . هەموو زیندەوەران دەبنە خاوەنی هۆشێك
و گەردوون بە خڕو لە حاڵی جموجۆڵ بەدەوری خۆی دا ، دەناسێنرێ ،
یەکەم جموجۆڵی بێ سەرەتا و بێ پایانە . زەوی دەبێتە ناوەند و بێ جووڵانەوە،
کۆتایی پێ دێ چونکە رووەڕێکی خڕ بەسەریدا زاڵە .
ناتەبایی یەکان بەهۆی جموجۆڵەوە ، دروست دەبن . بێ جموجۆڵ
چوارچێوە تێك دەچێ ، توخمەکان ئەبنە هۆی دروست کردنی گیا و
گیاندارەکان . لێرەدا نرخی فێربوون و فێرکردن و مافی ژنان و پەسند-
کردنی حکوومەتی کۆماری و بایەخی زانا و هاریکاری ئەندامانی کۆمەڵ ،
خراوەتە بەرباس . کێشەی غەزالی و ابن رشد بۆتە بەردی بناخەی
لێکۆڵینەوەی زانستی . دێتە لای فخر رازی ، ئەویش ئەڵێ بە دیاردە و
گیانلەبەرەکانی جیهانەکانی تریش . سەبارەت بە خودا و رێك وپێك کردنی
زانستەکان ، ئەویش ئەو رێگایەی گرتەوە . فەلسەفەی اشراق و سهروردی ، بە
پێچەوانەی ئەمان ، بۆچوونی عیرفانی هەیەو کەوتۆتە شوێن رێوشوێنی
فەلسەفەی کۆنی ئێرانی و بە نووری قاهرو تیشك دانەوەی بۆسەر دڵ و ذوق،
مەسەلەی ناسینی بەرزی چارەسەر کردوە . لەگەڵ ئەوەشدا وجود لای ئەو
بەسەر دووئالیستی زەردەشت و فراوانی "مُثُل"ی ئەفلاتوونیدا زاڵە .
بەری کردنی جیهانی مادە لە رۆژئاواوە ( تاریکی ) بەرەو رۆژهەڵات
( وجود ) و خۆناسین ، کلیلی فەلسەفەکەیەتی . لێرەدا ، رووحناسی بەرەو
پەیدا دەکاو دەروون ناسی بایەخی پێ دەدرێ . مادە دەبێتە حاڵەتێك لە
سەلماندنی رووناکی و تاریکی دەبێتە چەندی ! مادەی بەربڵاو دەبێتە
هۆی پەیدابوونی مەیدانە جۆراوجۆرەکانی هەبوون . نەفس وەك هەڵمی گەرم
ناسراوە ... لە رۆژئاوادا کۆچ و باری فەلسەفە بەرەو هێرش بۆسەر ژیریی
ئەرستوو و بایەخدان بە ئەزموون و دیاریکردنی وەك تاقە بەڵگەی
ناسین لەجیاتی دەمی بێ نرخی لە چەمکە گشتی یەکانەوە ، چوو " استقرا "
کرایە پایە . فرانسیس بیکەن بێجگە لەم هەنگاوە چوارقوژنی بۆ ئەزموون
دروست کرد . لە سروشتەوە بەرەو یاسا گشتی یەکان و " بدیهیات " و هۆیە
گەورەکانی گەردوون دەچینە پێشەوەو دەگاتە میتافیزیکی بەرز . فیزیك دەبێتە

زانستی راستەقینەو روجرز بیکن و جان لاکیش ، ڕێگای ئەویان گرتە پێش .
دیکارت گومان لە هەست و هۆش دەکا و پاشان بادەداتەوە سەریان . دڵ
ناسێنەری راستی و خوایەو هۆش ئاتامەکانی کات و شوێن ئەپێکــــی .
اسپینوزا لە ئەزموون ڕێز دەگرێ ، لەگەڵ ئەوەدا بۆ لێکۆڵینەوە ، لە گشتی و
عامەوە بەرەو جوزئی و خاص دەڕوا ! لە خوداشناسی دا ، پێی وایە گەوهەر بە
زاتی خۆی بۆوە لەسەر پێی خۆی راوەستاوە . خوڵقاندن لە نەبــــوون ڕەت
دەکاتەوە .

جان لاك هێرش ئەباتە سەر بیروڕای فطری . دیکارت نرخ بــــە
ئەزموون دەدا و هۆش وەك تەختەڵەی سپی دەناسێنێ کە لە جەرەیانی کاردا ،
رەنگی ناسین هەڵ دەگرێ . لێرەوە شوێن دانانی بیروزەین لەسەر عەیـــن و
بابەتەکان لە کاری ئەزموون دا ، بە ئاشکرا دەس پێ دەکا و بە هــــۆی
هەستەکانەوە جیهانی زەین ئەوردەسەڵاتە پەیدا دەکا و هۆش چەمکــــە
گشتی یەکان دەخوڵقێنێ . پاش ئەم وردبینی یە بادەداتەوە سەر بیــــری
زگماکی !

لایب نیتس ، بیری زگماکی پەسند دەکا و تەختەڵەی سپی بوونی هــــۆش
لای جان لاك پەسند ناکا . نکوڵی لە کاریگەری هۆش لە جەرەیانی ناسین دا
دەکا ! پاشان بەناچار شەپۆلی تەنەکردنی بیروڕا دەیخاتەوە سەر مێلی
راستی . لەبەرپاراستنی ئایین ، خوڵقاندن لە هیچی پێ باشە !

هیوم گشت بنەرەتەکانی ناسینی ڕەت کردەوە . تەنانەت هۆشی بە نەبــوو
لە قەڵەم دا ! بەناچار هەستی بە سەرچاوەی ناسین دانا و کردیـــــە
بەڵگەی سەلماندنی هۆش . پێی وابوو زات و هۆش گومان لە گومانە ! کــــە
ئینجا کانت ، هەست و هۆش ئەبینەوە سەرچاوەی ناسین و هۆشی زگماکـــی
پەسند دەکرێتەوە . لەگەڵ ئەمەش دا هێزی هۆش پێوەندی بە هــــەست
پێ کراوەکانەوە هەیە . ئەمانە لە کۆنەکانیانەوە خۆیان بە هۆش ئەگەیەنـــن و
چەمکە گشتی یەکان دروست دەبن . برگسون بڕوای بە خودایەو گاڵتە بــــە
ماتریالیستەکان دەکا . تا ئێرە ئێمە یان دەماغ بە جێگای شعوور یـــان
هۆش دانراوە ، ئەم جیایان دەکاتەوە . هۆش دەبێتە هێز و دەماغ دەبێتـــە
مادەو قاپۆری هۆش کە بە تێك چوونی ، هۆشیش تووشی تێك چوون دەبێ
( بڕوست بۆچوونی ابن سینا سەبارەت بە پێوەندی هەموو ئامرازی ناسین

به مێشکەوه) . ناچارین راسی یەکان بەش بەش بکەین، تا لێیـــــان تێ بگەین . کەوابوو وەك گشتی نایان بینینن . دێینە سەر کورتەو پوختــەی ئەم گشت بیرورا و تێکۆشانەی بۆ ئەوەی باسی کەسێك بکەین، ناسیـــــن دەناسێنین، لەلایەك مرۆڤ و لەلایەکی تر سروشت و مەنبەندی ژیانە، مرۆڤ زاتەو ناسێنەر . سروشت بابەتی ناسینە مرۆڤ خاوەن مێشك، لە جەرەیانــی بەرەوروبوونیان دا، سروشت یان دیاردەکان لە زەمین دا رەنگ دەدەنەوە لە هەلس و کەوتی کۆمەلایەتی دا و بەهۆی دەندانی مەنبەندی ژیـــان و کارلێکی مێشك لەسەر هەست پێکراوەکان، لەو هەلانەیدا، ناسینـــی هەستی، ژیریێتی، ئاکام وەرگرتن و بریاردان و پێوانەو چوونە ناخـــــی دەروونی شتەکان، بەهۆی کردەوە کە هەم سەرەتا و هەم دوایی ناسینـــە، مرۆڤ لە مەیدانی ناسین دا سەرکەوتی وەچنگ کەوت . ناسینی دەس بە ـ جێ رەت کرایەوەو بەگشتی دەبێتە ئید راکی و عاتیفی . ئەمەیان نیشانــەی دیاری کردەوەی زەینی یە . ناسین بۆ ئەندازە گرتن دەبێ . بە دروســــت و ناد روست دابەش دەکرێ و نیسبی یە، چونکە مرۆڤ و بابەتی ناسینیش لـــە ئاڵ و گۆڕدان . چەندی بابەتی ناسینی زانستی و چۆنی بابەتی ناسینـــی عاتیفی یە . بەپێی نیاز و بارودۆخ ئاڵ و گۆڕ بەسەر زانست دا دێ و بەرلاوتــر دەبێ و ژیان دەگۆڕێ . لە هاوتا هەمگی هونەرو زانست دا، فەلسەفــــە پەیدا دەبێ . فەلسەفە بەرەبەرە لە زانست جیا بۆوە یان زانستەکـــــان سەربەخۆیی یان لە فەلسەفەوەرگرت . فەلسەفە بە تێکەڵ و گشتی کردنـــی زانستەکان بۆ حاڵی بوون لە گەردوون، هاتە مەیدان و پێوەندی هونــەر، زانست و فەلسەفە، نەبێتە هۆی گەشەکردنی هەرسێکیان . ئەوکــــات فەلسەفەی زانا هەرچەندە لەگەڵ راستی یەکتر بگرێتەوە، ناسینی زانستـی و هونەری ئەو قووڵتر دەبێ؛ فەلسەفە رێنوێنی کۆمەڵ و تاقە کەسێتە . بە زانا و هونەرمەند یارێدە دەدا، زانست و هونەر پشتیوانی یەکترن، زانستی تازە عاتیفەی تازە دەخوڵقێنێ . هەردووکیان بە میراتی کۆمەڵەوە، پاڵ دەدەنەوە لە چوارچێوەی مەبەستی خۆیان، لەو میراتە کەلك وەردەگرن و شتی تــــازە دەخوڵقێنن و بیری خۆیان روونتر دەکەن . ناسین و راگەیاندنی زانـــا، ژیریێتی یەو هی خاوەن هونەر هەستی (حسی) یە . ئێستا یاســـــا و بیرە تۆزەکان بەسەر مرۆڤ دا فەرمانرەوایی دەکەن . فیلسوف و خـــــاوەن

هونەر دەبێ زانابن ،دەنا ئامانج ناپێکن . بەم تێگەیشتنانە مرۆڤ لـــــە گەڕ وون دا ، جێی خۆی دیاری دەکا . لە ئاوەڕۆکی مادەو نوقتەی هاوبەشی فەلسەفەو زانست دەدەن و بەم جۆرە فەلسەفە بەهۆی زانستەوە ، هەناســە هەڵدەکێشێ و خۆی بەودەناسێنێ .

ناسین ئامرازی پێویستی گەیشتن بە ئازادی یە . ئێستا سەلمێندراوە بە ناسینی یاساکانی کۆمەڵ و سروشت و ئاڵوگۆڕیان ،مرۆڤ شوێن لەسەرکۆمەڵ دادەنێ . لە بواری ناسینی راستی ( حقیقت ) دا دیتنی ناراســـــت ، جێگای خۆی داوە بە تێ ڕوانین و وردبینی چەند لایەنە ،بەم جۆرە چونکـــە پەسنەکانی دیاردەکان رۆنن ، ئەگەر زانست لەرێگای وێنە جوزئی یەکانــــەوە لەگەڵ پەسنێك یەك نەگرێتەوە ، نابێ بە هەڵەی بزانین ، چونکە بابــــەت تەنیا خاوەنی یەك وێنە نیە . شتی تەواو راستیش هەیەو بە گشتی راستــــی نیسبی یە . ئەوەی ئێستا راستە ،لەژێر تیشکی زانستدا ، پێویســتـــــە سەرلەنوێ پێیا بچینەوە . دروستی بکەینەوە . ئێستا زانستەکان بە چەنـــد راستی گەیشتوون کە دەکرێ بڵێین بێ ئەمدوئەولا بەرێلاون . لە بارودۆخـی تایبەتی دا بریاری دروست لەسەر شتێك دەدرێ ، بە گۆڕانی ئـــــەو بارودۆخە ، ئەو بڕیارە نادروست دەبێ . ئامرازی ورد و بەکەلك لە ناسینــی قووڵ دا ، کاریگەرە . لە راستقینەکان دا ،عونسورێك لە نیسبی، دەرەوەیی، زەینی و بەرێلاو بوون ،هەیە . لەم بوارەدا جاری وایە هەڵەو راستقینـــــە جێی خۆیان دەگۆڕن . ئەوایە هەمیشە واین لە حاڵی نزیك بوونەوە لەراستی. هەمیشە بەرەو پێش ، ڕاس و ریس کردن دایە . بە مرۆڤەوە راستی هەیە .

لە باسی مادەو شعووردا ، دەرکەوت مادەی مێشکی مرۆڤ لەجەرەیانــی گەشەکردنی کۆمەڵ و ناسینی خۆیدا ،بۆتە خاوەنی پەسنێك کە پێی دەڵێین شعوور یان هۆشمەندی . بەم پێیە نەك لە گشت جیهان دا بەڵکوو تەنیـــا لە مێشکی مرۆڤ دا ،بەدوای مادەو لە ئاکامی گەشەکردنی مادەدا هاتۆتە . لە سەراسەری جیهان دا ماتریالیستەکان جیهان بە مادی و بێ سەروبــن دەزانن ، خواپەرستان جیهان بە دروو شت واتا مادەو شعوور دەزانن کــە شعوور خولقێنەری مادەیە . بەهەرحاڵ ،سەربەخۆبوونی راستی یەکانـــــی دەرەوەی زەین لەبەرامبەر مرۆڤ و زەینی دا کە رێبازی مادی یەو بوونـــــی راستی یەکان لە هۆشمەندی و ناسەربەخۆبوونیان کە رێبازی ئیدئالیستی یە،

لە چوارچێوەی جیهانی ناسین دا ، هەر جێگای تێدەیەو لەم بوارەدا زانست ڕێبازی یەکەم پەسند دەکا . گشت چەمك و ئیدراکەکانی زەمین لە سێ شتەوە سەرچاوە دەگرێ . یەکەم ـ هەست پێکردن کە ئەنجامی کارلێکردنی عەینە لەسەر زەمین ، دیاردەکان شوێن دادەنێن . دووەم ـ کارلێکیان لەسەر دەزگای مێشك و لەدایك بوونی هەست پێکراوەکان . سێیەم ـ پێوەندی وێنەی زەمینی کە بناخەی ئەزموون و کردەوەیە . چەمکە گشتی و گشتی ترەکان بە بێ هەست کردن ، مێشك ، ژیرێتی ، کارێك نە دەمیان نایە . بێ کاری مێشك زانستی هەست پێکراومان نابێ و زانستەکان پێك جیا ناکرێنەوە .

لە جیهان بینی یەکان دا ، ماتریالیستەکان هەموو شتێك بە ماددەو ماددی دەزانن و گۆڕانەکان بە ئاکامی جمەوجۆڵ و گەشەکردن . جیهان بۆ ناسین دەبێ . ئیدەئالیستەکان ، هەموو شتێك پێوەندی بە جیهانی ڕووحی یەوەیە . بڕوایان بە ڕووحی جیا لە ماددەو جیهانێکی تری بە تەواوی نەناسراو ، هەیە . لێرەدا ئەرکی فەلسەفە ئەوەیە ڕێبازێکی گشتی بۆ زانین بدۆزێتەوە ( هەر زانستێك خۆی ڕێبازێکی تایبەتی هەبە ) ببێتە ڕێبەری زاناکان و لەگەڵ ڕێبازە تایبەتی یەکەی خۆیان ، کەلك لەو ڕێبازە گشتی یە وەرگرن .

ئێستا هەڵەکانی ماتریالیزمی میکانیکی ڕاست کراونەتەوە . دژایەتی و تێگەیشتن لەو کراوە بە کێلی گەشەکردن و وا جیهان دەناسن کە بز هەتاهەتایە لە حاڵی گەشەکردن دایە . ئەو ئاڵ وگۆڕانەی شێوازی ئێستای جیهانیان دروست کردوە ، هەر درێژەی هەیە . لەباری پەیدابوونی مرۆڤ دا بڕوا ئەوەیە کە زیندووەکان ئاڵ وگۆڕی درێژخایەنیان بەسەردا هات و گەیشتن بە پلەی مرۆڤ . کە کۆمەڵی مرۆڤایەتی پێك هات ، یاسای کۆمەڵ و ئاڵ وگۆڕ ، هاتە پێش ، لە جەرەیانی کاردا ، بیری مرۆڤ قووڵ و قووڵ تر بوو . گەشەکردن و ڕاپەڕین و بەرەبەرە چوونەپێش و گۆڕانی چەندی بە چلۆنی ، دەخولقێ .

ئێستا بە پاڵپشت دان بە زانستە جۆراوجۆرەکانی سروشتەوە سەلمێندراوە چەمکی ماتریالیستی دیالکتیکی گەشەکردن جیهانگیرە و جەرەیانێکی گەشەکردنی هەمیشەیە . هێزی دنەدەری پلەکانی گەشەکردن لە

خودی جەرمیانە مادی‌یەکان دایە ،لەوزەکانی دەروونی و مەیلە جوراوجورە ـ
کان کە لە کۆمەڵ و دیاردەکان دا هەن ، شاراوەتەوە ، بریتی‌یە لــــــە
موتالای دژەکان لە خودی گەوهەری دیاردەکان دا . دژایەتی و مێـ ـزی
گەشەکردن ، پێکەوەن . دژایەتی هێگل لە چەمکە گشتی‌یەکان دابــوو ،وەک
تێگەیشتن لای ماتریالیستی ئێستا وا لە خاوەن چەمکەکان دا .

ئێستا تێ‌روانینی ماتریالیستی سەبارەت بە گەشەکردنی مادەو جموجوڵ و
بەرەوپێش‌چوون ،سەری کێشا لای تێ‌روانینی کۆمەڵ و شێوەی گەشەکردنــی و
ناسینی یاساکانی و دۆزینەوەی ڕێگای ڕزگاری و شێوە زانستی خەبـــات و
هاتنە مەیدانی فەلسەفەی کردەوەیی شۆڕشگێری .

دیالکتیک و میتافیزیک لە بەرامبەر یەکتردا ن . میتافیزیک بە شێــــوەی
هەڵ‌مالاوی ( انتزاعی ) و جیاجیا لە دیاردەکان ئەکۆڵێتەوەو دیالکتیــک
لە پێوەندی لەگەڵ یەکتردا . جموجوڵ شێوەی مانەوەو بوونی مادەیـــــە .
دژایەتی پەستی بنەرەتی دیاردەکانە . هەریەکێک دژایەتی تایبەتی خۆی
هەیە . یەک بوون و شەڕی دژەکان بێ‌سنوورە . پێویستە شتەکان لە حالــی
پەیدابوون و لەمێوچوون دا ببینین . شتەکان لە حاڵی جموجوڵــــــــی
هەمیشەیی ،تازە بوونەوە ، بەرەوپێش‌چوون و گەشەکردن دان ، هەمیشــــە
شتێک پەیدا دەبێ و لەدایک دەبێ ،شتێک هەمیشە بەسەر لێ‌وڕەکانــی
دابەش دەکرێ و پاشان دەمرێ . ناکۆکی بەواتای پێوەندی نێــــــوان
دژەکانە . دژەکان یەکیان گرتوە ،تێک چرژاون ،مل‌ملانێی دژەکان دنەدەری
بەرەسەندن و جوولانەوەیە . دژەکان لە یەکێتی بەتین و ناکۆکــــــــی
بەردەوام دان . چارەسەرکردنی ناکۆکی‌یەکان لە کۆمەڵ دا لە ڕێگــــــای
شۆڕشی کۆمەلایەتی‌یەوە دەکرێ ،ئەویش بەپێی هەلومەرجی تایبەتی .

یاساکانی دیالکتیک چوارن .

١ـ یاسای یەکەم ـ حال وگۆڕ ( تغییر ) ی دیالکتیکی .

٢ـ یاسای دووەم ـ کارلێکەکانی دوولایەنە ( تأثیر متقابل ) .

٣ـ یاسای سێیەم ـ دژایەتی وناکۆکی ( تضاد ) .

٤ـ یاسای چوارەم ـ گۆڕانی چەندایەتی بە چلۆنایەتی ( تبدیـــل
کمیت بە کیفیت ) .

زانست و دیالکتیک بۆ لێکۆڵینەوە لە زانستەکان دا ، پێویستە بەشێوەی

دیالێکتیکی بچنە پێش . تەنیا تەماشای رواڵەت نەکەین ، بەڵکوو بچینە ناخی دیاردەکانەوە . چونکە دەروون ، دیاریکەری رواڵەتە . پێویستە گەوهەری شتەکان بزانرێ کە بریتییە لە پێوەندیی نێوخۆیی و بناخەیی ، یاسای پەرەسەندن ، بناخەی جۆراوجۆری دیاردەکانە . دیاردەکان دیمەنی گەوهەرن . هێزە کۆنەپەرستەکان ، گەوهەر دەشێوێنن و بەراوەژووی دەکەنەوە و راستییەکان تێک دەدەن . ناسینی قووڵ ، بریتییە لە نیوەی رێگای دەرکەوتنە جۆراوجۆرەکانە . زانست دەستی مرۆڤ دەگرێ و نێوەرۆکی شتەکانمان پێشان دەدا . لە یاساکانی گەشەکردن دا پێمان دەڵێ : پێویستە ، گۆڕانی چەندی و چلۆنی لەبەرچاو بگرین کە ئاکامی ململانێی دژەکانە .

لە هەموو جەریانێک دا تازە بوونەوە و گەشەکردن هەیە . شتێک دەمرێ و شتێک دەڕوا و شتی تازە دێتە جیهانی بوونەوە . لە نێوان گەشەکردن و گۆڕانی بێ ئەولا و ئەولا و سەرهەڵدان دا جیاوازی هەیە . لە گەشەکردن دا بازدانیش هەیە کە بریتییە لە نوخنە وەرچەرخانێکی کاریگەر لە چلۆنایەتی — یەکی کۆن بۆ نوێ ، توند و قووڵ لە پەرەسەندن دا . گشت گۆڕانێک لایەنی چەندی هەیە . کەم دەوامەو دەگاتە چلۆنی ، جاری وایشە وەک راپەرین بێ دەگا . بەکورتی دیالێکتیک کلیل بەدەستمانەوە دەدا کە لە چ شوێنێک ، بەرهەمی گۆڕان و دژایەتی گرنگ بدۆزینەوە . ئەرکی مرۆڤ شی کردنەوەی راستییەکانی بابەتەکەیە . بۆ ئاگادار بوون لە ئاڵوگۆڕەکان پێویستە دژەکان بناسین . دژ هەلومەرجی گۆڕان ئەرەخسێنێ . بارودۆخی کۆمەڵیش ، داوای دژایەتی دەکا . ژیان بریتییە لە دژایەتی نێوان دیاردەکان . نەبوونی دژایەتی مەرگە . هەرشتێک بە دژی خۆیەوە سکی پڕە . دژایەتی جیهان وەبەرگرە . دژەکان بەپێی بابەتەکانیان جیاوازن : کۆمەڵایەتی و سروشتی ، دیالێکتیک دەڵێ : لە شەڕی کۆن و نوێ دا پەیدابوونی چلۆنایەتییەکی نوێ هەمیشە لەمەکاوە . زنجیرەیەک لە دژەکان لە یەک جەریان دا ، پلە بە پلە ، ئەو جەریانە دەباتە پێش . تازە لە جێگای کۆن دادەنیشێ . لەم بوارەدا پێویستە دژایەتی بنەڕەتی و هێزی سەرەکی چارەسەرکردنی دژایەتی بناسین . " ترباد " جیهان وەبەرگرنیە .

لەم پێیەدا هەر حاڵەتێکی چلۆنی ، بریتییە لە یەک جەریان ، کە پێوەندی زاڵ بوونی دیاریکراو دەگرێتەوە . تواندنەوەی ئاسن ،

تایبەتمەندی دەروونی یاساکانی جموجۆڵی، بە شێوازێکی دیاری کراو،
جۆراوجۆر نەبێ و ئاڵوگۆڕی چلۆنایەتی بەسەردادێ. زنجیرە ئاڵوگۆڕی
چەندی سەرئەکێشێتە لای ئەم ئاڵوگۆڕەوەیەوە. لەم بارەدا دژەکانیش
ئاڵوگۆڕیان بەسەردادێ. هۆیە دەرەوەیی و دەروونییەکان پێکەوە لەسەر
چارەسەرکردنی دژایەتییە زاتییەکان، شوێن دادەنێن. بەڵام
تایبەتمەندی ئاڵوگۆڕەکان هەمیشە پێوەندی بە دەروونییەوە هەیە. نوێ بۆ
زاڵ بوون بەسەر کۆن دا، پێویستی بە ئەزموون هەیەو پێویستە پلە بە پلە
پێی بگاو پێگەکانی داگیر بکا. دژەکان هەم گشتی و هەم هەتاهەتایین،
دوو برالمیەك لە دژەکان لە هەموو جەرەیانێك دا هەیەو تا کۆتایی
پێ هاتنی گەشەکردنەکە، دەمێنێ. جموجۆڵ بۆخۆی دژایەتییە.
جەرەیانی ناسین بریتییە لە: جموجۆڵ لە تایبەتەوە بەرەو گشتی، لە
گشتییەوە، بەرەو تایبەت. (یاسای چارەسەرکردنی دژایەتییەکان،
هەمیسە، کێشەو زاڵ بوونی) لایەنێك بەسەر لایەنێکی تردا دەگرێتەوە.

چارەسەرکردنی دژەکان بە زۆرو بە قسەوباس (لە ناتەبا نائانتاگۆنی-
یەکان) و بە ژیرێژی، دەکرێ. دژایەتی نێوان کرێکارو جووتیار بە
میکانیزە کردنی زەوی چارەسەر دەکرێ. یاسای ناتەبای گەوهەری
دیالکتیکیان: کورتەو پوختەیەتی. پلەی بەرەوپێش چوونی تازە بە هۆی
چارەسەرکردنی دژایەتییەکانی پلەی بەرەوپێش چوونی کۆن، لەدایك
دەبێ. خودی پلەی تازەش، دژایەتییەکی نوێی تێدایە، چونکە لە کاتی
لەدایك بوون دا شتێکی لە رابردووکە لە خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ و شتێك
نەهاتووکە لە ئەگەڵیدایە سەرئەکێشێتە لای ئەو شتەوە. دژایەتی
بنەڕەتی بەقازانجی لایەنی زاڵ، کۆتایی پێدێ. وەك دژایەتی
وردەبورژوا و بورژوا، کە بورژوا زاڵ دەبێ. لە وڵاتێکی سەرمایەداریدا
وردەبورژوا ناتوانێ شۆڕشگێڕ بێ. نیبراڵەکان هەموو پلەکانی گەشەکردن
پەسند دەکەن، بەڵام نوێ لە جێگای تازە دانانێن و بۆ راگرتنی کۆن
تێ دەکۆشن. دیالکتیك پێمان دەڵێ تازە لەگەڵ کۆن خەبات بکاو کۆنیش
بە تازە رێگا بدا. کۆن بە نوێ نەفی نەبێ. نەفی مەرجێکی گەشەکردنەوە
هۆیە بۆ گەشەکردنی "مەتت". ناوەڕۆکی نەفی لەوەدایە کە هەموو شتێك
نوێ دەبێتەوەو پاشان نوێ جێگای کۆن دەگرێتەوە.

پەرەسەندنی دیاردەکان تا گەیشتن بە پلەی بەرزتر. نەفی پەک‌کەوتنی دیاردەیەکە باوی نەماوە. هێزی سەرەکی جوولانەوەی مێژوو بریتییە لە دروستکردن. پلەی بەرزتر رابردووی خۆی نەفی دەکا و بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەیەکی نوێ. هەموو ناوەرۆکێکی لە پەرەسەندنێک دا دەپارێزی. لە مێژوو و بیروباوەڕو کۆمەڵیش دا، جیهان وەبەرگرە. تازە لە دەروونی هەڵوەمەرجەکانی کۆن دا، سەرهەڵ دەدا. دوایی بوونەوەی نەفیی نەفی، لە پلەیەک بەرزتر دایە. وەک کۆمۆنی سەرەتا و کۆمۆنی ئێستا. نەفیی نەفی دەڵێ. ناتوانین رەورەوەی مێژوو، بەرەو پاش بەرین. لە کۆمۆنیست دا بۆ چارەسەرکردنی دژایەتی، لە چەرمیانی نەفیی نەفی دا، بە نێک هەڵچوون پەنانابەن. تەواوی جمەوجۆڵە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمۆنیسم، پلەکانی ئامادەکردنی و چەرمیانەکانی گەشەکردن بۆ لەدایک بوونێکی نوێ مرۆڤ و سەرهەڵدانی نوێ و زاڵ بوون بەسەر سروشت دا، بەرەوپێش دەچێ. کێشەی کۆن و نوێ و داهاتوو و رابردوو، هەر دەرێژەی دەبێ. لەباری ئەخلاقی و هی تریش لە کۆمۆنیسم دا، سنووری "ضرورت" جێگای خۆی بە سنووری "ئازادی" دەدا. بڕیاردان و چارەسەرکردنی زیرێتی جێگای دژایەتی دەگرێتەوە. کۆمەڵناسی کە ئاکامی تێکۆشانی بێ وچانی مرۆڤە، دەتوانێ دەسکەوتە زانستییەکانی مرۆڤ بخاتە ژێر دەسەڵاتی کاری ئاشتی خوازانە.

کۆتایی

---

# فەرهەنگۆك :

ئامراز = کەرەسە ، وەسیلە
ئاخاوتن = قسەکردن،وت ووێژ
ئەنجام = ئاکام ، محصول
ئابووری = اقتصادی
ئاکامی = غایی ، دوایی
ئەندامەکانی لەش = اعضاء بدن
ئاوەروکە تێلەکان = زمکاو ، لەهجەی ( لهجه )
ئاکام وەرگرتن = استنتاج
ئاراستە = جوان و رێك وپێك ، بە واتای پێشکەشیش هاتوە
ئەزموونگەر = ئازمایشگەر
ئاوەز = هۆش ، عەقڵ

بابەت = موضوع
بار = حالەت
بەرهەم = محصول
بیردۆزی = نظریە
بنەما = بنچینە
بێسەرەتا = ئەزەلی
بێپایان = ئەبەدی

بارستایی = حجم
بوون = وجود
بوونەکان = وجوودەکان
بەربەست = مانع، سد
بازدان = راپەرین و جەهش
بریار = حکم
بەرەلاّو = مطلق ، بێ گری وگۆڵ
بێ ئەملا وئەولا = قطعی
بەراوەژوو = معکوس ،پێچەوانە

پانتایی = پان و پۆری .
پەیرەوکردن = پیراتیك ، کردەوە
پسپۆر = متخصص
پارێزەر = حافظە،لە مەسەلەی ناسین دا
پەراوێز = حاشیە
پەسن = صفت
پەسند = قبوڵ
پاڵ پێوەنەر = دافعە
پرسەدان = وەڵام

تەوەرە = محور
توخم = عونسور، ( عنصر )
تێگەیشتن = لێ حاڵی بوون ، ئیدراك
تەسك وترووسك = بەرفراوان نەبوون

تیژرەوی = بەپەلە چوون
تیشت دانەوە = رووناکی پاشین ، اشراق ، بریقدانەوە
توێژینەوە = لێکۆڵینەوە ، تێ کردنەوە
تایبەتی = خصوصی
تایبەتمەندی = خاصیت

جیهانی گەورە = دنیا
جۆر = نوع
جووڵانەوە = جموجۆڵ ، حرکت
جەستە = جسم

چەمك = مفهوم
چرکەژمێر = ثانیە ژمێر
چرکە = ثانیە
چوارچێوەی لەش = ئورگانیسم
چلۆنی = کیفیت
چەندی = کمیت
چڕی = پڕ
چاوەزێری = حسادت ، ئیرەیی ( غبطە )
چوارقوژبن = جدول
چوارچێوەی هەتاوی = منظومە شمسی
چەمکی بەربڵاو = مفهوم مطلق

خول = چەرخی زەمان ، بە واتای بێ بیروهۆشیش هاتوە
خەیاڵی = هەڵاوەسراوی ، معلق ، ئاوێزان کراو
خولگە = معدار ( مدار )
خەزێنەی خەیاڵ = متخیلە
خۆجم وجۆڵی = حرکت ذاتی

دیاردە ≡ شت
دز = ناتەبا
دەروون ناسی = روانشناسی
داماڵین = لێکردنەوە ( انتزاع )
دوکتورین = کۆی فێرکردنی چوارچێوەیەك کە راستی یەکەی سەلمێند راوە
دیالکتیك = وت ووێژ ،کێشە ، دەرخستنی ناد روست بوونی وتەی لایەنی تر
دەرەوە = عین ، خارج
دژکردەوە = عكس‌العمل ، رد الفعل
دوێپ = بەچاڵاکەوتوو ، مقعر
دەستەبەر = تضمین
دەمار = عصب
دووئالیستی = دووپەرستی ، دووخودایی ، میل بەدووشت نیشاندان

روانین = تەماشاکردن
راستەقینە = حقیقت

رسته = جمله
رووت = مجرد
رووت کردنه‌وه = تجرید
رامیاری = سیاسی
رواڵه‌ت = ظاهر
رووبه‌ر و رووما = سطح
ره‌نگ دانه‌وه = انعکاس
راسته‌قینه = حقیقی
راکێشه‌ر = جاذبه
رێبوار = گوزه‌را ، ئه‌وه‌ی ده‌ڕوا و رێ ده‌پێوێ

زاراوه = اصطلاح
زانستگه = دانشگا ، زانکۆ
زه‌ین = ذهن
زگماکی = فطری
زوولمێوچوو = عرض ، له به‌رامبه‌ر گه‌وهه‌ره‌وه

ژیربێژی = منطق

سروشت = طبیعت
سێره = نیشانه‌گرتن

شوێن = مکان
شێواز = شکل
شلەمەنی = مایع، ئاوەکی
شێوە = صورت

عەین = دەرەوەی زەمین

فرێنك = فرچك

قەبارە = تەواوە

کاریگەری کردن = شوێن لەسەردانان ،تأثیر
کۆکردنەوە = مۆلدان
کردار و بەرپەرچی کردار = کردەوەو دژکردەوە ، عمل و عکس العمل
کێش = هاوزۆر، هاوتوانا
کارگەر = فاعل
کامپیوتەر = دەزگای خودکار

کەرەسە = وسیلە ، ئامراز
کارتێکەکان = تأثیرات متقابل ، کارلێك ، شوێن دانانی دوولایەنە

گەشەکردن = تکامل
گەڵاڵە = طرح
گشتی هۆش = کلی عقل
گەردیلە = اتم
گوندگەری = استقرا ، دۆبەدێ گەڕان
گەنجاو = معئن
گشتی = کل
گۆڕان = تغییر

لەم پلەدا = لەم قـــــــــۆناغەدا
لەمپەر = سد ، مانع
لەمەد روانە = دوورزانە ، شعلی بەرەکەت ،شمەگە بەرەکەت

ماوە = زەمان ، کات
ململانێ = جەنگ ، کێشە
مرکە = نیو ثانیە

ناوەرۆك = محتوی

ناوەوە = زەمین
ناسەرمایەداری = سەرمایەداری نەبوون ، غەیرە سەرمایەداری
نەورەس = تازە پەیدابوو، تازە رووا و
ناوەرۆك و شێوە = ماهیت وصورت
ناوەند = مركز
ناخ = دەروون
نەلوێ = نەگونجی ،ئیمكانی نەبێ

وشە = كلمە
وەرچەرخان = تغییر
واتاكردن = ماناكردن
وێ چوون = ئیمكان ، رێی تێ دەچێ
وزە = هێزو توانا
وێنە = عكس ، رەسم
وێنەی بەرێلاو = مثال مطلق

هۆ = علت، سبب
هۆشمەندی = عاقلی
هێما = ئیشارە
هۆنانەوە = تێك خستنەوەو رێك وپێك كردن
هەست كردن = احساس كردن
هۆگری = سببیت
هۆش پێك = معقول
هەستی دەروونی = ذوق
هەرمان= ئەبەدی ،هەتاهەتایی ٠ لە هەورامیدا بەواتای فەرمانە

هۆشی تێکۆشەر = عـقل فعّال

یەکالاکردن = شی‌کردنەوە ، تحلیل
یەك خستن = توحید

تێبینی : هێندێك لەم وشانە بەپێی واتای رستەو چەمکی فەلسەفـــی بابەتەکان ، هاتوون و لە چوارچێوەو ئەو واتانەدا ، کەڵکم لێ وەرگرتـــوون . ڕەنگە هێندێکیان داتاشراو بن . بەش بەحاڵی خۆم ،لەوە زیاتر رێـــــم تێنەچوو . بۆ خۆشحاڵ دەبم ، کە ئەدیبە کوردەکان ، هەڵەم لێ راستـەوە بکەن و شرم لێ پینە بکەن .

ـــ دانەر ـــ

# سەرچاوەکان :


.ابن سینا ، النجاه ، چاپی دووەم ، مصر ١٣٥٧ی کۆچی
.ابن سینا ، الاشارات والتنبیهات ، تاران
.الکندی ، رسائل الفلسفیه ،محمد عبدالهادی ابو ریده ، مصر ١٩ی زایینی .
.امیرحسین آریانپور ، زمینه جامعه شناسی (کۆمەڵناسی) تاران، ١٣ی هەتاوی
.احسان طبری ، نووسراوە فەلسەفی و کۆمەڵایەتییەکان ، تاران ، ووی چاپی دیارنیە .
.ابن رشد : الکلیات بە تێکۆشانی فرید بوستانی ، چاپی بیروت
.جلال دباغ ، کورتەباسێکی ماتریالیزمی دیالکتیك
.جلال دباغ ، نالەی فەلسەفەو زانست و جووڵانەوەی نوێ ١٩٨١ی ینی .
.جی ، دیبور : تاریخ فلسفه در اسلام،چاپی دووەم ١٣٤٣ی هەتاوی
١.د. حسین خلیقی ، تجلی افکار فارابی در سیر حکمت اسلامی ، یز ١٣٥٤ی هەتاوی .
١.د. حسین خلیقی ، تأثیر فارابی در فرهنگ و تمدن اسلامی ، یز ١٣٥٤ی هەتاوی
١.د. حسین خلیقی ، تاریخ فلسفه اسلامی ، تبریز ، ١٣٥٧ی هەتاوی .
١.د. حسین خلیقی ، حکمت اشراق و سهروردی ، تبریز ١٣٥٤ی هەتاوی .
١.د. حسین خلیقی ، مقایسه بین شك علمی غزالی و دیکارت ، تاران ١٣٤٠ی هەتاوی .
١.د. حسین خلیقی ، آفرینش و نظر فیلسوفان اسلامی دربارۀ آن ، بریز ١٣٥٤ی هەتاوی

١٦ـ ژورژ پولیستر ، اصول مقدماتی فلسفه ، نووسراوی موریس لوئـــوآ ١٩٤٦ ی زایینی
١٧ـ سهروردی ، حکمةالاشراق ، چاپی تاران
١٨ـ سید محمد باقر نجفی ، علتی بر معلولها ١٣٥٢ ی هەتاوی شەهری ( تیران )
١٩ـ بورهان قانع ، فەرهەنگی نوێ لە فارسی‌یەوە کرد ویەتی بە کوردی ، ١٩٨٠ ی زایینی ، بەغدا
٢ـ علی عیلمی ئەردەبیلی ، دیالکتیك ، ماتریالیسم دیالکتیـــــك ١٣٩ ی کۆچی ، مەشهەد .
٢ـ د ـ علی شەریعەتی ، عیرفان،بەرامبەری،ئازادی ،١٣٥٩ ی هەتاوی رگێڕاوی مامۆستا هەژار .
٢ـ غزالی ،محمد ، مشکوةالانوار
٢ـ غزالی ،محمد ، تهافة الفلاسفه ، مێژووی چاپی نیه
٢ـ کونفورت ، ماتریالیسم دیالکتیك ، تاران ،١٣٥٨ ی هەتاوی
٢ـ عباس محمود العقاد ، ابن رشد ، مصر ، مێژووی چاپی نیه .
٢ـ م.ح کاوە . جهان بینی مادی و جهان بینی ئیدەئالیستی، تاران، ١٣١ ی هەتاوی
١ـ مائوتسەدون ، چهار رساله فلسفی ،تاران . وەرگێڕاوی فارســـی ووی چاپی نادیارە .
ـ م ـ ك فورت ، نظریه شناخت، وەرگێڕانی فەرهاد نوعمانی و منوچهـر جیان ، تاران ١٣٥٥ ی هەتاوی
ـ د ـ محمود هومن ، تاریخ فلسفه ، دفتەری یەکەم چاپـــی ١٣٥٤ ن .
ـ نديم الجسر ، قصة الايمان بين الفلسفة العلم و القرآن.دارالتربيـه باعة و النشر والتوزيع
ـ المعجم المختصر الفلسفي ،مسكو،دارالتقدم ١٩٨٦ ی زایینی .

# پێرستی مەبەستەکان:

لاپەڕی

